# ڕشتەی مرواری





کۆمەڵە ئەدەبییەکی هەرە بەنرخە
لە فەلسەفە و بیر و باوەڕی کوردی

عەلائەدین سەجادی

٣

سرشناسه : سجادی، علاءالدین، ۱۹۰۷ - ۱۹۸۴م.
عنوان و نام پدیدآور : ڕشتەی مرواری: کۆمەڵە ئەدەبییکی هەرە بەنرخە لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی/ دانراوی عەلائەددین سەججادی.
مشخصات نشر : سنندج : کردستان ، ۱۳۹۹.
مشخصات ظاهری : ۸ ج.؛ ۲۱/۵×۱۴/۵ س‌م.
شابک : دوره : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠-٤١١-٨ / ج١ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠٤١٢-٥
ج٢ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠-٤١٣-٢ / ج٣ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠-٤١٤-٩
ج٤ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠-٤١٥-٦ / ج٥ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠-٤١٦-٣
ج٦ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠-٤١٧-٠ / ج٧ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠-٤١٨-٧
ج٨ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠-٤١٩-٤
وضعیت فهرست نویسی : فیپا
یادداشت : کردی.
موضوع : شوخی‌ها و بذله‌گویی‌های کردی-- عراق-- قرن ۲۰م.
موضوع : 20th century -- Kurdish wit and humor-- Iraq
موضوع : داستان‌های طنزآمیز کردی
موضوع : Humorous stories, Kurdish*
رده بندی کنگره : PIR۳۲۵۶
رده بندی دیویی : ۸فا۹/۲۸۲۶۲
شماره کتابشناسی ملی : ۷۴۲۸۵۳۱
وضعیت رکورد : فیپا

# ڕشتەی مرواری

-٣-

کۆمەڵە ئەدەبیێکی هەرە بە نرخە
لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی

دانراوی:

**ماموستا عەلائەددین سەجادی**



انتشارات کردستان
سنە



# ڕشتەی مرواری

## -٣-


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | ڕشتەی مرواری |
| ✓ دانراوی (مؤلف): | مامۆستا عەلائەددین سەججادی |
| ✓ پێداچوونەوە و هەڵەبژێری: | ژیلا قەوامی / ڕەفیق ڕۆستەمی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ١٣٩٠-٢٠٢١ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ١٠٠٠ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ٢١٩ لاپەڕە (صفحەی رقعی) |
| ✓ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کُردستان) |
| ✓ شابک: | دوره: ٨ - ٤١١ - ٩٨٠ - ٩٦٤ - ٩٧٨ - شابک جلد (٣): ٩ - ٤١٤ - ٩٨٠ - ٩٦٤ - ٩٧٨ |





سنندج، چهارراه شهداء، پاساژ عزتی، انتشارات کُردستان، تلفن: ٣٣١٦٥٣٨٢ ٠٨٧

سنە، پاساژی عیززەتی، بڵاوکردنەوەی کوردستان، تەلەفوون: ٣٣١٦٥٣٨٢ ٨٧ ٠٠٩٨

# ناواخن

خوێندنی ڕەمەکیی کورد
ئەوەیە کە بزانێ کوردە

# بەرگی سێهەم



انتشارات کردستان
سنه

# سەرەتا

**کورد کە بە کوردی خوێندی ئیتر خۆی بۆ خۆی ئەبێ.**

**خوێندنی ڕەمەکیی کورد ئەوەیە کە بزانێ کوردە.**

وەختی خۆی کە دەستم دایە نووسین و دانانی «ڕشتەی مرواری»یەوە بەو تەمایە بووم کە هەر ماوەیەکی درێژ ئەوسا بتوانم بەرگێکی لێ چاپ بدەم؛ بۆیەش ئەڵێم بەو تەمایە بووم، چونکە وا ڕانەئەپەرمووم کە زوو بڵاو ببێتەوە و بکەوێتە دەست خوێندەواران و ئەوان بکەنە کارێ کە لەسەر ئەو بیر و باوەڕە پاشگەز ببمەوە. کەچی بە پێچەوانەی ئەوە ساڵی (١٩٥٧) کە بەرگی یەکەمی دەرچوو، زۆری نەخایان کە هانەهانەی خوێندەوارانی کورد کردیانە کارێ کە بەرگی دووەمیش بێت بە شوێنیا. ئێستێکی وایان کرد کە سوپاسگوزارییان بکەم. ئەم سوپاسگوزارییەش بۆ ئەوە کە قەومی خۆشەویستی کورد بە دڵ و بە گیان هەستیان بەوە کردووە کە خوێندنەوەی کوردی و خوێندنەوەی ئەدەبی کوردی مایەی بەختیارییە بۆ ژیان.

لە ڕاستیشدا وایە؛ چونکە کە ئێمە وتمان خوێندەواری چرای ژیانە، ئەبێ ئەوەش بچێتە دڵمانەوە کە ژیانیش بە خوێندەوارییەوە ژیانە. ژیان هەر خواردن و نووستن نییە؛ ژیان ئەوەیە کە هەرکەس لە عاستی خۆی ئەبێ هەست بەوە بکا کە بۆ بەرزی قەومی خۆی ئەبێ بژی. بۆ ئەوە

بژی کە قەومەکەی بەرز ببێتەوە. قەومیش بەرز نابێتەوە تا خوێندەوار نەبێ، خوێندەواریش نابێ تا بە زمانی خۆی نەخوێنێتەوە.

بەوبۆنەوە سوپاسێکی تایبەتیش ئەکەم بۆ خوا، کە قەومی خۆشەویستی کورد بینی پێوە ناوە بۆ فێربوون بە زمانەکەی خۆی. دیسان سوپاسیشم بۆ ئەو قەومەیە کەوا بە دڵ و بە گیان خەریکی خوێندنەوە و نووسینی زمانی کوردین.

ساڵی (١٩٥٧) دوو بەرگ لەم کتێبە دەرچوو؛ ئەوا ئێستەش بەرگی سێهەمی کەوتە بەردەستی خوێندەوارانەوە. پشت ئەستوورم بە هانەهانەی ئەوان کە بەرگی چوارەم و پێنجەم و... هتدیش هەر ئەخوێننەوە.

**عەلائەددین سەججادی ـ بەغدا**

**٢٦٥٧/١٠/٢١ی کوردی ١٩٥٨/١/١١ی فەرەنگی**



# تاقی کراوەکانی کوردی

سەرچاوەی هەموو عیلم و زانیارییەك تەجرەبە و تاقی‌کردنەوە بووە. ئادەمیزاد نەگیشتۆتە ئەم پلەو پایە بەرزە کە ئێستە هەیەتی مەگەر بە هۆی تاقیکردنەوە نەبووبێ.

ئەم تاقی‌کردنەوەش ئادەمیزادەکانی سەرەتایی کوتوپڕ شتێکیان بۆ ڕێکەوتووە و بەرەبەرە لەوەوە لە سەری ڕۆیشتوون تا گەیشتوونەتە ئەنجام. وەکوو ئەوە لە سەرەتاوە بەهۆی فڕێدانی با وەیا هاویشتنی ئینسانێکی سادەوە بەردێك کەوتووە لە بەردێکی‌تر و پزیسکەی ئاگری لێ بووەتەوە. لەم ڕێکەوتە کوتوپڕیەوە گەیشتوونەتە شوێنێك کە توانیویانە خۆیان ئاگر بکەنەوە و پێویستی خۆیان پێ لابەرن.

هەروەها کوتوپڕ بە ڕێکەوت یەکێك وەیا گیانلەبەرێك نەخۆش بووە و ئەو یەکە وەیا ئەو گیانلەبەرە گیایەکی خواردووە، وەیا بریندار بووە و کوتوپڕ ئەو گیایە کەوتووە لە برینەکەی و پێی چاك بووەتەوە. وەیا دیویانە گیانلەبەرێك لە کاتی نەخۆشی و برینداریدا چووە گیایەکی خواردووە، ئەمان چاویان لێ بووە و تاقییان کردۆتەوە و لە ئەنجاما دەرکەوتووە کە ئەو گیایە بۆ ئەو دەردە باشە.

وەیا یەکێك خەیاڵێك کەوتۆتە دڵیەوە. ویستوویە ئەم خەیاڵەی بهێنێتە دی. هێناویە بەرەبەرە خەریکی بووە و ئەوی لە دڵیا بووە بە

دەست کردوویەتی. لە پاش چەند جارێك بۆی پێك هاتووە، ئەمجا لە شتیترا کەوتۆتە تاقیکردنەوەی و بەهۆی ئەم تاقیکردنەوەیە گەیشتۆتە سەرچاوەی ئیشەکە.

بە کورتی تاقیکردنەوە، ئادەمیزادی لە تاریکی نەزانی خستە ڕۆژێکەوە کە سەرزەوی و بن زەوی و ئاسمانی ڕۆشن کردەوە و گەیشتە شوێنێك کە کەم شت ما لە دەستی دەرچێت.

قەومەکانیتر لە بەرەبەیانی مێژووەوە کەڵکیان لە تاقی کردنەوە وەرگرت و بەرەبەرە هەر شتێك ببوایە ـ با ئەفسانەش بوایە ـ ئەیانخستە سەر کاغەز و پاشان بە عەمەل و کردەوە ئەیانخستە سەر مێزی قسە لێوەکردن و لێکۆڵینەوە، تا وایان لێهات هیچ شتێك لە بن دەستیان دەرنەچوو. ئەم قەومی ئێمەیە ـ کە قەومی خۆشەویستی کوردە ـ بێگومان لە لاپەڕەی مێژوویا لەو ڕۆژگارانەدا کە لاپەڕە لاپەڕە هەڵیگێڕاوەتەوە بە هەزاران هەزار تاقیکردنەوەی بووە و بە قسە گێڕاویەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی نەخراوەتە سەر کاغەز، هەمووی هەروا ڕۆیشتووە و وەکوو بەردی گرانی بن ئاوی مەنگ گوم بووە.

ئەگەر ئەو قسانەی کوردی وەیا ئەو تاقیکراوانەی کوردی ئەمیش وەکوو هی قەومەکانیتر لە زارەوە بخرایەتە سەر کاغەز و بخرایەتە ناو بۆتەی عەمەل و کردەوە، بێگومان ئێستە ئەمیش گەلێ کتێبخانەی ئەبوو کە پێی بڵێن کتێبخانەی عیلمی و پیشە و پزیشکی. ئەیبوو، چونکە مادام کورد لە ژێر هەوای سافا و لە ژێر دەوارا ژیاوە و ئاوی ڕوونی سەرچاوەکانی خواردۆتەوە و بە شەو سەیری گەڕانی مانگ و جریوەی ئەستێرەکانی کردووە و غایەلەیەکیتر نەهاتووە بە دڵیا کە پەردەکەی داپۆشێ، توانیویەتی شت بدۆزێتەوە و دەمی بۆ بەرێ. ئەمەی توانیوە،

بەڵام هەر ئەوەندە بووە کە ئەو قسەیەی پێی بگەیەنێ تا ئەنجامێکی دیاری و ڕووناکی لێ وەرئەگرێ.

ئەم باوەڕی بێ سەروبەریە بە جۆرێك لە ناویا بڵاو بۆتەوە، زۆرتر گاڵتەی بەو قسانە کردووە؛ تەنانەت ئێستەش ئەگەر قسەیەکی تاقیکراوی کوردی ببەیت دوور نییە هەر گاڵتەی پێ بکا و بڵێت ئەم ڕۆژە تازە ڕۆژی ئەم قسانەیە؟ ئەو مەردومی‌تر دەست بۆ ئەو دیوی درێژ ئەکەن، ئەم تازە ئەم قسانەم بۆ ئەگێڕێتەوە.

لام وایە ئەگەر یەکێك ئەم قسەیە بڵێت هەقی نییە؛ چونکە ئەم تاقیکراوانە لە پاشماوەی ئەقڵی باو و باپیری ئێمەن. ئەگەر دەستی خزمەتیان بوایە ئێستە ئێمەش لەم ڕووەوە وەکوو قەومەکانی‌تر ئەبووین. ئەمە و دیسان لە بەچکەی «ژیشك» دڕکاویتر نییە، کەچی دایکەکەی ئەڵێ: «لە بەچکەی من نەرمونۆڵتر نییە!».

جا لە بەر ئەمە من هاتم لەم تاقی‌کراوانەی کوردی چیم بەردەست کەوت نووسیمن و بۆ پاشەڕۆژ هێشتمنەوە. ئومێد ئەکەم ئەمە ببێ بە بناغەی شتێکی گەورە بۆ ئێمە.



# کورد ئەڵێ:

١. ئەڵێن: ئەگەر یەکێك تووشی «کەهەنگ» بوو، خۆی بخاتە ئاوی ساردەوە چاك ئەبێتەوە.( کەهەنگ: نەخۆشییەکە کوتوپڕ لە پشتەوە لە ژێر پشتێنەدا پەیدا ئەبێ و ئەو شوێنە ژان ئەکا. وا لە پیاو ئەکا پشتی کووڕ ئەکا).

٢. ئەڵێن: ئەگەر یەکێك دووپشك پێوەی دا دووپشکەکە ـکە کوژرا ـ بخرێتە سەر ئاگر و بسووتێنرێ، پاشان بخرێتە سەر شوێنەکە، ژانەکەی ئەشکێ.

٣. ئەڵێن: مشك زۆر گل و خولی مارانگاز ئەدا، وە ئەمەش زیانی بۆ مارانگازەکە هەیە، ئەگەر بێتوو ئەو مشکە بە سەریا باز بدا ئەو مارانگازە ئەمرێ.

جا لەبەر ئەمە کورد دێنێ ئەگەر یەکێك مار پێوەی دا، زەنگێك یا تەنەکەیەك یا شتێکی‌تر کە تەقەی بێت دایئەنێن و یەکێکی‌تر بە لایەوە دائەنیشێ و زەنگەکە لێ ئەدا، وەیا تەنەکەکە ئەکوتێ و ئەیکا بە تەقەتەق. ئیتر مشکەکە لەبەر تەقوهۆڕەکە دوور ئەکەوێتەوە و نایە بە لای مارانگازەکەدا.

٤. ئەڵێن: ئەگەر منداڵێك سەری کەچەڵ بوو، جیوەی سوور لەگەڵ کەرەدا بگیرێتەوە و چەند جارێك لێی بدرێ چاك ئەبێتەوە.

٥. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ «گرمەژنە»ی دەرکرد، بە توێکڵی شووتی بیهەنوون چاك ئەبێتەوە.

٦. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ ئاژاوە لە ماڵیا هەبوو، کەوشی تەنگ لە پێ کا، ئەوی لە فیکر ئەچێتەوە.

٧. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ چاوی کەم حوکم بوو، «بۆق»ی سەوز بێنێت «میل» بێنێ بەسەر پشتیا و بیکێشێتە چاوی، چاك ئەبێتەوە و بینایییەکەی زیاد ئەکا، بەڵام ژانی ئێجگار زۆرە.

٨. ئەڵێن: «شنگ» خواردن بۆ دەم و دان خراپە و بۆ ناو سك باشە. «ڕێواس» بۆ دەم و دان باشە و بۆ ناو سك خراپە.

٩. ئەڵێن: یەکێك هار بوو، خۆڵی گۆڕستان بکرێ بە سەریا، ئەمرێ.

١٠. ئەڵێن: ئەگەر دووپشك دای بە ئافرەتی سك پڕەوە لە پاشا ئەو مناڵەی کە لە سکیا بووە، لەو وەختەدا ئەگەر دووپشك پێوەی بدا ئیتر نایەشێ.

١١. ئەڵێن: ئەگەر یەکێك لاواز بوو، ماوەیەك ڕۆنی «چالەکە» بخوا قەڵەو ئەبێتەوە.

١٢. ئەڵێن: گیای «ڕکێشە» بنرێ لە برینی «تیراوێ» چاك ئەبێتەوە.

١٣. ئەڵێن: «پێڵاو»ی سوور لە پێ کردن خەم ئەڕەوێنێ.

١٤. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ دەستی هەر برین و زیچکاوی لێ ئەهات، خوێنی پشتی کیسەڵی لێ بدا چاك ئەبێتەوە.

١٥. ئەڵێن: پیاز بە کاڵی و بە کوڵاوی و بە پیشاوی خواردنی بۆ کۆکە و هەڵامەت زۆر باشە.

١٦. ئەڵێن: چل بەیانی لە خورینی خواردنی حەو دەنك مێوژ وە یا پێنج دەنك بادام بۆ هێز و قوەت زیادکردن زۆر باشە.

١٧. ئەڵێن: لە ڕۆژەکانی پێنجەی تارا هەرکەسێ بنوێ، هەموو ساڵەکە هەر خەوی دێت.

١٨. ئەڵێن: چاوێك بەفر بیبا، دووکەڵی «قانگ»ـی بۆ باشە.

١٩. ئەڵێن: ئەگەر یەکێك سەرما بیبا، «حەمامی ژنان»ـی بۆ بکرێ بەوە دێتەوە سەر خۆی. حەمامی ژنان ئەوەیە کابرا ڕووت و قووت ئەکەنەوە و ڕای ئەکێشن. سێ ژنیش وەکوو ئەو خۆیان ڕووت ئەکەنەوە. یەکێکیان لەملای و یەکێکیان لەولای ڕائەکشێن؛ ئەوی سێهەمینیش خۆی ئەدا بە سەریا. گۆشت لەسەر گۆشت ڕائەکشێن، ئەمجا نوێن ئەدرێ بەسەر ئەمانەدا. ئەمانە کابرا ئەگووشنە یەك، بە هەڵمی ئەمانە کابرا تینی تێ ئەکەوێتەوە کە تینی تێکەوت و هۆشی هاتەوە بە خۆیا، ژنەکان هەڵئەستن و کابرا بە نوێن دائەپۆشن تا بە تەواوی گوڕی پیا دێتەوە.

٢٠. ئەڵێن: خواردنی ڕۆن گەرچەك بۆ ڕەوانی باشە.

٢١. ئەڵێن: تۆك خواردن بۆ سکچوون باشە.

۲۲. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ مار پێوەی بدا، شیری کاڵ بخواتەوە باشە.

۲۳. ئەڵێن: هەنگوین و کاڵەك خواردنیان پێکەوە زیانێکی زۆری هەیە.

۲٤. ئەڵێن: یەکێ کە ژانی کرد (بلامانێ) بتسێ، باشە.

۲٥. ئەڵێن: یەکێ ئاڵووی بکەوێ، پارووی گەورە بنێ وەیا پەنجە گەورەکەی بچەمێنێتەوە بەینی جومگەی یەکەم و دووهەمی ببا بە دەما ئاڵووەکەی چاك ئەبێتەوە.

۲٦. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ سەگەل گەمارۆیان دا و کەوتە ناویانەوە، لە شوێنەکەی خۆی دانیشێ، ئیتر لاقەی ناکەن.

۲۷. ئەڵێن: دەستێ، قاچێ، شوێنێ کە شکا، کەرتەهیزەی تێوە پێچن چاك ئەبێتەوە.

۲۸. ئەڵێن: ئەوانەی کە خەریکن هار ببن چاویان بە شتی سوور بکەوێ خراپتر ئەبن.

۲۹. ئەڵێن: کەسێ «گەوزن»ی پێ بێ، مار و دووپشك نزیکی ناکەون. (گەوزەن شاخی کەڵەکێوییە ئەکرێ بە دەسکی قەڵەمبڕ و شتە).

۳۰. ئەڵێن: ڕۆنی مەیموون خواردن پیاو ئەخاتە جامبازە.

۳۱. ئەڵێن: مناڵ بە مناڵی بنەون لە باڵی و ڕایکێشن چاوی خێل ئەبێ.

٣٢. ئەڵێن: هەر ژنێك چێشتی سوێری کرد، ئەوە ئارەزووی لە ئیشە خۆشەکەیە.

٣٣. ئەڵێن: زەردوویبیدار تەماشای جووڵانەوەی ماسی بکا لەناو ئاوا زەردوویەکەی ئەڕوا.



٣٤. بە زۆرێکی زۆر گیرۆدەی دەست منداڵبوونن. لەوانەیە سەریان لە خۆیان و لە منداڵەکانیش تێك داوە. هی واش هەیە نقە ئەکا و جقە ئەکا و شەخس و نوکتە و دوکتۆر ئەڕوا بۆ کەرتەمناڵێك؛ کەچی هەر بەولاوە ئەچێ و هیچی نابێ. دیارە ئەمانەی کەوا منالیان نابێ، نەخۆشی و ناتەواوییەك لە لەشی خۆیانا وەیا لە لەشی پیاوەکانیانا هەیە؛ یا پیاوەکە تووی نییە، یا ژنەکە منداڵدانی زەدەیەکی تیا هەیە. جارێ لەمەیان بگەڕێین.

باری منداڵ زۆر بوونەکە تەنگوچەڵەمەیەکی زۆر گەورەیە بۆ زۆر کەس لە زۆر شوێنا. دوور نییە دوکتۆرەکانی عالەمیش بە دەست ئەم مەسەلەوە دامابن و هەریەکە قسەیەکیان کردووە و هەریەکە جۆرە چارێکیان وتووە؛ لەگەڵ ئەوەیشا نەگەیشتوونەتە ئامانج. ئەمە و دیسان هەر شتێك لەسەر پێ و شوێنی تەبیعەت لاچوو، لە لایەکیترەوە زیانی هەیە. زیانەکەش ئەوەیە وا بڵێین کە مەکینەی لەشی ئەم ئافرەتە تەواوە و ئامادەیە بۆ منداڵبوون، ئەگەر هاتوو بەربەستی ئەوە بە دەرمان و بە شتومەکی دەستکاری، دەستکاری کرا، ئەوە مەکینە ئەسڵییەکە لەسەر ئیشکردنی خۆی بە زۆر لادراوە. شتێکیش کە بە زۆر لابدرێ لەسەر ڕێ و شوێنی خۆی، گومانی تیا نییە کە زیانی هەیە.

ئەم لایەنەش (لایەنی مناڵ زۆر بوون) بۆیە ئەوەندە بووە بە تەنگوچەڵەمەی عالەم، چونکە شەرت لەم ڕۆژەدا هەر منال فرێدان نییە، شەرت بەخێو کردن و تەربیەتدانە. شت کە زۆر بوو، نە ئەو بەخێوکردنە ئەبێ وە نە ئەو تەربیەتە ئەبێ کە ئیمڕۆژ پێویستە. باوك و دایك نازانن لا، بەلای کامیانەوە بکەنەوە و تەربیەتی کامیان دادەن. ئەمە بێجگە لەوە کە ئەم باوك و دایکە لە ژیانا هیچ حەسانەوەیەکیان دەست ناکەوێ، دوور نییە تاوانێکیشە کە بەرانبەر بەم منال زۆریە ئەکرێ.

جا من - بە خێری خۆم - دەرمانێکم لایە کە هیچ زیانێکی تەبیعیشی نییە بۆ ئەو مەکینە ئەسڵییەی لەشی ژن و پیاوە. ئەیلێم، ئەوی بەجێی هێنا بەجێی هێنا، ئەوەش کە نەیهێنا بە دەردی خۆیەوە با بتلێتەوە. ئەم دەرمانەش زۆر کەس داوایان لێ‌کردووم بە پارە، بەلام من قازانجی تێکڕایی ناگۆڕمەوە بە پارە. لەم ڕووەوە ناچارین ئەبێ زۆر بەبێ پەردە و بە ئاشکرا قسە بکەین:

ژن لە مانگێکا جارێك حەیز (عوزری شەرعی) پیا دێت. دیارە لەو ماوەیەدا پیاو توخنی ناکەوێ. ماوەی حەیزەکەی سێ ڕۆژە، پێنج ڕۆژە، حەو ڕۆژە. هەرچەندە هەیە، لەبەر نەچوونی پیاوەکە بۆلای، وە لەبەر خلتە و لیتەی ئەو خوێن و هەرا و بەزمە، منالدانەکەی بە هیچ جۆر ئامادەی منال وەرگرتن نییە؛ واتە ئەگەر بە کوتەکیش ئاو شەهوەتەکەی تێ بکرێ وەری‌ناگرێ.

ئەو ڕۆژە کە لە حەیزەکە بووەوە هەموو ئافرەتێ خۆی حەسابی خۆی ئەزانێ. لە پاش ئەو ڕۆژە تا ماوەی پێنج ڕۆژ منالدانەکەی خالی ئەبێ لەو هێلکانەی کە منالی لێ دروست ئەبێ. لەو پێنج ڕۆژەدا پیاوەکە ئەتوانێ بچێتە لای و هیچ موتوربە و پەیوەندییەك دروست نابێ. چونکە

شتومەك و ئەسپابی موتوربە پێك نەهاتووە.

ئەمجا لە پاش ئەو پێنج ڕۆژە تا ماوەی یەك حەفتە کوورە بە جۆشە و منالّدان پڕی ئەبێ لە هێلکەی بێخەوشی منالّ. لەو ماوەیەدا ـ ماوەی حەوت ڕۆژەکە ـ ئەگەر پیاوەکە چووە لای و ئاوەکەی ئەم چووە منالّدانەکەوە، ئەوە موتوربە ئەبێ و بناغەی منالّ پەیدا ئەبێ. تەنانەت لە پاش ئەو حەفتەیە گەلێ جار ئافرەت هەست ئەکا کە ئاوێکی لینجی زیچکاوی پیا دێتە خوارەوە، ئەوە ئەو ئاوە خلّتەی هێلکە پیسەکانن و بە بێفەڕی دەریان ئەداتەوە.

بەلاّم بۆ پێك هێنانی ئەم ئیشە زانینی حیساب و حیساب تێك نەچوون زۆر پێویستە؛ هەر لەگەلّ حیسابەکە تێك چوو، ئیشەکەش تێك ئەچێ، ئیتر تۆ بە خێر و من بە سەلامەت.

٣٥. ئەلّێن: یەکێك ئەکەوێتە نزگەرە کردن و هەر لە کۆلّی نابێتەوە، کوتوپڕ لە ناکاو خەبەرێکی ناخۆشی بدەنێ، نزگەرەکەی لە کۆلّ ئەکەوێ.

٣٦. ئەلّێن: منالّ بە کۆرپەیی نینۆکی بکرێ دز ئەبێ.

٣٧. ئەلّێن: منالّ کە تازە پەیدا ئەبێ و دایکەکەی زەیستانە، تا چل شەو چرای بە ژوور سەرەوە دائەگیرسێنن.

٣٨. لەناو ئەو کوردەوارییەدا باوە منالّی تا دوو سالاّن، ئەگەر هات و زۆر گریا وەیا هەموو جار کوتوپڕ ڕائەچەنی لە خەو، ئەلّێن: ئەمە گۆیا ترساوە. بۆ ئەم ئیشە دێنن قورقوشم ئەتاوێننەوە جامێکی خالّی لەسەر سەری منالّەکە ڕائەگرن و قورقوشمە تواوەکەی ـ بەو نیازە کە

ترسەکەی لاچێ-تێی قلّپ ئەدەنەوە. ئیتر ترسی مناڵەکە لائەچێ و گۆیا قورقوشمەکەش کە «مەیین» ئەبێ، بەوێنەی ئەو شتە کە مناڵەکەی لێ ترساوە.

٣٩. ئەڵێن: مناڵ کە تووشی نەخۆشی مانگ بوو، جامێ ئاوی لەسەر ڕائەگرن و حەو پشکۆی تیا ئەکوژێننەوە نەخۆشییەکەی ئەڕوا. «مانگ»، ناوی نەخۆشییەکە تووشی مناڵ ئەبێ و لە هەر شوێنە شتێکی پێ ئەڵێن.

٤٠. ئەڵێن: بە گسک لە مناڵ دان تەمەنی ئەو مناڵە کورت ئەکاتەوە.

٤١. ئەڵێن: یەکێك ئەگەر «موو» لە پەنجەی هات، «گا»یەك بێنن کونە لووتێکی گاکە بگرن و کابرا پەنجەکەی بکا بە کونە لووتەکەیتریا و گاکە هەڵیبمژێ. نێرەکەکە لە بن دێت و چاك ئەبێتەوە.

٤٢. ئەڵێن: یەکێك ئەگەر «دڵۆ» لە پەنجەی هات، ئەنگوستیلەی پۆلا بکاتە ئەو پەنجەیە چاك ئەبێتەوە. «دڵۆ»، ئەوەیە پێستی بەینی نینۆك و پەنجە ڕووش هەڵئەدا.

٤٣. ئەڵێن: یەکێك ڕتووبەت و ژان و با کەوتە شوێنێکی لەشیەوە، خوری نەشۆراوی لێنێ و بە شتێك بیپێچێ چاك ئەبێتەوە.

٤٤. ئەڵێن: «بنێشتەتاڵ» و «زاخ» تێکەڵاو بکرێن و بیسوون بە پارچە پەڕۆیەکا و بیخەنە سەر ئەو شوێنە کە باداری لێیە چاك ئەبێتەوە.

٤٥. ئەڵێن: ئەو شوێنە کە ژان و بای لێیە، گەڵای «بناوەتۆ»ی لێ بنێن چاك ئەبێتەوە.

٤٦. ئەڵێن: شوێنێك لە لەشی عینسانا کە ژان و بای تێدا بوو، بنێشتەتاڵ، ڕۆن گەرچەك و مێو (مۆمی هەنگوین)، ئەمانە پێکەوە جوان بکوڵێنرێن تا ئەبن بە مەلحەم و ئەو وەختە لێی بدا، چاك ئەبێتەوە.

٤٧. ئەڵێن: یەکێ کە چاوی هاتە ژان، زاخ لەسەر «تەپاڵەکێویلە» ئەسووتێنێ و لە پاشا لەگەڵ شەکەرا ئەیسوێتەوە و تێی ئەکا، چاك ئەبێتەوە.

٤٨. ئەڵێن: ئەگەر یەکێك «هەزارپێ» چووە گوێچکەیەوە، دێنن «هەزبیە» و «مەرزە» و «ئاڵەت و زەردەچەوە» پێکەوە ئەکوتن و ئەیسوونەوە، ئەمجا لەگەڵ گۆشتا ئەیکوتن و پانی ئەکەنەوە و ئەیخەنە سەر گوێیەك کە هەزارپێیەکەی تێ چووە، بە بۆنی ئەوانەوە ئیتر دێتە دەرەوە.

٤٩. ئەڵێن: زەردێنەی هێلکە دێنن ئەیسوون بە هەردوو بەرەلەپا و دەست بە یەکا دێنن تا وردە وردە زەردێنە هێلکەکە توند ئەبێتەوە و وەکوو پرپۆڵە هەڵئەوەرێ. ئەمجا دێنن ئاردی گەنمە بەهارە و ئاوی «هەمیشەجوان» ـکە گیایەکە ـ و ئاوی ڕکێشە و کەرەی مانگا و ڕۆن گەرچەك و ئەمانەی تێکەڵاو ئەکەن و پێکەوە ئەیانشێلن، تا ئەبن بە مەلحەم. ئەو وەختە ئەیخەنە سەر ئەو برینانە کە زۆر کاریگەرن چاك ئەبنەوە.

٥٠. ئەڵێن: ئەو شوێنەی کە گوللەی بەرکەوتبێ وەیا خەنجەر لێی درابێ، وەیا کابرا لە شوێنێك کەوتبێتە خوارەوە و زام و برینێکی زلی تێ بووبێ و خوێنەکەی نەوەستێتەوە و چاك نەبێتەوە، بێنن لە پێشا هەنگوین بخەنە سەر برینەکە خوێنەکەی ئەوەستێتەوە، پاش ئەوە «هەوژە» و «بەرژەڤ» ـ کە ئەمانە دوو گیان ـ لەگەڵ مێو و مۆمی هەنگ و بنێشتەتاڵ تێکەڵاو بکرێ و ببێ بە مەلحەم و بخرێتە سەری، چاك ئەبێتەوە.

٥١. ئەڵێن: هەر برینێك کە زۆر سەخت و گران بێ، بە ئەندازەی قاپێك ڕۆن گەرچەك بێنن بە ئەندازەی هێلکەیەك کبریتی زەرد بخەنە ناویەوە. لەناو مەنجەڵ یا دیزەیەکی تۆزێ فراوانا بیانکوڵێنن. ئەوەندە بکوڵێنرێ تا کبریتەکە ڕەش دائەگەڕێ، پاش ئەوە دایبگرن تا سارد ئەبێتەوە. ئەمجا برینە کون بووەکە بە فتیلە ئەو مەعجوونەی تێ هەڵکێشن، ئەگەر هەر برینێ ڕواڵەتی بوو مەعجوونەکەی لێ ئەدەن و ئەیپێچن چاك ئەبێتەوە.

٥٢. ئەڵێن: «ڕیشەی زریشك» بێنیت پاکی کەی، پاشان بیکوتی بۆ ئەمە شی ببێتەوە و ئەمجا بیکوڵێنی جوان جوان تا هیچ هێزی تیا نامێنێ؛ ئەو وەختە تڵفەکەی فڕێ دەیت و دیسان ئاوەکەی بخەیتەوە سەر تا ئەوەندە ئەکوڵێ هیچ ئاوی تیا نامێنێ مەگەر تەنها مەعجوونی ڕۆحی گیاکە نەبێ. ئەمجا بێنی تۆزێ لەو مەعجوونە بخەیتە سەر هەر برینێك کە خوێنی نەوەستێتەوە خوێنەکەی ئەوەستێنێتەوە و بە یەك دوو دەست برینەکەش چاك ئەبێتەوە.

٥٣. ئەڵێن: گیایەك هەیە پێی ئەڵێن «ئاڵەتەکێویلە»، بیهێنی و بیکوتی بیخەیتە سەر ئەو شوێنە کە ژان و بای تیایە لە لەشی پیاوا، شوێنەکە ئەکا بە برین و هەچ ژان و بایەك هەیە لەو شوێنەدا لە برینەکەوە ئەیکێشی و پاشان برینەکەش چاك ئەبێتەوە.

٥٤. ئەڵێن: ئەو گیایە کە پێی ئەڵێن ئاڵەتەکێویلە بیهێنی و بیخەیتە سەر بالووك ئەیسووتێنێ و هەچ بالووکێکیتر لە لەشا هەبێ هەمووی لا ئەبا.

٥٥. ئەڵێن: جانەوەرێك هەیە سوور و پچکۆلەیە پێی ئەڵێن «گوێرەکە سوورە». ئەو گوێرەکە سوورەیە بیهێنی و بیگوشیتە سەر بالووك، زیچکاوێك لە قنگیەوە دەرئەچێ بە هۆی گوشینەکەوە. ئەو زیچکاوە بچێتە سەر بالووکەکە ئەو بالووکە و هەچ بالووکێ لە لەشیایە هەمووی چاك ئەبێتەوە.

٥٦. ژنێك بوو لە «ئیسیاوا» شەوێك دەم ئەنێتە کانییەك ئاو بخواتەوە، بە دەم ئاو خواردنەکەوە مارێك ئەچێتە ناو سکی. هەرچەند ئەملاوئەولایان پێ کرد هیچ کەڵکی نەبوو.

پیاوێك هەبوو لەو دێیەدا «نوورە»ی ناو بوو؛ دەستی حەکیمی هەبوو. ئەویان هێنایە سەری. نوورە کە چاوی پێکەوت وتی: من ئەم مارەی لە سك دەردێنم بەبێ ئەوەی ئافرەتەکە هیچی بەسەر بێت.

وتی: بە ئەندازەی دوو بەرەلەپ گۆشتی نەرمی لاڕانی مەڕێکم بۆ بێنن. گۆشتەکەیان بۆ هێنا. زۆر جوان لەگەڵ «خوێیاوک»ێکی زۆر زۆرا سووری کردەوە و دای بە ئافرەتەکە وتی: بیخۆ. کانییەك قەڵبەزەی ئەکرد لە قەراخ ئاواییەکە. وتی: ئافرەتەکە بەرنە بەر ئەو قەڵبەزەیە نزیك بە ئاوەکە

و بە ئافرەتەکەی وت: کە دەمی بکاتەوە. زۆری پێنەچوو مار لە تینوانا ئارامی لێ بڕا و سەری لە دەمی ئافرەتەکەوە هێنایە دەرەوە ڕووبەرووی ئاوەکەوە، ناشگا بە ئاوەکە. زۆرتر هەرەسی پێ هەڵگیرا و تینوویێتی زۆری لێ سەند، وردە وردە ئەهاتە دەرەوە و ئەکشا بۆ ئاوەکە. هەر ئەهات و نزیک ئەبووەوە لە ئاوەکە و دەمیشی نە ئەگەیشتێ تا دوایی بە تەواوی هاتە دەرەوە و چووە سەر ئاوەکە. نوورەش وتی: هیچ لاقەی مەکەن. ئافرەتەکەیان دوور خستەوە، مارە چووە سەر ئاوەکە و تێر ئاوی خواردەوە، ویستی بگەڕێتەوە قورس بووبوو نەیئەتوانی بڕوا. ئیتر بە ئاسانی کوشتیان.

ئەمجا هێنای داوای مەنجەڵێ «شیر»ی کرد. شیرەکەیان بۆ هێنا و بە ئافرەتەکەی وت: بیخواتەوە. ئافرەت هەر شیری ئەخواردەوە و بە ژەهرەوە هەڵیئەهێنایەوە. ئەوەندەی شیر دایە تا ئیتر هەڵینەئەهێنایەوە.

پاش ئەوە داوای هەنگوینی کرد. هەنگوینیشیان بۆ هێنا و بە ئافرەتەکەی وت: دەست بکا بە هەنگوین خواردن، تا سێ ڕۆژ ئافرەت خۆی گرتە هەنگوین و ئیتر بە تەواوی چاك بووەوە.

**٥٧.** ئەڵێن: سەگ کە لوورانی، تا کەوشی بۆ هەڵنەگێڕنەوە لە لوورە ناکەوێ.

**٥٨.** لەناو کوردا باوە، ئەوا یەکێك پێڵاوەکانی دائەکەنێ، کە دائەکەنێ دواجار سەیر ئەکا پاژنەکانیان ڕوویان کردۆتە یەك. هەڵئەستێ ئەچێ لە بەریانا دائەنیشێ بە هەردوو دەست پێڵاوەکان هەڵئەگرێ ئەیانتەکێنێتە کۆشیەوە و پێڵاوەکان دائەنێتەوە. پاشان دەست ئەباتە کۆشی و چنگی پڕ ئەکا و ئەیکاتە گیرفانیەوە. دیارە هیچیش لە کۆشیا نییە، بەڵام هەر وا ئەکات، گۆیا ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە ماڵ و پارەیەکی پێ ئەگات.

٥٩. یەکێ کە بەرلەپێ ڕاستی خورا ماچی ئەکاتەوە و ئەیخشێنێ بەسەر سەریا، بەو جۆرە خورووەکەی لائەبا. ئەمە مانای ئەوەیە کە پارەی دێتە دەست، خۆ ئەگەر بەرلەپێ چەپی خورا ئەوە مانای ئەوەیە کە پارەی لە دەست ئەبێتەوە؛ هەر ئەیخورێنێ و هیچی‌تر.

٦٠. لەو وەختەدا کە پیاو پێڵاوەکانی دائەکەنێ، ئەگەر سواری یەك بوون، ئەوە مانای ئەوەیە سەفەری ئەکەوێتە بەر؛ جا لووتی کەوشەکە لە کوێ بوو سەفەرەکەی بۆ ئەوێیە.

٦١. ئەڵێن: پیاو بە شەو گوێ بخاتە سەر ئەرزەکە و هەستی خۆی بۆ ڕاگرێ تا حەو فرسەخ چ دەنگ و سەنگێك هەبێ گوێی لێ ئەبێ.

٦٢. ئەڵێن: ئەگەر ماڵێك یەکێکی چووبوو بۆ سەفەر و کاروان، «قەلەڕەش» هات و بەیانیان لە دەوروبەری ماڵەکە دەستی کرد بە قرەقڕ، ئەوە هاتنەوەی کەسەکە لە سەفەرەکەی لە ئیمڕۆ و سبەیدایە.

٦٣. ئەڵێن: ئەگەر بە زستانان ـ با ڕۆژیش زۆر خۆش و هەتاو بێت ـ چۆلەکە پەلاماری ژووری دا و دەستی کرد بە هەڵپە کردن بۆ دان خواردن، ئەوە بەفرێکی زۆر قورس ئەبارێ و ڕەشایی لە زەوی ئەبڕێ.

٦٤. ئەڵێن: لە ڕۆژی هەتاو و خۆشی زستانا ئەگەر چۆلەکە دەستی کرد بە مەلە کردن و باڵە فڕکێ، ئەوە باران ئەبارێ.

٦٥. ئەڵێن: ئەگەر جومعە بوارۆ شەنبە وەش کەرۆ، شەنبە بوارۆ پەنج و شەش کەرۆ.

٦٦. ئەڵێن: هەر ئێوارەیەك ڕۆژ لە هەورا ئاوا ببێت نیشانەی بارانبارینە.

٦٧. ئەڵێن: ئەگەر هەور چوو بۆ ڕۆژهەڵات، برۆ بۆ کاروان و باران ناباریێ. ئەگەر چوو بۆ لای جنووب ئەوە باران ئەباریێ، لە ماڵەوە دەرمەچۆ.

٦٨. ئەڵێن: «شاخی مار» بکرێ بە مەشکەدا بەرەمەشکەی زیاد ئەبێ.

٦٩. ئەڵێن: مار کە تۆپێنرا تا نەکەوێتە شەوێ و چاوی بە ئەستێرەی خۆی نەکەوێ بە تەواوی ناتۆپێ.

٧٠. ئەڵێن: موورووی شین بۆ چاوەزار باشە.

٧١. ئەڵێن: دووکەڵی تەپاڵە بۆ ڕەوەمێشوولە باشە.

٧٢. ئەڵێن: «گرێ»ـی دارگوێز لە بەهارانا هەر کارەساتێك لە نزیکەوە ڕوو بدا وەیا هەر شتێك بەوێدا تێپەڕێ لەناو ئەوا وێنە ئەگرێ.

٧٣. ئەڵێن: ژن و خانوو و وڵاخی بەرزە ومیان بۆ هەیە.

٧٤. ئەڵێن: پیاوی پشتمل پان بێ‌ئەقڵە.

٧٥. ئەڵێن: پیاوی موو سووری کورتە باڵای هەنگاو زل، با زۆر چاکەش لەگەڵ یەکێکا بکا ئاخرەکەی زیانی هەر لێ ئەبینرێ.

٧٦. ئەڵێن: جل، کە لە بەرا درواپەوە و پینە کرا هەژاری دێنێ.

٧٧. ئەڵێن: بە شەو گەسك دان خراپە.

٧٨. ئەڵێن: بە شەو مەنجەڵی ڕەشدان بۆ خواستن خراپە.

٧٩. ئەڵێن: ئافرەتی لەشپیس شیر بخاتە سەر ئاگر شیرەکەی ئەبزڕکێ.

٨٠. ئەڵێن: کراسی سوور کچ زوو گەورە ئەکا.

٨١. ئەڵێن: هەر هاوینێك زۆر گەرم بوو، ئەو زستانەی کە بە شوێنیا دێت زۆر سارد ئەبێ.

٨٢. ئەڵێن: یەکێ کە ژێر پێی خورا ئەوە بۆ سەفەر و کاروان ئەچێ.

٨٣. ئەڵێن: پێستی سمۆرە بۆ کیسەپارە، سەر بە ڕزقە.

٨٤. ئەڵێن: یەکێ سەری چاوی چەپ و چاوی ڕاستی بفڕێ تووشی خێر ئەبێ.

٨٥. ئەڵێن: یەکێك کە لە دەشتەوە بە ڕێگەدا ئەڕۆیشت، کەروێشك ڕێگەکەی بڕی، خراپە. ئەگەر ڕێوی بڕی چاکە.

٨٦. ئەڵێن: کڵاو بە وەرگەڕاوی لە سەر بنێیت، گرانی ئەبێت.

٨٧. ئەڵێن: یەکێك کە چوو بۆ سەفەر و کاروانێك ئەگەر پێیان خۆش بوو بگەڕێتەوە، ئاوی ڕوون ڕۆ ئەکەن بە شوێنیا؛ خۆ ئەگەر لێی بێزار بوون و ئەیانویست ئیتر نەیەتەوە دیزەی ڕەش بە شوێنیا ئەشکێنن.

٨٨. یەکێك کە ویستی بچێ بۆ شوێنێك، وەیا ویستی ئیشێك بکا، ئەگەر لەو وەختەدا یەکێك وەیا خۆی جارێك پژمی، ئەڵێ: ئەوە سەبری هێنا و ئیتر دەست نادا بە ئیشەکەوە. خۆ ئەگەر دوو جار پژمی ئەڵێ: ئەوە جەختی هێنا و زۆر چاکە؛ ئەچێ بەشوێنیەوە.

٨٩. ئەڵێن: بە شەو گەسك دان هەژاری دێنێ. جا لەبەر ئەمە ئەگەر هات و شەو پێویست بوو گەسك بدرێ، دێنن پووشێکی لێ ئەشکێننەوە، وەیا گەسکەکە ئەگرن بە گڕی چراکەدا تۆزێکی لێ ئەسووتێ و ئەو وەختە گەسکەکەی پێ ئەدەن.

٩٠. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ بە شەو تەماشای ئاوێنە بکا ئەچێ بۆ غەریبی.

٩١. ئەڵێن: بە شەو نینۆککردن خراپە.

٩٢. مریشك هەر کە خوێندی خێرا دێنن سەری ئەبڕن، ئەڵێن: ئەوە وەیشوومەیەکی پێوەیە. کە سەر بڕا ئیتر وەیشوومەکە ئەڕوا و ڕوو ناکاتە ئەو ماڵە. هەروەها کەڵەشێریش کە پاش شێوان و پاش خەوتنان خوێندی، ئەویش هەر ئەو سەمەرەی هەیە و سەری ئەبڕن.

٩٣. لە ڕەوشی کوردەکانە ئەوا بووك دێنن، کە گەیشتە جێ، زاوا ئەچێ لە دوورەوە سێوێکی تێ ئەگرێ. هەروەها لەو وەختەدا کە بووکە پێ ئەنێتە ناو دەروازەی حەوشەی زاوا، زاوا قامیشێك ئەگرێ بە دەستەوە و ئەیدا لەسەر سەری بووك، گۆیا بەم ئیشانە سامی ئەنیشێتە سەری.

دیسان لەو وەختەدا کە بووك لە ژوورەوە دانیشتووە و پێخەسووەکەی

بە لایەوە و زاوا ئەچێتە ژوورەوە (ئەچێتە پەردە)، کە ئەم سەری کرد بە ژوورەکەدا بووکەکە ئەبێ هەستێ. پێخەسوو دەستی ئەگرێ و ئەیداتە دەست زاوا و ئەڵێ: «ئەوە ژنەکەت». زاوا دەستی ژن ئەگرێ و لەو وەختەدا چ بووك و چ زاوا کۆششێ ئەوە ئەکەن کە پێ بنێنن بەسەر پێی یەکا، گۆیا هەرکامیان پێش کەوتن ئەوە ئیتر سامی ئەمیان ئەنیشێتە سەر ئەویان. خۆ ئەگەر بووکەکە ئەمەی بۆ ڕێ نەکەوت، زاوا یەکەمجار کە داوای ئاوی لێ ئەکا بووکەکە هەڵئەستێ ئاوی بۆ بێنێ، لەو وەختەدا بەبێ ئەوە زاواکە ئاگای لێ بێ، قومێ لە ئاوەکە ئەکاتە دەمیەوە و ئەیکاتە ناو جامەکە و ئەمجا ئەیدا بە مێردەکەی بیخواتەوە. ئەگەر ئەم ئیشەی کرد، گۆیا سامی ئەنیشێتە سەر مێردەکەی و ئیتر بە ئارەزووی خۆی ئەیڕانێ.

٩٤. ئەڵێن: ئەوە کابرا ژنی هەیە و ئەچێ ژنێکیتر دێنێت، لەو وەختەدا کە بووك ئەگوێزرێتەوە و دێتە ژوورەوە، ژنە کۆنەکە مەنجەڵێکی ڕەش دێنێ سەرەونخوونی ئەکاتەوە ئەچێتە سەری. چوونە سەر مەنجەڵەکە و هاتنە ژوورەوەی بووکی تازە ئەبێ یەك بگرێ؛ گۆیا ئەم ئیشە بۆ ئەوە ئەکا کە بووکی تازە لە بەرچاو مێردەکەی بکەوێ. خۆ ئەگەر بیەوێ ئیشەکەی چاکتر سەر بگرێ، هەندێ «کل»یشی بۆ حەوا ئەدا، جا بیگرێ یا نەیگرێ ئەوە شتێکیترە، ئەمە دیسان هەر بۆ ئەوەیە کە مێرد لووت بە تازە بووکا نەیەنێ.

٩٥. ئەڵێن: ئەگەر مانگ خەرمانە (ئاخڵە)ی دا ئەوە نیشانەی بارانە.

٩٦. ئەڵێن: ئەگەر با لەلای قیبلەوە هات ئەوە نیشانەی بارانە و پێی ئەڵێن: «بای ڕێژنە».

٩٧. لەناو کورددا باوە: ژنان ئەچن بۆ سەر شەخس. هەر ژنە بە نیازێک ڕیزەڵە بەردێك هەڵئەگرێ و نیازەکەی خۆی لە دڵا ئەڵێت و بەردەکە ئەنووسێنێ بە کێلی گۆڕی شەخسەکەوە. ئەگەر کێلەکە ڕیزەڵە بەردەکەی گرتە خۆی، ئەوە نیازەکەی جێبەجێ ئەبێ، ئەگەر نەیگرت، هیچ.

٩٨. لەناو کوردەواریدا باوە: ئەگەر یەکێ قەیچی (مەقەست)ی دا بە دەست یەکێکەوە ڕاستەوڕاست نایداتێ، یا ئەمە بۆی دائەنێتە سەر زەوییەکە، وەیا ئەمەتە ئەیخاتە سەر پشتی دەستی خۆی و دەستی بۆ ڕائەگرێ و ئەویش هەڵیئەگرێ.

٩٩. ئەڵێن: ژن لەو وەختەدا کە «گونك»ـی هەویر لە سوێنەکە هەڵئەگرێ، ئەگەر پرزۆڵە لە گونکەکە بووەوە و پەرت بووە دەری سوێنەکە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە میوان دێت.

١٠٠. ئەڵێن: منالی ساوا کە دەستی کرد بە گسك‌دان، ئەوە نیشانەی هاتنی میوانە.

١٠١. ئەڵێن: مریشك کە بە لادا ئەکەوێ، ئەڵێن: ئەوە باری خستووە، نیشانەی هاتنی میوانێکی وایە کە بە بارە دیارییەوە دێت.

١٠٢. ئەڵێن: پشیلە کە دەموچاوی ئەشوا ئەگەر دەستی هێنا بەسەر گوێچکەیا ئەوە نیشانەی هاتنی میوانە.

١٠٣. ئەڵێن: مریشك کە خۆی دۆزی نیشانەی ئەوەیە ئەبێ بە کەوەڕۆژ و پاشان باران.

١٠٤. ئەڵێن: ورچ کە ئاگری چاوپێ‌کەوت، ئەکەوێتە جامبازە و بۆی دەرئەچێ؛ بە هیچ جۆر ناوێرێ نزیکی بکەوێ.

١٠٥. ئەڵێن: کە پیاو بە شەو چرای پێ بوو، سەگ ئیتر توخنی ناکەوێ.

١٠٦. ئەڵێن: هەرکەس نقورچ بگرێ لە «دۆمە ژن» چەقۆ بە دەستی چاك تیژ ئەبێ.

١٠٧. ئەڵێن: پیاوێ کە لووتی زل بوو دەعباکەشی زلە. ئافرەتێ کە دەمی زل بوو بلامانێ وانێکەکەی ـ ماشاء الله ـ فراوانە.

١٠٨. ئەڵێن: یەکێ تیکە (پاروو) لە یەکێ بفڕێنێ وەیا بیخوا، ئەبێ بە شەڕیان.

١٠٩. ئەڵێن: مریشك کە پۆپەی سوور کرد، ئەوە ئیتر دەمەدەمی هێلکەکردنیەتی.

١١٠. ئەڵێن: کە گەڵا «کون» کرا باران ئەبارێ.

١١١. ئەڵێن: لە دوای «کێلەبەردینە» کردن، باران ئەبارێ.

١١٢. کە ڕەشەوڵاخ «باپێچی» کرد «کاڵە»کۆنی لە مل ئەکەن.

١١٣. لەو وڵاتی کوردەوارییە کە مانگ گیرا تەپڵ لێ ئەدەن و تفەنگ ئەتەقێنن.

١١٤. ئەڵێن: کە بێوەژن گوێزرایەوە، هەڵامەت پەیدا ئەبێ.

١١٥. لەو وڵاتی کوردەوارییە کە نانی شایی بووك ئەخۆن، دەست ناشۆن.

١١٦. ئەڵێن: ئینسانی پارەدار کڵاوی چڵکنە.

١١٧. ئەڵێن: یەکێ دومەڵی لێ بێ، ئەوە پارەدارە و دەری ناخا؛ دومەڵەکە دەریئەخا.

١١٨. لەو وڵاتی کوردەوارییە کە مانگی سەفەر ئەڕوا، دیزەی ڕەشی بە دوادا ئەشکێنن.

١١٩. لەناو کوردەکانا وڵاغی خۆشەویست موورووی شینی لە مل ئەکەن لەبەر چاوەزار.

١٢٠. لە ڕەوشتی کوردەکانە: کە بووکیان گواستەوە کەڵەشێری بە سەرا هەڵئەدەن.

١٢١. ئەڵێن: کە بووك ئەگوێزنەوە سواری ماینی ئەکەن.

١٢٢. ئەڵێن: پیاوی بێ ژن لە گوێئاگردانا کە دووکەڵی بۆ چوو، ئەوە ژنی جوانی بۆ ئەبێ.

١٢٣. ئەڵێن: ئافرەت کە گرێی چارۆکەکەی کرایەوە ئەوە میوانی دێت.

١٢٤. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ بەنەوخوێنی پسا، ئەوە ئیشێکی ناخۆش دێتە پێشی.

١٢٥. لەناو کوردەواریدا ناڵەشکاو ئەکەن بەسەر کۆشك و خانووی تازەوە بۆ چاوەزار.

◈◇◈

١٢٦. کورد وەکوو ناوی ڕۆژەکانی هەیە، ناوی مانگ وساڵی مێژوویشی هەیە لەگەڵ چوار وەختەدا. ئەوەندە هەیە ناوی مانگەکان لە هەر شوێنێك لە وڵاتی کوردەواری جۆرەناوێکیان هەیە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هیچ پارچەیەکی نییە لەسەر شتێك پەکی کەوتبێ؛ تەنها ماوەتەوە سەر ئەوە کە دەستی خزمەت و دەستی نووسینیان بۆ درێژ بکرێ، بۆ ئەمە لەوە زیاتر ون نەبن.

من بەپێی توانا کۆششم کرد بۆ کۆکردنەوەیان. ئەوانەی کە لە هەر جێگایەکا تەنها ئەو مانگانە ئەناسن، من هێنام بۆ ئەوە هەموو وڵاتی کوردەواری شارەزای هەموو ئەو ناوانە بین، خستمنە سەر لاپەڕەی ئەو قاقەزە بەپێی هەر چوار وەختە. وە لەناو ئەمانەدا دوانزە ناوم هەڵبژارد و کردمن بە بناغە بۆ هەر دوانزە مانگەکە. بە تەواوی بۆ هەموو کەس دەرکەون لە بەرانبەر ئەوانەوە ناوی مانگی فەرەنگی ڕۆژئاواییم دانا لەگەڵ مانگی فارسیدا و بەرانبەری کردن بە ڕۆژەکانیان. بەڵام مانگە عەرەبییەکان لەبەر ئەوە کە ئەگۆڕێن، نووسینی و بەرانبەری پێ کردنیان لەگەڵ مانگی کوردەواریدا ڕێ ناکەوێ؛ ئیتر بەوبۆنەوە ئەوان نەنووسران.

# ڕۆژ و مانگی کوردی

## ناوی ڕۆژەکانی هەفتە:

شەنبە، یەکشەنبە، دووشەنبە، سێشەنبە، چوارشەنبە، پێنجشەنبە، هەینی (جومعە).

## ئەو مانگانەی کە هەرلایەك ناوێکیان هەیە:

| ناوەکانی مانگی بەهار | ناوەکانی مانگی هاوین | ناوەکانی مانگی پاییز | ناوەکانی مانگی زستان |
|---|---|---|---|
| ١- (نەورۆز، ئاخەلێوە، خاکەلێوە، دارپشکیو، هەرمێ‌پشکیو، هەرمێ‌پشکوان) ٢- گوڵان، شەستەباران، هێلانەمە، بانەمەڕ، بەختەباران) ٣- (جۆزەردان، باران وشان، باران بڕان) | ١- (پووشکاڵ، جۆخینان، زەخیران، حەزیران، کردارەمانگ) ٢- (پووشپەڕ، تیرمە، مێوەگەنان) ٣- (تەباخ، گەلاوێژ) | ١- (گەڵاڕێزان، ئیلۆن، خەزەڵوەر) ٢- (باران پەڵە، چریەیەکەم) ٣- (بەروبەز، گردوز، کەوبەدار، چریەدووهەم) | ١- (داروەر، سەرماوەز) ٢- (ڕێبەنان چلەشور) ٣- (ڕەشەمە، مێشپەڕ) |

## ناوی ئەو مانگانەی کە هــەڵبژێردران و کران بە بناغە بۆ ناوی مانگەکان لەگەڵ بەرانبەرەکانیانا لە مانگی فەڕەنگی و فارسی:

| کۆ | ڕۆژ | کوردی | فەڕەنگی ڕۆژاوایی |
|---|---|---|---|
| بهار | ٣١ | هەرمێ پشکوان | لە ٢١ی مارت تا ٢٠ی نیسان (ماری ـ اپریل) «فروردین» فارسی، بورجی «حَمَل». |
| | ٣٠ | گوڵان | لە ٢١ی نیسان تا ٢٠ی مایس (اپریل ـ مایو) «اردیبهشت» فارسی، بورجی «ثور». |
| | ٣١ | بەختەباران | لە ٢١ی مایس تا ٢٠ی حەزیران (مایو ـ جون) «خرداد» فارسی، بورجی «جَوزا» |
| هاوین | ٣٠ | خەرمانان | لە ٢١ی حەزیران تا ٢٠ ی تەمووز (جون ـ جولای) «تیر» فارسی، بورجی «سرطان» |
| | ٣١ | میوەگەنان | لە ٢١ی تەمووز تا ٢٠ ی ئاب (جولای ـ اغسطس) «مرداد» فارسی، بورجی «اسد» |
| | ٣١ | گەلاوێژ | لە ٢١ی ئاب تا ٢٠ی ئەیلول (اغسطس ـ سبتمبر) «شهریور» فارسی، بورجی «سنبله» |
| پاییز | ٣٠ | گەڵاڕێزان | لە ٢١ی ئەیلول تا ٢٠ی تشرینی یەکەم (سبتمبر ـ اکتبر) «مهر» فارسی، بورجی «میزان» |
| | ٣١ | سەرماوەز | لە ٢١ی تشرینی یەکەم تا ٢٠ی تشرینی دووەم (اکتبر ـ نڤامبر). «آبان» فارسی، بورجی «عقرب» |
| | ٣٠ | کەوبەدار | لە ٢١ی تشرینی دووەم تا ٢٠ی کانونی یەکەم (نڤامبر ـ دیسامبر). «آذر»، فارسی، بورجی «قَوس» |
| زستان | ٣١ | ڕێبەنان | لە ٢١ی کانونی یەکەم تا ٢٠ی کانوونی دووەم (دیسامبر ـ ژانویە). «دی» فارسی، بورجی «جَدی» |
| | ٣١ | چلە | لە ٢١ی کانوونی دووەم تا ٢٠ی شوبات (ژانویە ـ فڤریە) «بهمن» فارسی، بورجی «دَلو». |
| | ٢٨ | نەورۆز مانگ | لە ٢١ی شوبات تا ٢٠ی مارت (فڤریە ـ مارس). «اسفند» فارسی، بورجی «حوت» |

ئێستە مێژووی کوردی ساڵی ٢٦٥٧ـە؛ هی فەرەنگی (ڕۆژاوایی) ١٩٥٨ـە؛ هی فارسی ١٣٣٦ـە و هی هیجری ١٣٧٧ـە.

لە یەکەم ڕۆژی مانگی هەرمێ پشکوانی ئەم ساڵەدا ـکە بەر ٢١ ی مارت ئەکەوێ ـ مێژووی کوردی ئەبێ بە ٢٦٥٨؛ هی فارسیش لەو ڕۆژەدا ئەبێ بە ١٣٣٧.

## حسابڕاگرتنی زستان:

**١٢٧.** کوردەکان لەبەر ئەوە وڵاتەکەیان کوێستان و سەرما و سۆڵەیە، لە بارەی هاتنی زستان و حساب ڕاگرتنی زستانا چەند جۆرە حسابێکیان هەیە. یەکێکیان ئەمەیە کە پێی ئەڵێن: «کەڵی‌خان» و «کڵەزەردە» و ئەو ڕۆژەی پێ نرایە ٢٦ی مانگی ڕێبەنان (١٦ی کانوونی دووەم) پێ ئەنێتە چلە. چلەی زستان لە ڕۆژی پێنجی نەورۆزمانگ (٢٥ شوبات) دوایی دێت. لەو وڵاتانەی کوردەواری کە تۆزێ گەرمیانترن هەر ئەم حسابە ئەکرێ.

حسابێکی‌تریش هەیە کە ئەمە حسابی کوێستانە سەختەکانە:

لەسەر ئەم حسابە، دوو چلە هەیە: چلەگەورە، چلەبچووك. چلەگەورە ٤٠ ڕۆژە؛ چلە بچووك ٢٠ ڕۆژە. ئەمەشیان هەرچەندە بیست ڕۆژە، بەڵام هەر پێی ئەڵێن چلە. بە هەردووکیانەوە دوو مانگ لە زستان تەواو ئەکەن.

حسابەکەی‌تریش بەم جۆرەیە: یەکەم ڕۆژی مانگی ڕێبەنان (٢١ی کانوونی یەکەم) پێ ئەنێتە چلە و ئەمەیان پێی ئەڵێن: «چلەگەورە». لە ٩ی مانگی چلە (٣٠ی کانوونی دووەم) دوایی دێت.

ئەمجا لە ڕۆژی ١٠ی مانگی چلە (٣١ی کانوونی دووەم) پێ ئەنێتە چلەکەی‌تر. لە ڕۆژی ٢٨ی مانگی چلە (١٨ی شوبات) دوایی دێت و

ئەمەیان پێی ئەڵێن: «چلەبچووك». لە شەوی پێنجی ئەم چلە بچووکەدا «کوڕی سەبا» ئەچێ بۆ کێو. لە شەوی شەشی ئەم چلەیەدا پشکۆ ئەکەوێ؛ کە پشکۆ کەوت، تینی هەوا ئەشکێ.

## چوونی کوڕی سەباش بۆ کێو بەم جۆرەیە:

**١٢٨.** کوڕی سەبا کوردێکی ڕاوچی بووە؛ ئیشی هەر دەرودەشت و ڕاوکردن بووە. لەو شەوەدا سەرلەئێوارێ ئەچێ بۆ کێو، کە ئەو دەرئەچێ دنیا ئەیگۆڕێ ئەبێ بە کڕێوە و بۆران و دووکەڵ ئەکا؛ ئەبێ بە شەوێك ئیتر لە زستانا لەو شەوە ساردتر و تووشتر نابێ.

کوڕ کە پیرێژنی دایکی کوێر ئەبێ، خەڵکی ئاواییەکە ئەچن پێی ئەڵێن: کوڕەکەت ئیمشەو ڕەق ئەبێتەوە. ئەویش هەڵئەستێ بە کوێرەکوێر لە ژوورەکەی خۆی دێتە دەرەوە. سەیرێکی هەواکە و بۆنێکی کڕێوەکە ئەکا و تۆزێ مات ئەبێ. پێی ئەڵێن: بۆچی وا مات بووی؟ ئەڵێ: «ڕاستە ئەم شەوە تووشتر شەوێکە لە زستان، بەڵام ئەگەر کوڕ کوڕی من بێ، تا بەیانی دانانیشێ و هەر هاتوچۆ ئەکا».

خەڵکەکە بە قسەکەی پێ ئەکەنن، ئەڵێن: پیرێژنە خەڵەفاوە. ئەوە تف هەڵدەی بە ئاسمانا ئەیبەستێ، تازە ئەڵێی: ئەگەر کوڕ کوڕی من بێ دانانیشێ و هاتوچۆ ئەکا!. بۆچ کڕێوە دەرفەتی ئەوە ئەدا کە کوڕە لەو شاخەدا پێ لەبەر پێ هەڵێنێ؟!

ئەو شەوە بە هەرجۆر بێ ڕۆژ ئەبێتەوە و بەیانی خەڵکی ئاوایی هەموو شاڵ و پێتاو ئەبەستن بۆ ئەوە بچن تەرمی کوڕە بێننەوە، کوتوپڕ سەیر ئەکەن وا کوڕە لەولاوە لە لاقەبرغەی شاخەکەوە کەڵەکێوی‌یەکی کردووە بەسەر دارەکەیەوە و ناویە بە نەڕەی شانیەوە و بەرەو ئاوایی بووەتەوە.

خەڵکەکە چوون بەرەو پێشەوازیەوە و پاشان لێیان پرسی: کە چۆن سەرما ڕەقی نەکردوویتەوە؟ وتی: «سەرلەئێوارە کە لە ماڵ دەرچووم و دوور کەوتمەوە، دنیا گۆڕا و بوو بە کڕێوە و تۆف؛ نە دار بە دەرەوە ما، نە ئەشکەوت ما، نە کێو و شاخ ما لەبەر بەفر و باران. وتی: پەکم کەوت؛ ویستم پەنا ئەشکەوتێك بدۆزمەوە و بچم ستاری تیا بگرم. لەگەڵ ئەوەش کە نەبوون، کوتوپڕ وەکوو دەنگێك بێتە گوێم و لە دەنگی دایکم بکات، وتی: دامەنیشە و هەر هاتوچۆ بکە. منیش ئیتر دەستم کرد بە هاتوچۆ کردن لەناو بەفر و کڕێوەکەدا تا بەیانی. بەیانی ئەم کەڵەکێوییە سەرما پەکی خستبوو، گرتم و سەرم بڕی و ئەوا هاتمەوە».

جا ئێستەش لەو کوێستانانە لە لادێ و شارەکانا، لە ژووری مزگەوتەکانا ئاگر کراوەتەوە و نێڵەنێڵی دێ. پیاوە ڕیش سپی و دنیا دیدەکان لەبەر ئاگرەکە دانیشتوون و ئەیکەن بە گاڵە، یەکێك ئەڵێ: ئیمشەو کوڕی سەبا ئەچێ بۆ کێو، یەکێك ئەڵێ: ئیمشەو نییە و سبەی شەوە، بەم جۆرە قسە لە ڕۆیشتنی کوڕی سەباوە ئەکەن بۆ کێو.

## گەلاوێژ

١٢٩. «گەلاوێژ» لە باوی کوردەکانا، ئەستێرەیەکی زۆر گەشی پڕشنگدارە لە بەینی ڕۆژهەڵات و شیمالا هەڵدێت. کە ئەم ئەستێرەیە هەڵات، گەرما ڕوو ئەکاتە کزی و بەرەبەرە فێنکی پەیدا ئەبێ و پاشان ئەچێ بەلای سەرماوە.

ئەم ئەستێرەیەش لە شەوی ١٦ی مانگی «مێوەگەنان» ـکە بەر شەوی ٦ی ئاب و ١٦ی مورداد ئەکەوێ ـ لە بورج ئەکەنرێ، کەس نایبینێ، بەڵام یەکەم گیانلەبەرێك کە لە پێشا هەستی پێ بکا ـ بە

هەستکردنێکی مەعنەوی ـ وڵاغی بەرزەیە، ئەسپ و ماین. خاوەنی مەڕومالاّت ـ ئەوانەی کە پسپۆڕن لەلایەن ئاژەڵدارییەوە ـ کە چاویان بەو وڵاغی بەرزەیە کەوت ئەزانن کە گەلاوێژ لە بورج کەنراوە.

پاش وڵاغی بەرزە، یەکەم گیاندارێك کە گەلاوێژ ببینێ مەڕەکێوییە. ئەمە لە بەری بەیانا ئەکاتە سەر کلاّوە و لووتکەی شاخەکانا و بۆ گەلاوێژ ئەگەڕێ تا بەرچاوی ئەکەوێ. مەڕەکێویش کە گەلاوێژی بەرچاو کەوت، ئەکەونە تەگە و بەران.

پاش ئەمانە بەرەبەرە گیانلەبەرەکانی‌تر ئەیبینن. ئاخر گیانلەبەر کە گەلاوێژی بەرچاو کەوێ بەرازە. بەراز خۆی لە بینینی گەلاوێژ ئەدزێتەوە، نایەوێ چاوی پێ بکەوێ؛ تا وای لێ دێت تەنانەت لە ئاخرا خۆی ئەکوتێتە شوێنە چاڵەکان و ناو گەرووی قووڵی کێوەکان؛ هەر بۆ ئەوە نەیبینێ. ئەمجا ئەگەر هات و گەلاوێژ ئەوەندە بەرز بووەوە کە ئەو لەو شوێنە چاڵەشا هەر بەرچاوی کەوت، ئەو وەختە ئەوانیش ئیتر ئەکەونە با و سواری یەك ئەبن.



# شەکراوی دەماخ

**١٣٠.** خاوەنی داستانی کوردی وای گێڕاوەتەوە و ئەڵێ: جارێك کابرایەك لەو دەشتە سەیری کرد وا شتێکی هەر زۆر زۆر زل لەو دەشتە پێیەکی لە ڕۆژهەڵات و پێیەکی لە ڕۆژئاوا و سەری لە عاسمان توند بووە. دەهۆڵێکی لە ملایە ئەوەندە زلە بە تەواوی بەری ڕۆژی گرتووە و دنیای کردووە بە تاریکستان. دوو مێرکوتی بە دەستەوەیە و دەستی بەرزەوە کردووە و سێ مرەکی لێی وەستاوەتەوە؛ چۆن وەستانەوەیەك. وەکوو دەست لەسەر دەم و ئامادەی ئەوەیە کە لە دەهۆڵەکە بدا. کابرا لێی پرسی: برا تۆ چیت و ئیشت چییە؟

وتی: «وەڵڵا برا من مەلایەکەم؛ لە سەرەتای دنیاوە لێرە وەستاوم بەم دەهۆڵەوە بۆ ئەوە کە ئەگەر مەلایەك شتێکی دا بە یەکێ، لە دەهۆڵەکە بدەم بۆ ئەوە مەلایەکەی ئاسمان و گیانلەبەری سەر زەوی هەموو تێ بگەن».

ئەویش پێی وت: «توخوا برا تا ئێستا چەند هەزار ملوێن جار لێت داوە؟» وتی: «وەڵڵا ئەگەر ئەمە لێدەم، یەك!)».

**١٣١.** کابرایەك هەبوو لەو دەشتی «قوڵەودەکە»یە فەتحوڵڵای ناو بوو؛ خەڵك پێیان ئەوت: «فەتە». کابرایەکی‌تریش هەبوو ناوی مارف بوو. ئەم دووە هەردووکیان پیاوی یەکێ لە بەگزادەکانی جاف بوون. مارف بە درێژایی ساڵ فەتەی کردبوو بە گاڵتەچی خۆی و هەر

ئەویش زیاتر بە فەتە فەتە، فەتحوڵڵای کردبوو بە فەتە.

ڕۆژێك پێکەوە دائەنیشن کوتوپڕ مارف ترپێکی ناقۆڵا ئەکەنێ، زۆر تەریق ئەبێتەوە و فەتەش نایخاتە ڕووی. ئیتر لەو وەختە بەدواوە هەر بە دەوری فەتەدا ئەهات و هەموو جار قسەی خۆشی لەگەڵ ئەکرد لەناو خەڵکا و لە هەموو لایەك هەر بە فەتحوڵڵا و فەتحوڵڵا گیان قسەی لەگەڵ ئەکرد و بانگی ئەکرد. خەڵکیش لەمە زۆر سەریان سووڕ ئەما و بە جۆرێکی وا ئەمجا ناوی فەتحوڵڵا بووبوو بە گاڵتە بۆ فەتە.

ڕۆژێك لە کۆڕێکا دائەنیشن و دیسان فەتحوڵڵا و فەتحوڵڵا بە دەوریا دێت. ئەم ماستاوەشی هەموو بۆ ئەوە ئەکرد کە فەتە باسی ترەکەی نەگێڕێتەوە. فەتە ئیتر گەیشتە تینی و وتی: «مارف، مارف! کەم فەتە بکە بە فەتحوڵڵا. بەشم لە هەر چوارمەزەو براوێ، عەمین عێلەڕووتێکت کوتا بە زەوییا، دە ئیتر واز بێرە» .

عەمین عێلەڕووت کابرایەکی چەقۆساز بوو لە تەوێڵە تەقەی چەکوشی دەنگی ئەدایەوە و ناوبانگی پەیداکردبوو.

.١٣٢ کابرایەك ئیشێکی لەگەڵ ژنێکا لێ قەومابوو، لێی ئاشکرا ببوو. بردیانە لای قازی بۆ ئەوە پرسیاری لێ بکا و بە تۆڵەی خۆی بگەیەنێ. قازی ئەو سەردەمە نووسەرێکی لە بەردەستا بوو لە کاتی موحاکەمەدا هەر پرسیار و وەڵامێك کە ئەیکرد و وەری ئەگرتەوە، نووسەرەکە ئەینووسی؛ ئێستا پێی ئەڵێن «کاتب زەبت».

جا قازی لە کابرای پرسی: دە ڕۆڵە قسە بکە بزانم چۆن ئەو ئیشەت کرد؟ هەمووی بگێڕەوە. ئەویش وتی: قوربان لای ڕان بووین، هەروا گەمەمان ئەکرد لە پاشا من دەستم کەوتە لای ڕانی ئەو. ئەویش دەستی

کەوتە خوار ناوکی من. وردە وردە پاڵمان دا بە یەکەوە. دەستمان کردە ملی یەك و ماچی یەکمان کردەوە. (ئەوا هەر شتێك ئەم ئەیڵێ قازی بە کاتب زەبت ئەڵێ: بینووسە و ئەویش سەری شۆڕ کردۆتەوە بەسەر قاقەزا و ئەینووسێ).

پاش ئەوە من دەرپێکەم داکەند و ئەویش دەرپێکەی خۆی داکەند. لە دڵا زۆر دڵم پێوە بوو، دەستم برد هەردوو قاچم بەرز کردەوە و چوومە ناو گەڵیەوە، کاوراکەی خۆمم گرت و نامە سەر دوابڕاوەکەی ئەو، خۆ...

کە قسەکەی گەیشتە ئەم شوێنە، کابرای کاتب زەبت وتی: «هە، هە، هە، سە، سە، سەبرکە جارێ ی ی ی» و بە لادا هات و خاو بووەوە و قەڵەمەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە.

**١٣٣.** «ئەحەی کرنوو» هەر لە سولەیمانی پیاوێکی قسە قوت و گاڵتەچی و نوکتەباز بوو؛ چ قسەی چ کردەوەی، هەمووی هەر نەستەق بوو؛ ناوبانگی لە هەموو لایە پەیدا کردبوو. ئەو ئیشەی کە بەناو دەستیەوە بوو شەربەت فرۆشی بوو، بەڵام لەبەر ئەوە لە باری گوزەرانا زۆر ڕێك نەبوو، هەر ئیشێکی بە دەستەوە بهاتایا هەر ئەیکرد. ئەمانەش بۆ نانی فاتە، کەچی نانی فاتە هەر دەست نەئەکەوت.

(ئەو سەردەمە سولەیمانی شوێنی ژیانێکی‌تر بووە. دنیا وەکوو ئێستە گاڵتەی بە خەڵك نەئەکرد کە بە شەو و بە ڕۆژ خەریك بن و کەچی هەر پێشی نەگەن. ئەو شارە جێگای ڕابواردن و هەوارگەی نوکتە و قسەی خۆش بوو. کە ئێوارێ داهات دیوەخانان گەرم ئەبوو، بە قسەی نەستەق و بەبێ دڵتەنگی ڕایانئەبوارد. وەیا لە چاخانەکان لە پاش نوێژی خەوتنان حەکایەت خوانەکان بە دەنگێکی جوان داستانی

ڕۆژگاری کۆنیـان ئەگێڕایـەوە و پیاوەکانیش لێیان کۆ ئەبوونەوە. لە گەڵێ شـوێنیتریـش ئەتبینـی دەستەیەکی وەکـوو دەستەگوڵ ڕێ ئەکەوتـن لـە دەرودراوسـێ و ناسـراو، هەر شـەوە لە ماڵی یەکێکیان کـۆ ئەبوونەوە؛ بە گـۆرەوی‌بازی و فنجانێن سـەرئێوارەیان ئەنووسـان بە مـەلا بانگدانی بەیانییەوە. ئەمە بوو ڕابواردنی جارانی سولەیمانی، ئیتر وەکوو ئێسـتە نە «قەبوڵ»ـە ژنان سـەری لـە پیـاو تێك دابـوو، نە وێنەی فلیمی سینەما سەری لە ژن تێك دابوو).

جـا ئێواره چەنـد کەسێك لـە دراوسـێ دووکانەکانـی ئەحەی‌کرِنـوو قسـە ئەکـەن بەیـەك کە پاش نوێژی شـێوان بچن بۆ ماڵی ئەحە و نانی ئێوارەشیان بخەن بەسەر ئەوا و بەم بۆنەوە نوکتەیەکی پێ بگێڕن.

ئێوارێ دادێ و هەموو لێ ئەدەن ئەچن: «سَلام عَلَيكُم» «سَلام عَلَيكُم» دە دوانزە کەس ئەچنە ژوورەوە. ئەو وەختە کورسـی و سـەنگەڵی نەبوو؛ کەوش دائەکنرا و دائەنیشتن. ئەمانەش هەموو پێڵاوەکانیان داکەند و چوون لەسەر بەڕە و حەسیرە شڕ دانیشتن و خاڵەئەحمەدیش بەخێرهاتنی کردن.

ئینجا وتیان: خاڵە ئەحمەد ئەوی ڕاسـتی بێ ویستمان ئەم ئێوارەیە لە ماڵی ئێوە نان بخۆین؛ جا تۆش ئیتر کەیفی خۆتە. خاڵە ئەحمەدیش «ئەسپێ لـە گیرفانیـا فەتاح‌پاشـا ئـەکا». ئەڵـێ یاخـوا بەخێـر بێن، تۆزێ سەبرم لێ بکەن ئێوە بۆ خۆتان بە قسەوە خەریك بن، من لە ماڵەوە هەر ژنەکەمـە، خۆی تەنها پیا ناگا نان دروسـت کا، ئەچم تۆزێ سـەروکاری ئەکەم و دێمەوە خزمەتتان. ئەڵێن: بڕۆ، وا ئێمە دانیشتووین.

دێتـە دەرەوە چـی کەوش و قۆنگرەی ئەوانە لـەوێ دانراوە، هەمووی کۆ ئەکاتەوە و ئەیخاتە توورەکەیەکەوە و ئەیدا بە شانیا. خێرا بە پەلەپەل ئەیبا بۆ بازاڕ. پینەچییەك هەڵینەگرتبوو، هەمووی ئەفرۆشێ بەو. پارەکەی

ئەبا و ئەیدا بە کەباب و ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. بۆیان دائەنێ و ئەڵێ: لێم ببوورن ئێوە لە ناوەختا هاتن، بەم دەمودەستە لە کەباب زیاتر جێبەجێ نەبوو. ئەوانیش گەلێ لە خۆیان ئەبوورنەوە و دەست ئەکەن بە نان و کەباب خواردن. جارجاریش سەیرێکی یەك ئەکەن کە پەنێکی چاکیان بە خاڵە ئەحمەد دا. تێروپڕ ئەخۆن و خاڵە ئەحمەد خۆی و ژنەکەشی دیارە ئەوانیش تێر ئەخۆن. پاشان بە قسەی خۆش ڕایئەبوێرن تا درەنگێك و ئیتر هەڵئەستن بۆ ڕۆیشتن.

کە ئەچنە دەرەوە کەوشەکانیان دیار نییە. ئەڵێن: خاڵە ئەحمەد کوا کەوشەکانمان؟ ئەڵێ: خواردتان. ئەڵێن: چۆن خواردمان؟ ئەڵێ: «حیزبابینەی سەگ جسنینە! بۆچ لاتان وایە من حەمە قەدوێی مووسڵ و حەماغای کۆیم بێنم بەو نیوەشەوە نان و خوان بۆ ئێوە ڕاکێشم؟ ئاخر ناڵێن ئەم سەگبابە لە کوێ بووی ئەم ڕەوەیە دروست بکا؟ کەرانباوگاوینە ئەوە دەردتان بێ، ئەو کەبابە کە قوزەڵقورتتان کرد پارەی کەوشەکانی خۆتان بوو. بە کوێرایی چاوتان خۆم و ژنەکەشم تێرمان لێ خوارد».

ئەگەڕێتەوە ژوورەوە و دەرگاکەیان لەسەر دائەخا و لێی دائەنیشێ.

ئەوانیش لە دیوی دەرەوە هەرچەند قسە ئەکەن و جنێو ئەدەن هیچ کەڵکی نابێ. گۆلەگۆل بە پێخاوس هەریەکە ئەچنەوە بۆ ماڵی خۆیان و بەیانی ئەچن کەوشەکانیان لە پینەچییەکە ئەکڕنەوە!.

**١٣٤.** کابرایەك هەبوو «خاڵەوەیسە»ی ناو بوو. ژنێکیشی هەبوو پێیان ئەوت: «پوورەخازە». دەوری گەنجییان پێکەوە ڕابواردبوو. خاڵە وەیسە ڕیشێکی تۆپی دەمەدەمی ماش و برنجی جوانی پێکەوە نابوو. لەم دەورەدا چوو ژنێکی‌تری جوانکەلەی هێنا ناوی «نازێ» بوو؛ پێیان

ئەوت «نازە».

دیارە وەکوو شەرع ئەفەرموێ: خاڵەوەیسە شەوێك لەلای خازە ئەبوو، شەوێك لەلای نازە. ئەو شەوە کە لەلای نازە ئەبوو، نازە موویەکی سپی کە لە ڕیشیا ئەبینی، لەبەر ئەوە پێی ناخۆش بوو، بە پەنجە جوانەکانی هەڵیئەکێشا. ئەو شەوەش کە لەلای خازە ئەبوو ئەویش موویەکی ڕەشی کە لە ڕیشیا ئەبینی لەبەر ئەوە سپییەکان زۆر دەرکەون و لەبەر چاوی نازە بکەوێ، ئەویش ئەوی هەڵئەکێشا.

زۆری پێنەچوو خاڵە وەیسە وەکوو مریشکی ئاوەڕووتکراوی لێ هات، موو بە ڕوومەتیەوە نەما. جا لێیان ئەپرسی: خاڵە وەیسە ئەوە ڕیشەکەت چی لێ هات؟ ئەویش ئەیوت:

**نیوەی کەوتە دەست خازە نیوەشی چووە لای نازە**
**خۆیشم کەوتمە جامبازە**

کەواتە ئەگەر یەکێ بیەوێ هەموو ڕۆژێ دەست بە ڕیشیا بێنیت و نەکەوێتە جامبازە هەر بە فاتیلەی خۆیەوە داکەوێ باشترە. خۆ ئەگەر دەست بە ڕیشا هێنانیشی ناوێ هەموو ڕۆژێ پێش نوێژی شێوان بە گوێزانێکی تیژ ڕیشەکەی بتاشێ با هەر بە مردنی خۆی بمرێ، نەوەك بە ژانی هەڵکێشانەوە. ئەو وەختە بۆ جامبازەکەش ئەگەر سیانیش بێ قەیناکا، «گۆم هەتا قووڵتر بێ مەلەی خۆشترە».

**.١٣٥** مەلایەك هەبوو لەو موکریانە مەلائەوڕەحمانی ناو بوو. ڕۆژێك پیاوێك ئەچێتە خزمەتی و ئەڵێ: «ئەگەر یەکێ بەرەلەپی بکەوێتە سەر شەرمی کچێکی بەر مەمکە، دەستنوێژی ئەشکێ؟» ئەویش ئەفەرمووی: «کتێب ئەفەرموێ: ئێستە دەستنوێژی ناشکێ،

بەڵام کە هات و ئەو کچە گەورە بوو، گەیشتە وەختی باڵقبوون، ئەم ئەبێ ئەو دەستنوێژانەی ئەو وەختەی بشواتەوە!».

**١٣٦.** مەلا تۆفیق حاجی برایم لە سولەیمانی گێڕایەوە و وتی: کابرایەك لە دێـی «ئاوکورتـێ» هەبوو ویستی ژن بێنـێ. هەرچۆنێ بوو ئافرەتێکیان بۆ دۆزییەوە و هێنای. شەوێ کە چووە لای بۆ ئەوەی ببێ بە زاوا، ڕوانی ئافرەت دانەچیرەیەتی و ژان ئەیگرێ. کابرا تووڕە بوو، مووی سمێڵی ڕاست بووەوە و ویستی ژنە بکوژێ. ئافرەت کە بەمەی زانی پێی وت: پیاوەکە ئەمە کاری خوایە؛ تۆیش نابێ لە کاری خوا لاریت بێت. ڕاوەستە با منالەکەمان ببێ.

لە پاش ئەوە کە خوا کوڕێکی دا، شەوێ کە دەوریان چۆڵ بوو، پیاوەی دانا و بۆی باس کرد وتی: «پیاوەکە! لە بیرتە ئەو ساڵە کە شێخ تەشریفی هات ـ ڕۆحم بە ساقەی بێ! ـ فەرمووی: نابێ کەس دەس لە کاری خوا بدا؟ وە هەرچی بە چاو نەیبینن باوەڕی پێ مەکەن؟». بەم قسانە کابرای سارد کردەوە و جوان گوێی بۆ شل کردبوو؛ ئەمجا ئەم بەندانەی بە سەرا هەڵ دا:

شام و شیراز و شیتر　　کارد و گیلاخە و کەنگر
مانگێکیان ناوت بردم　　دوومانگیش ئاموشۆت کردم
دوو مانگ و نیو دەستگیران　　دوو مانگ و نیو خەنەبەننان
نۆ ڕۆژیش زەماوەندت بۆ کردم، ئەمە نۆ مانگ و نۆ ڕۆژەکە.

تو خوا پیاوەکە بەس نەبوو شەیتان ئەو تاوانەی پێ نەکردی و خۆم و منالەکە بکوژی. کە ئەمەی وت، کابرا هەڵسا و پەلاماری دەستی ژنەی دا و ماچی کرد و وتی: «بەخودای ژنی زیرەك و عاقڵ بە کەڵکە. ئافەرین ژنەکە بۆ تۆ، کە منت لەم تاوانە گێڕایەوە».

١٣٧. لەو بناری شارەزوورە پیرێژنێك هەبوو «پوورەئامان»ـی ناو بوو. بە پارە زۆری ناوبانگی دەرکردبوو. چەند دزێك کەوتنە سەر ئەوە ویستیان بچن پارەکەی لێ بدزن. شەوێك ئەچنە سەری و دەورەی ماڵەکەی ئەدەن؛ پوورە ئامان هەست ئەکا و خەوی لێ ناکەوێ. دزەکان بە دەوری خانووەکەدا بڵاو بوونەتەوە. بۆ ئەوە یەکتری ئاگادار کەن دەست ئەکەن بە فیکەفیك. پوورە ئامانیش فیکەیەکی کرد بەناو فیکەکانا و وەکوو ئەوان دەستی پێ کرد. یەکێك لە دزەکان لێی هەستایە سەر پێ وتی:

**پوورە ئامانێ، پوورە ئامانێ فیکە فیکتە کێرت کوانێ؟**

پوورامانیش وتی:

**مـن فیکە ئەکەم تا دز بترسـێ دز لە کێری من بۆچی ئەپرسێ؟**

دزەکان ئیتر بە شپرزەیی گەڕانەوە.

١٣٨. مەلایەك هەبوو «مەلا عەبەنووس»ـی ناو بوو. تازە خوێندنی تەواو کردبوو، لە گوندێکی ئەو سەرشیوە دڵخۆشیان کردبوو کە ببێ بە مەلایان و قسەشیان دابوویە کە ژنیشی بۆ بێنن. لە پاش ماوەیەك کچێکی گەلحۆی خاڵە پیرۆت هەبوو لە گوندەکەیان، کەسی پێ قایەل نەئەبوو، لەویان مارە کرد.

زۆری پێنەچوو مەلاکە سەیری ئەکرد تووکەبەری ژنە ـ بلامانێ ـ ئەڵێی کۆرپە دەوەنە. هەموو جار کە بەیانی ئەچوو بۆ مزگەوت ئەیوت بە ژنە: ئەو بەردەرگا و حەوشە داماڵی. ئەویش لە مەبەسەکەی تێنەئەگەیشت، ئەچوو جوان و پوخت بەردەرگا و حەوشەکەی ئەماڵی. مەلاکە ئەهاتەوە و ئەیویست گەمەوگاڵتەیەك بکا، سەیری ئەکرد هەزار خوزگە بە نەشتەر! وای لێ هات ئیتر نەیوێرا جارێکیکە بچێتە لای.

ئافرەت، کە بینی وا مەلا بە تەواوی لێی لووتەلایە، پیرێژنێکی کۆنە ساڵی دراوسێیان هەبوو، چوو باسەکەی سەراپا بۆ گێڕایەوە. پیرێژن کە ئەم باسەی بیست کێشای بە ڕانی خۆیا و وتی: ئای گڵە کوێر بی! من لە تافی گەنجیما دەرزی هەزاری وەکوو تۆم دائەدا، کەچی تۆ چاری شتێکی ئاوات پێ ناکرێ؟

داپیرە کەری خۆی بەردەست کەوتبوو. لەبەر ئەوە خۆی لە گەمە و گاڵتەی پێش نیوەشەوان بێبەش بوو، ویستی ئەوەندەی‌تر ئافرەتەکە کەر کات. پێی وت: ڕۆڵە نازاری دەوری دۆڵە! کە چوویتەوە ماڵەوە بە ئاگری قوتیلەکە دوابڕاوەکە هەڵکرووزێنەوە. ئیتر بێ تووك و لووس بیخەرە بەردەس مەلا عەبەنووس. ئافرەتی ساویلکە چووەوە بۆ ماڵەوە قوتیلە چرای نا بە ناولنگی خۆیەوە. داخەکەم خەپلەکەی سووتا و بوو بە کوڵە.

شەوێ مەلا ئارەزووی هەڵسا، ویستی بچێتە لای، ژنە نەیهێشت. بەم جۆرە دوو سێ شەو هەر ڕێی نەدایە، مەلا ئارامی بڕا و ویستی بە زۆر ئیشی خێر جێبەجێ بکا. ئافرەتی خست و دەرپێی داکەند. تەماشای کرد دەوروپشتی دوابڕاوەکەی زیچکاو زلزلەی تیا ئەکا. کە ئەمەی چاوپێ‌کەوت دڵی تێ کچوو، کەوتە قلْپ و قوپی ڕشانەوە. لە ماڵ دەرپەڕی و هەر بەو شەوە ئەو ئاواییەی بەجێ‌هێشت و حەو قۆناغ لەوێ دوور کەوتەوە و بوو بە مەلای گوندێکی‌تر.

لە پاش ماوەی ساڵێك کە ئاسکۆڵی ناولنگ کولۆڵ بە تەواوی چاك بووەوە، ئەم نامەیە بۆ مەلا نووسی:

**گیانی شیرینم مەلا عەبەنووس**

**بەر دەرگای ماڵت لێ مەبە مایووس**

**وەك بەری هەسان سافە و لووس و پووس**

مەلا عەبەنووسیش بەم جۆرە وەڵامی بۆ نووسییەوە:

**تاقە کچەکەی خاڵە پیرۆتێ**

**هەرچەن شەوەکەی پارم وە بیر تێ**

**جەرگ و هەناوم لە بەریەك دەرتێ**

ئیتر ببڕای ببڕای مەلا جارێکیتر نەچووەوە لای.

.١٣٩ لە گوندێکی ئەو بناری هەورامانە کوڕ و کچێك دڵخوازی یەکتر ئەبن. بەڵێن بە یەك ئەدەن کە شەو لەو دیوی تەیمایی حەوشەکەوە یەکتر ببینن. دنیاش قەوشی پاییز ئەبێ، شەوێ لە کاتی خۆیا کوڕە دێت. بەڵام کچەکە لەبەر ئەوە میوانیان ئەبێ بۆی ڕێ ناکەوێ بچێت. هەرچۆن ئەبێ خۆی ئەگەیەنێتە هەیوان. کوڕەکە لە دوورەوە ئەیبینێ ئەم هەڵبەستەی بە سەرا هەڵئەدا:

**باڵا بەرزەکەی مووروو لە گەردن    سەرما کوشتمی بێرە گوو کردن**

کچەش لە وەڵاما ئەڵێ:

**سەرما نەیکوشتی چاوت دەربایە    بڕۆیانەی خۆت ئێستە گووم نایە**

.١٤٠ پیاوێك هەبوو لە سولەیمانی «خاڵەمەحموو»ی ناو بوو؛ ئێجگار تووڕە و کەللەشەق بوو؛ زۆریش پیر بووبوو، لەبەر پیری چاوی کز و گوێی گران بووبوو.

ئێوارەیەك لەسەر سەکۆکەی مزگەوتی سەیدحەسەن لە سابوونکەران خەڵکەکە کۆبوونەوە بۆ نوێژی شێوان و دەمەدەمی بانگ بوو. خاڵەمەحموویش لەوێ بوو، دانیشتبوو؛ بەڵام ڕیزی سەفەکەی تێك دابوو. بانگ وترا و قامەت کرا و ئیمام چووە میحرابەوە و خەڵکەکە هەموو وەستابوون، دەستیان بەرز کردبووەوە دوعای پێش نوێژەکەیان

ئەخوێنـد. خاڵەمەحموو ئـاگای لەمانە هیچ نەبوو. پیاوێك شـانی گرت پێـی وت: خاڵەمەحمـوو ئـەوا نوێـژە، تـۆزی خـۆت ڕێك خـە، با ڕیـزی سەفەکە تێك نەچێ.

هەر کابرا ئەمەی وت خاڵەمەحموو تووڕە بوو دەستی کرد بە قسەکردن و وتـی: «ئـای! تـۆ چیـت داوە بەسـەر منـەوە؟ لێرەش وازم لـێ نایەنـن، ئەمە دەردی کابرایەتی کە ژنەکەی دۆستێکی هەبوو لە بن دارهەرمێکە خەریکی گەمەوگاڵتە بوون و سەریان لە کابرای مێردی ژنە تێك دابوو. ئاخر بابە، تۆ چیت داوە بەسەر منەوە؟»

ئەوا بە دەنگی بەرز ئەم قسانە ئەکا و لەو کاتەدا مەلا لە دوعا بووەوە و نیەتی دابەست و بە دەنگی بەرز وتی: «الله اکبر». خەڵکەکەش هەموو نیەتیان دابەست و مەلا کەوتە خوێندنی سوورەی «الحمد».

خاڵەمەحموویش هەر لە شوێنەکەی خۆی دانیشتبووە و گەرم بووە و ئاگای لە ئیمام نییە کە نوێژی دابەستووە هەر ئەڵێ: ئاخر باوکم تۆ چیت داوە بەسـەر منەوە؟ بەخوا سـەیرە ئەمە دەردی کابرایەتی ئەیەوێ سەرم لێ تێك بدا، جا وەرە لە داخا مەمرە. ئەمە ڕاست دەردی کابرایەتی ئەڵێ:

«کابرایـەك ژنێکـی هەبـوو، ژنەکـەی لەگـەڵ کابرایەکیتـرا دەستیان تیکەڵاو کردبوو، هەموو جار پێکەوە گەمەوگاڵتەیان ئەکرد. ڕۆژێك دۆستی ژنەکـە بـە ژنەکەی وت: ئەگەر جارێك لە بەرچاوی مێردەکەت پێکەوە دروست نەبین من بڕوا بە دۆستایەتی و خۆشەویستی تۆ ناکەم.

ژنـەش وتـی: باشـە ئەمـە شـتێکی ئاسـانە. سبەینێ تـۆ بچـۆرە بـن دارهەرمێکـەی خـوار ئاواییەوە، منیش لەگەڵ مێردەکەما دێین بۆ ئەوێ جا لەوێ ئیشی خۆمان ئەکەین».

ئەوا مـەلا خەریـکی «الحمـد»ە و خاڵەمەحموویش خەریـکی ئەم

قسانەیە. خەڵکەکەش لەبەر پڕموهۆڕی پێکەنین هەندێکیان نوێژیان بڕیوە و هەندێکشیان هەر خۆیان گرتووە. مەلا گەیشتە «ولا الضّالین»، مەئموومێ بە جارێ وتیان: «ئامین»! لەم کاتەدا خاڵەمەحموو وتی: «بەیانی ژنە بە مێردەکەی وت: پیاوەکە با بچێن بۆ بن دارهەرمێکە سەیرانێکیش ئەکەین و هەندێ هەرمێش دێنینەوە. پیاوە وتی: باشە و لێیان دا ڕۆیشتن. کە گەیشتنە بن دارهەرمێکە لە پاش تۆزێك ژنە وتی: پیاوەکە من ئەچمە سەردارەکە، هەرمێکە ئەتەکێنم و تۆش کۆی کەوە.

ئەمەی وت و چووە سەر دارەکە و دەستی کرد بە هەرمێ تەکانن؛ پیاوەش کۆی ئەکردەوە. کوتوپڕ ژنەکە قیژانی وتی: ئەیڕۆ پیاوەکە! ئەوە کێیە سوارت بووە؟ پیاوەکە وتی: ئەوە شێت بوویت؟ سواربوونی چی؟ ژنە وتی: ئای، ئای پیاوەکە خۆ ئەوە خستتی و هەر بە تەواوی سوارت بوو؛ ئەیەڕۆ پیاو چۆن پیاو سواری ئەبن؟ پیاوە لە خوارەوە وتی: «کچێ، ئافرەت ئەوە تۆ ئەقڵت لەسەر خۆتە؟ ئەوە ئەڵێی چی؟» ژنە قیژاندی و کەوتە خۆی و پەلەپەل وا خەریکە دێتە خوارەوە و دەستی کرد بە جنێودان وتی: کوڕە سەگی سەگباب! چە ڕایەت ئەکەوێ تۆ سوار مێردی من ئەبی؟ کورە پیاوەکە بۆ خاتری خوا خۆ ئەوە لنگی گرتی بە شانەوە، تۆ پیاوێکی زرت و زەلامی عەیب ناکەی وەکوو ژن لە ژێر ئەو زرتەبۆزە سەگبابەدا کەوتووی؟!. پیاوەی مێردی هەروا دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو و وتی: کچێ خوا بتگرێ ئەمە قسەیە ئەیکەی؟! پیاوی چی، لنگ بە شانەوەگرتنی چی؟ تۆزێ ئەقڵت بێنەوە سەر خۆت و زمانی خۆت بگرە. ژنە بە پەلەپەل ڕایکردە خوارەوە زەلامی سەر مێردەکەی بگرێ».

لەم کاتەدا مەلا سوورەی «قل هو الله»یشی تەواو کرد و چوو بە ڕوکووعا وتی: «الله اکبر». خاڵەمەحموو وتی: «ژنە هاتە خوارەوە و هیچی

بەرچاو نەکەوت. وتی: ئەیەڕۆ چی بوو من چاوم پێ‌کەوت؟» ئا توخوا پیاوەکە بۆ من هیچ کەڵکی نییە؛ تۆ بچۆرە سەر دارەکە هەرمێکە بتەکێنە و من کۆی ئەکەمەوە.

مێردە چووە سەر دار و دەستی کرد بە هەرمێ تەکانن، لەملاوە دۆستی ژنەکە لە پەنا بەردێکا خۆی حەشار دابوو، هاتە دەرەوە و هات بەلای ژنەکەوە و دەستی کردە ملی و ماچێکی کردەوە. پیاوی مێردی لەسەر دارەکەوە وتی: ئای ژنەکە ئەو زەلامە کێیە وا دەستی کردە ملت و ماچی کردیەوە؟ ژنە وتی: ئەیەڕۆ پیاوەکە ئەوە ئەڵێی چی؟ زەلامی چی و ماچی چی؟ ئاخر منیش وام ئەوت تۆ بڕوات نەئەکرد. ئەمە هەرمێ و دارە و خێوی لێ دیارە.

زۆری پێ‌نەچوو خێرا کابرا سواری ژنەکە بوو. کابرای مێردی لە سەرەوە ئاگری تێ بەر بوو هاواری کرد: ئەرێ سەگی سەگباب! ئەوە چە ڕایەت ئەکەوێ سواری ژنی من ئەبی؟ ژنەش هەر ئەڵێ: پیاوەکە شوورەییە قسەی وا مەکە پیاوی چی و سواربوونی چی؟!»

لەم کاتەدا ئیمام ڕکاتی یەکەم و دووەمی تەواو کردبوو چووبوو بە ڕوکووعا و سەری بەرز کردەوە و وتی: «سَمِعَ اللّٰهُ لِمَن حَمِدَهُ». خەڵکیش ئەوی لە نوێژا ماون، ماون و ئەوی نوێژی بڕیوە یەکێ کردوویە بە کەوشەکانیا و بۆی دەرچووە و یەکێ لەبەر پێکەنین ئاگای لە خۆی نەماوە، مەلاش لێی بووە بە کوردە ناموسی ناتوانێ نوێژەکەی ببڕێ، بەڵام لەبەر قوڵپی پێکەنین ئەویش نازانێ چی ئەڵێ و هۆشی بەلای نوێژەوە نەماوە و لەبەر دەنگی خاڵەمەحموو گوێی لە دەنگی خۆی نییە. خاڵەمەحموو وتی: «پیاوە بە پەلەپەل دەستی کرد بە هاتنە خوارەوە لەسەر دارەکە. ئەو لە نیوەی دارەکەدا بوو لەملاوە هەتیوەی دۆستی ژنە،

لنگی گرت بە شانەوە و تێی بەر بوو. مێردە لەو سەرەوە ئاگری تێ بەر بوو، وتی: ژنەکە خوا بتگرێ خۆ ئەوە لنگی گرتی بە شانەوە و خراپی کردی. کورە کابرا سەگی سەگباب نەکەی، ها نەکەی، کورە نەکەی. ژنەش لە ژێرەوە هەر ئەڵێ: پیاوەکە ئەم قسانە چییە تۆ ئەیکەی؟ زەلامی چی و پیاوی چی؟ ئاخر کە منیش لەسەر دارەکە بووم، ئەوەبوو هاوارم ئەکرد و تۆ ئەتوت هیچ نییە؛ ئێستەش ئەمەی من وەکوو هینەکەی تۆ وایە.

کابرای مێردە هاتە خوارەوە، تا ئەو هاتە خوارەوە هەتیوە لە ئیشی خۆی بووەوە و هەڕای کرد و ژنە هەستایەوە. پیاوەش بە خەنجەری ڕووتەوە هەڕای کرد بەشوێن هەتیوەدا. ژنە تونگ مێردەکەی خۆی گرت و وتی: پیاوەکە ئەوە تۆ شێت بوویت وا کەوتوویتە جامبازە و قسە کردن لەم دەشتەدا. پیاوەش خۆی ڕائەپسکێنێ و ئەڵێ: کچێ قەحبە، بەرەڵام کە ئەوا کابرا دەرباز بوو. ژنەش هەر ئەڵێ: «"بسم‌الله، بسم‌الله"، ئەیەڕۆ پیاوەکە ئەوە شێت بوویت؟

تا کابرا خۆی لە دەستی ژنە ڕاپسکان هەتیوە دەرچوو خۆی ون کرد. ئەمجا دەستی کرد بە سەرزەنشت کردنی ژنەکەی. ژنەش ئەیوت: ئاخر پیاوەکە منیش لەسەر دارەکە هەر ئەوەبوو کە بەرچاوم ئەکەوت و کەچی تۆش ئەتوت: هیچ نییە و منت بە شێت دەرئەکرد. ئەو وەختە کە من لەسەر دارەکە هاوارم ئەکرد، تۆ هیچت ئەدی؟ پیاوەش وتی: نە، هیچ نەبوو. وتی: کەواتە هینەکەی تۆش هەر وا بووە. هیچ نییە و غایەلە مەکە. ئەمە هەرمێ دارە و خێوی لێ دیارە».

خاڵەمەحموو وتی: ئێستە ئەم کابرایەش ئەیەوێ دەردی ئەو کابرایە بەسەر من دەرێنێ؛ ئاخر یەکێ نییە لێی بپرسێ ئەرێ بابە تۆ چیت داوە بەسەر منەوە؟ چاك دائەنیشم، خراپ دائەنیشم بە تۆ چی؟ چاك دانیشە،

چاك دانیشە بۆچ سەرم لێ تێك ئەدەی دەردی ئەو کابرایە. لەم کاتەدا مەلا لە تەحیات بووەوە و وتی: «السّلام علیکم».

خاڵەمەحموو سەعاتەکەی دەرهێنا و نای بەسەر لووتیەوە و وتی: «خۆ ئەوە بانگ درەنگە. وەهابی مجەوری سەگباب لە کوێیە بانگ بفەرموێ». خەڵکەکەش بە مەلا و نوێژکەرەوە بە دەم پێکەنینەوە هەریەکە بە لایەکا هەڵاتن.

١٤١. کابرایەك هەبوو «حەمەسەن»ـی ناو بوو. لەگەڵ هاوڕێیەکیا ئەچن بۆ شار و ئەچنە سەر دووکانی کابرایەکی کەوشدوور؛ جووتێ کەوشی لێ بکڕن. کابرا کەوشەکەیان بۆ دێنێ و لە پاش چەندوچوونێکی زۆر بە دە قڕان ڕێ ئەکەون.

حەمەسەن ئەڵێ: «برا بۆ خاتری خوا تۆزێ خاترمان بگرە». کابرای کەوشدووریش ئەڵێ: بەخوا برا خاترانەی تیا نەماوە و لەوە زیاتر ناتوانم خاترتان بگرم. حەمەسەن تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: «دەسا بکەم وە قنگ دایك ئەو کەسەوە کەوش لە تۆ ئەسێنێ. کاورا تۆ پیاگ ناناسی». ئەکا بە پەلی هاوڕێکەیا و ئەڕۆن.

دراوسێ دووکانێکی کابرای کەوشدوور ئەبێ لەوبەرەوە، ئەچنە ئەوێ؛ ئەو کابراش ئاگای لە کەینوبەینی ئەمان بووە. هەر ئەمان ئەچنە ئەوێ ئەو خێرا لە سەر دووکانەکەی ڕاست ئەبێتەوە و ئەڵێ: فەرموو دانیشن چی ئەفەرموون وا لە بەردەستتانایە. حەمەسەن ئەڵێ: «بەخوا برا جووتێ کەوشمان گەرەکە، وەلێ گەرەکمە تۆ کەوشێکی فرە خاسمان بۆ بێری و خاتریشمان بگریت». ئەویش ئەڵێ: پیاوی وەکوو ئێوە، یەکێ پیاو بێ چۆن خاتری ناگرێ؟! هەر پەلامار ئەدا جووتێ کەوشی پێسی لە پێستی بزن دروستکراویان بۆ دێنێ و بە پەرۆیەك پاکی ئەکاتەوە و ئەیداتە

دەستیان. حەمەسەن ئەڵێ: توخوا براکە تۆ ئەو شێخ کەریمە ئەمە کەوشێکی خاسە؟ کابرای کەوشدوور لە دەستی وەرئەگرێ و بە بۆنەی پاك کردنەوە ئەیهێنێ بە لاڕانی خۆیا و ئەڵێ: «بەو شێخ کەریمەو بە سەری تۆ ـ سەری تۆ زۆر عەزیزە لەلام ـ کەفەڵە کەفەڵە». کابرا ئەڵێ: «برا ئیتر هیچ مەیێژە دڵم بوو وە ئاوێنە».

ئینجا دێنە سەر نرخەکەی. کابرای کەوشدوور لە پێشا دێنێ تۆزێ چەرم بە سەرەگازنێك لە پارچە چەرمێك ئەکاتەوە و ئەڵێ: «جارێ ئەمە خاترانەکەیە؛ ئەمە هەڵگرە هەروەخت کەوشەکە دڕا پێی پینە بکە». پاش ئەوە کەوشەکەشی ئەداتێ بە دوانزە قڕان و پێی ئەڵێ: برا گلەیی نەکەی نەڵێی خاتری نەگرتم.

کابرا کەوش ئەداتە بن دەستی و تۆزە چەرمەکەش ئەخاتە باخەڵی و ئەڵێ: «برا وا مەیژە؛ بۆچ گشت باوەحیزێ هاوماڵی ئەو دەویت باوکەی ئەوبەرتە کە پیاگ نەناسێ؟ ئەو باوەحیزە ئەگەر تۆزێ چەرمی وە خاترانە پێ بداینایە وای ئەزانی لە پێستی گونی ئەکەنەوە. ئەی بکەم وە قنگ دایکتەوە. برا، گجارێ ئیتر تینەوە سەر دووکانەکەی تۆ». ئەمە ئەڵێ و لێ ئەدەن ئەڕۆن.

١٤٢. کابرایەك لەناو بازاڕدا تووتەڵەسەگێك و دێڵەسەگێکی لە بەردەم خۆیا دانابوو ئەیفرۆشتن. کابرایەکی‌تر چوو لێی بکڕێ، کابرای خاوەن سەگ وتی: تووتەڵەکە بە چوار قڕان و دێڵەکە بە دوو قڕان. کابرای کڕیار وتی: چۆن ئەبێ گەورەکە بە دوو قڕان و کەچی پچووکەکە بە چوار قڕان؟ کابرای خاوەن سەگ وتی: «ئاخر باوکم ئەوەیان هەر سەگە، بەڵام ئەمەیان سەگی کوڕی سەگە».

**١٤٣.** مەلایەك وەعزی ئەدا ئەیوت: هەرکەس ئەگەر بێت و دزی بکا لە ڕۆژی قیامەتا خوا تۆڵەی لێ ئەکاتەوە. کابرایەك دانیشتبوو گوێی لە وەعزەکە ئەگرت وتی: مامۆستا خوا تۆڵەی چی لە پیاو ئەکاتەوە؟ من ئەگەر دزییێکم کرد ناچمە ژێری تا تۆڵەم لێ بکاتەوە؛ خۆ بە زۆریش نایسەپێنێ بە سەرما. مامۆستا وتی: وا نییە باوکم. خوا خۆی پێ‌ئەزانێ و شایەتیش شایەتیت لەسەر ئەدا و ئەو وەختە حوکم ئەدا بە سەرتا.

کابرا وتی: دەسا من ئێستە بەخوا مامۆستا بزنێکم دزیوە و خواردم و کەسیش نەیزانیوە، ئیتر ئەم شایەتە لە کوێ دێت و شایەتیم لەسەر ئەدا؟ دیارە خۆیشم نایڵێم. ئەوا وەکوو ئاوی پار ڕۆیشت و بڕایەوە، ئیتر تۆڵە سەندنەوەی چی؟

مامۆستا وتی: خوا دەست و قاچ و زمانی خۆت لەسەر خۆت ئەکا بە شایەت و ئەمانە دێنە قسەکردن و شایەتیت لەسەر ئەدەن. کابرا وتی: «مامۆستا جا منیش ئەڵێم: شایەتی ئەمانەم قەبووڵ نییە. ئەڵێم: ئەمانە هەموو لە دنیادا عەزیەتم داون، ئێستە ڕقیانە لێم و بۆیە شایەتیم لەسەر ئەدەن!».

مامۆستا وتی: «کە تۆ وات وت خوا بزنەکە زیندوو ئەکاتەوە و ئەیهێنێتە بەردەست و ئەیهێنێتە قسە و بزنەکە شایەتیت لەسەر ئەدا ئەڵێ: من بزنی فڵانکەس بووم و ئەم پیاوە دزیمی». کابراش وتی: مامۆستا کە بزنەکەیان هێنایە بەر دەستم ئەنەوم لە ڕیشی و ئەیدەمەوە دەست خاوەنەکەی و ئەڵێم: ها برا ئەوە خۆت و بزنەکەت. مامۆستا ئیتر وەستا و هیچ قسەی پێ نەکرا.

١٤٤. کابرایەکی «بێسەر»ی شەوێ دز ئەچێتە سەری و شتومەکێکی زۆری ئەبا. بەیانی ئەچێتە لای «شێخ عەولسەمەدی مەولاناوا» کە بە کەرامەت بۆی بدۆزێتەوە. ئەویش پێی ئەڵێ: باوکم کەرامەتی ناوێ، سەگێك ڕاگرە و ئیتر ماڵت نادزرێ. کابراش ئەڵێ: «یا شێخ! سەگێکمان هەس لە ماڵا، سەگ نییە! وەو قورعانەی تۆ لێت خوێندگە باوکی تۆ لە قەورەکە دوێشەو دەمی ناگە وە یەکا ئەو سپلۆتە دەمی نەنیاگە وە یەکا؛ کەچی ئەو دزە سەگباوکەش دەسی خۆی هەر وەشان».

١٤٥. شێخ محەمەدئەمینی میرانی لە خانەقا بۆی گێڕامەوە وتی: لە قوتابخانە دەرزم بە منالەکان ئەوت، لە دەرزەکەدا ئەوە هاتە پێشەوە کە مریشك چی ئەخوا. منالێك وتی: گەنم ئەخوا؛ یەکێکی‌تر وتی: جۆ؛ یەکێکی‌تر وتی: هەرزن و هەریەکە شتێکی وت. وتی: سەیرم کرد لە ئاخری هەموویانا یەکێکی‌تر پەنجەی هەڵبری. وتم: بڵێ بزانم تۆ ئەڵێی چی؟ وتی: «ئەفەنی گوویش ئەخوا».

١٤٦. شێخ سەعیدی حاجی شێخ‌عەلی لە سولەیمانی چەند قسەیەکی بۆ گێڕامەوە وتی: سێ چوار کابرای ئەو شارەزوورە هاتبوونە سولەیمانی بۆ شتومەك کڕین. ڕێیان کەوتبووە دووکانی حاجییەك، وا دیاربوو قۆڵی بڕیبوون. چووبوون لە بن دیواری مزگەوتەکەی ناو بازاڕا دانیشتبوون. لە داخا وەکوو گەلای دار جنێویان ئەدا. یەکێکیان وتی: «توخوا برا واز بێرن تازە گاڵەگاڵی چیتانە؟ ڕیامە ڕیش باوك دووسەدوپەنجا چارەك حاجییا». حاجی ئەولای‌حەمەخەیات هەبوو، لەو کاتەدا بە لایانا تێپەڕی و گوێی لە قسەکەیان بوو وتی: «توخوا براگیان بیست‌ودوو چارەکی منی لێ دەر بکە».

کابرا ئەڵێ: بەخوا مامە حاجی، لەگەڵ تۆم نەبوو. ئەڵێ: «برا تۆ بیست‌ودوو چارەکەکەی منی لێ دەر بکە، ئیتر هەقم نییە بەسەر ئەوانی ترەوە».

١٤٧. فەقێیەك ئەیەوێ لە پشت مامۆستاکەیەوە نوێژ دابەستێ، مامۆستا وەسواس بوو نیەتی بۆ نەهات ئەیوت: «نیەتمە سێ ڕکات نوێـژی ئـەم شێوانە ئەکەم بۆ خوا». کە ئەهات بڵێ: «اللّٰه اکبر» ئەسڵەمییەوە و بۆی نەئەهات. لای ئەکردەوە بەمشان و بەوشانی خۆیا و ئەیوت: «**تف تف تف! أعوذ باللّٰه من الشّیطان الرّجیم**». فەقێ بە جارێ وەڕەز بوو وتی: «مامۆستا تف لە خۆت! بەخوا خەتای شەیتان نییە، خەتای خۆتە، تۆ کە نوێژت ڕەوان نییە پێشنوێژی بۆ ئەکەی؟!».

١٤٨. کوڕێکی هەرزەکاری تامەزرۆ ژن دێنێ، چەند شەوێکی پێ ئەچێ ڕوو ئەکاتە ژنەکەی و ئەڵێ: «تۆ ئەزانی لەبەر چی باوکم ئەوەندە دایکمی خۆش ئەوێ؟» ئەڵێ: نە. ئەمجا دەست ئەخاتە سەر وانێکی ژنەکەی و ئەڵێ: «لەبەر ئەوە ئەم شتە خۆشەی پێوەیە».

١٤٩. شێخ بابەعەلی لە سولەیمانی لەسەر سەکۆی مزگەوتەکەی خۆی دانیشتبوو، ئەبینێ کابرایەك لە ئاودەستخانەکان زرموکوت هەر لەقە ئەماڵێ بە ئەرزەکەدا. ئەویش ئەچێ لێی ئەپرسێ ئەڵێ: برام ئەم تەپەتەپەت لە چییە؟ ئەڵێ: قوربان چی‌بکەم، پاشمیزم هەیە. ئەڵێ: «دەسا برا بەخوا تۆ ئاوا بکەی و ئەمە خووت بێ، پاشگوویشت ئەبێ!».

١٥٠. کابرایەك لەو شارەزوورە کوڕێکی خزمی ئەبێ، دەمێ بوو چاوی پێ نەکەوتبوو. بە سەردان ئەچێتەماڵیان. سەیر ئەکا

حەوت ژن لە ماڵەکەدا دانیشتبوون؛ ئەمانەی جاران هەر نەدیبوو. ئەپرسێ ئەڵێ: برام ئەم حەوتە چیتن؟ ئەڵێ: «هەر حەوتیان یێژن ژنمن». ئەڵێ: ئینجا چۆن بەخێویان ئەکەی؟ ئەڵێ: «برا، ئەگەر کراسیان بۆ بسێنم حەوت، کەوایان بۆ بکەم حەوت، کەوشیان بۆ بێرم حەوت؛ گشتی حەوت. بەم جۆرە لەگەڵیان ئەچم وەڕێوە».

ئەڵێ: «توخوا برا لە شەرعا شەرمی بۆ نییە، ئەی ئیشی شەرعییان چۆن لەگەڵا ئەکەیت؟» ئەویش ئەڵێ: «برا ئەمە لە گشتیان بێ‌قرەترە. لە شار شتێکیان داهاوردگە پێی یێژن قۆپیە؛ هەر حەوتیان ڕیز ئەکەم و دانەیە لەو قۆپیە تازانە تێرم کوتکوتی ئەکەم و ئەیخەمە مەعبەینیانەوە. لەم سەرەوە خۆمیان پیا ئەدەم؛ ئەگەر هی حەوتەمیشیان وە تەواوی نەیگرێ، ختوکەیەك وە بەر میزڵدانیا هەر تێت».

**١٥١.** شتی چۆن ڕوو ئەدا!: تازە شەمەندەفەر داهاتبوو، کابرایەکیان کردبوو بە مەعمووری سەر چواردەڕێیانی شەمەندەفەرەکە. دوو بەیداخیان دابووە دەست و فیق‌فیقەیەکیش بە لاقەدیەوە بوو. کە شەمەندەفەرەکە لە دوورەوە ئەهات و بۆڕەکەی خۆی لێ ئەدا، ئەم کابرایە ئاگادار ئەبووەوە، ئەمیش فووی ئەکرد بە فیق‌فیقەکەی خۆیا و بەیداخەکانی ڕائەوەشان بۆ ئەوە ڕێگەی خەتەکە بۆ شەمەندەفەرەکە بەرەڵا بکرێ.

جا ئەم کابرایە ژنێکی عەرەبێ هێنابوو. بە شەو کە ئەنوستن ـ بلامانێ ـ بۆنی تس زۆر ئەبوو. کابرا بە ژنەکەی ئەوت: تۆیت. ژنەکەش ئەیوت: من نیم، تۆیت. ئاخر قسەیان هاتە سەر ئەوە کە یەکێ پشقلێ بخەنە قنگیانەوە؛ ئەگەر دوابڕاوەکە هات، پشقلەکە دیارە دەرئەپەڕێ و ئەو وەختە دەرئەکەوێ کە کامیانن!.

لەسەر ئەم تەکبیرە سەر و پشقلیان خستە قنگیانەوە و نوستن و شەوێ کە کابرا خەبەری بووەوە سەیری کرد پشقلەکەی دەرپەڕیوە و نەماوە. لە ترسی ئەوە کە دواجار ژنەکەی پێی بڵێ دیارە بۆنە پیسەکە هی تۆیە، دەستی گێڕا بۆ پشقلێکی‌تر کە بیخاتە خۆیەوە و ڕزگاری ببێ. چاوی بە خەوەوە بوو هەروا دەستی ئەکوتا کوتوپڕ فیق‌فیقەکەی بەردەست کەوت، لای وا بوو پشقلە. تەپانیە خۆیەوە و نوست. زۆری پێ‌نەچوو کابرا تسی هات و لە دەنگی فیق‌فیقە خەبەری بووەوە. لای وا بوو ئەوە شەمەندەفەرە هات، هەر خێرا ڕاست بووەوە دەستی دایە بەیداخەکان و دەستی کرد بە باڵ ڕاوەشاندن و بەیداخ هەڵتەکاندن. فیق‌فیقە لە ژێرەوە هەر خەریکە. ژنەکەی خەبەری بووەوە، سەیری مێردەکەی کرد پێی وت: ئەوە بۆچ وا ئەکەی؟ وتی: ئاخر ئەوەتە شەمەندەفەر هات. وتی: «کوڕە شەمەندەفەری چی؟ تسەکەی خۆتە ئەم گیزوهۆڕەی ناوەتەوە!».

١٥٢. کابرایەکی «یۆسۆجانی» ڕەمەزان لە شارەزوور مابووەوە نەچوو بۆ کوێستان. دنیا قرچەی هاوین بوو؛ زۆر گەرم بوو. ئەویش بەڕۆژوو بوو. ئەکەوتە دەمەدەمی عەسر تینوویەتی بە جارێ شپرزەی ئەکرد. گۆمێك بە قنگی خێڵەکەوە بوو هەموو ڕۆژێك ئەچوو لە گۆمەکە لەبەر تینوویەتی مەلەی ئەکرد. کە خۆی هەڵئەقوڵتان لە ئاوەکە لە ژێرەوە تێروپڕ ئاوی ئەخواردەوە. کە سەری دەرئەهێنایەوە ئەیوت: «بکەم وە قنگ دایکتەوە ڕەمەزان! خۆ تۆ دایکت گام بوۆچ من ناتوانم فێڵت لێ بکەم و ترت بورم».

١٥٣. عەبەی مەلاحەسەن هەبوو. ساڵێك ئەچێتە خێڵێکی نیشتەجێ (سمایل عوزەیری) لەو بناری «چەقڕ» و «قایکەن»ـە بۆ

مەلایەتی ڕەمەزان. هەموو ئێوارە و پارشێوێك كە ئەم دەستی ئەكرد بە بانگ و سەڵا، كەرێكیش لەوێ بوو، ئەویش دەستی ئەكرد بە زەڕەزەڕ. جەژن نزیك بووەوە عەشیرەت لێی كۆ بوونەوە و وتیان: «مەلا تۆش وەكوو مەلاكەی پارمان لەگەڵ مەكە؛ جۆشمان لێ بسێنە». ئەڵێ: برا ئەگەر نەشمدەنێ هەر ئەبێ بمدەنێ؛ چونكە مەلاكەی پار هەر خۆی بوو، من ئیمساڵ هاوڕێكم هەیە. من بانگەكەم ئەدا و ئەو سەڵاكەی ئەكرد، خۆ ئەمەی بە خۆڕایی نەكردووە؛ ئەبێ جۆكە بدەم بەو. ئەڵێن: مەلا هاوڕێت لە كوێ بوو؟ خۆ تۆ هەر خۆتیت. ئەڵێ: ئەو كەرەی ئەوبەرە، هەژارە دەمی بە یەكا نەناوە؛ لەگەڵ بانگی من ئەو سەڵای خۆی كردووە. ئەڵێن: «برا خۆ كەرەكە باوكت نییە؛ خێزانی خۆمانە هەقەكەی ئەوت نادەینێ، خۆمان لە باتی ئەو ئەیخۆین. ئەوا بەشەگەنمی خۆت و خوات لەگەڵ». مەلا بۆ ڕیش چوو سمێڵیشی نایە سەری.

**١٥٤.** شێخ مارفی سەعاتچی لە كەركووكەوە بۆی نووسیم وتی: كابرایەكی كەڕ دراوسێیەكی نەخۆش بوو، هەستا چوو بۆ سەردانی. گوێزیان هەبوو، هەندێ گوێزیشی بە ناوی دیارییەوە بۆ برد. كە چوو دانیشت لە نەخۆشەكەی پرسی: ئێستە چۆنی؟ كابرای نەخۆش وتی: زۆر خراپم. ئەم لای وا بوو ئەڵێ: زۆر چاكم، وتی: «الحمد لِلّه».

لێی پرسی: خواردنت چییە و چی ئەخۆی؟ وتی: برا خواردنی چی؟ خواردنم زەهری مارە. وتی: یارەبیی لە گیانت خۆش بێ! ئەڵێ: كێ دەرمانت ئەكا؟ ئەڵێ: كێ ئەیكا؟ ئیزرائیل. كەڕە ئەڵێ: قومی خێر ئەبێ ئیشەڵلا! ئەڵێ: ماڵ و منداڵەكەت چۆن خزمەتت ئەكەن؟ نەخۆشەكە ئەڵێ: پیاو نەخۆشی درێژەی كێشا ماڵ و منداڵیشی لێی وەڕس ئەبن. ئێستا وام

لێ هاتووە ئەزانم کە من مردم چوار ڕۆژی پێ ناچێ ژنەکەم شوو ئەکا. کەرە ئەڵێ: هیچ خەم مەخۆ، من ئامادەم بۆ هەموو خزمەتێك لە باتی تۆ. کەرە گوێزەکان لە کۆشیا ئەبێ، تومەز ڕانکەکەی دڕا بوو، هەموو گەڵوگونی بە دەرەوە بوو، خۆی ئاگای لێ نەبوو. نەخۆشەکە دەستی بۆ ڕائەکێشێ ئەڵێ: کۆشت داپۆشە. کەرە وا ئەزانێ پێی ئەڵێ: ئەوەت بۆچی هێناوە، ئەڵێ: وەڵڵا هێناومە بۆ مناڵەکان گەمەوگاڵتەی پێ بکەن.

**١٥٥.** کابرایەکی هەورامی لەگەڵ ژنێکا دەست تێکەڵ ئەکا و دەورێکی زۆر بە گەمەوگاڵتە ڕائەبوێرن. لە پاشا کابرا ئەچێ بۆ حەج و لە حەج تۆبە ئەکا و خۆی لە هەموو گوناحێ ئەشواتەوە و ئەگەڕێتەوە بۆ وڵات. کە نزیکی ئاوایی ئەبێتەوە گوێی لە دەنگی «سیاچەمانە» ئەبێ. دەنگەکە کاری تێ ئەکا، کە چاك گوێ ڕائەگرێ سەیر ئەکا ئەمە دەنگی ژنەکەی دۆستیەتی.

بە دەم دەنگەکەوە ئەڕوا تەماشا ئەکا ڕاستە ئەمە دۆستەکەیەتی وا بەسەر دارتووێکەوە؛ توو ئەتەکێنێ و دەرپێشی لە پێیا نییە. کە بەم جۆرە چاوی پێ ئەکەوێ هەوەسی جارانی هەڵئەستێتەوە پێی ئەڵێ: «چەمانو جارانێ حاجی! وەزەرا با یەوێ کەرمێ. مەلوا حەجێکی‌ترت پەی‌کەروونە[1]»؛ واتە: چاوەکانی جارانی حاجی! وەرە خوارەوە با یەکێکی‌تر بکەین. ئەچم حەجێکی‌ترت بۆ ئەکەم.

**١٥٦.** مەلا قادری بیارە زاوای شێخ ڕەزای عەبابەیلێ ئەبێ. شێخ ڕەزا نوێژ ناکات؛ مەلا ئەفەرموێ: یا شێخ! تۆ سەیدیت و ڕیشت

---

[١. ئەسڵی زمانە هەورامییەکەی بەم جۆرەیە: «چەمەکا جارانو حاجی! وەزەرە با یوە کەرمێ. مەلوو حەجێوەتەرت پەی کەروونە». (هەڵەگر).]

سپییە و خەزووری منیشی، چۆن ئەبێ نوێژ نەکەی؟ نابێ؛ ئەبێ هەر بیکەی. ئەویش ئەڵێ: مەلا نوێژم پێوە نایە. بە خەزوور خەزوور مەمگێ. مەلا هەر وازی لێ ناهێنێ تا ئاخری هەڵیئەگرێ و ئەو شەوە ئەچن بۆ مزگەوت بۆ نوێژ.

نوێژ دائەبەستن و شێخ لەو وەختەدا ئەچێ بۆ سەجدە، بۆ نەگبەتی دووپشکێك پێوەی ئەدا. لە تاو ژانی دووپشکەکە کوتوپڕ بایەکی گەورەی لێ بەر ئەبێ. زۆر تەریق ئەبێتەوە، نوێژەکە ئەبڕێ و دەست ئەکا بە جنێودان بە مەلا ئەڵێ: «من ئەڵێم نوێژم پێوە نایە ئەو هەر ئەڵێ نوێژ بکە، لای وایە مارەیی دایکی بە سەرمەوەیە».

**١٥٧.** لەو وڵاتە کابرایەکی کاروانچی ئەیەوێ چەند هێلکەیەك بکڕێت، ئەچێ بە ئاواییەکەدا ئەسووڕێتەوە دەستی ناکەوێ؛ تومەز ئەمە لەوێدا بە هێلکە ئەڵێن: «یومورتە». ئەمیش نازانێ بڵێ یومورتە لەبەر ئەوەیە دەستی نەئەکەوت. کوتوپڕ ئەچێتەماڵێك تەنها ژنێکی تێدا ئەبێ، کە ئەم داوای هێلکەی لێ ئەکا، ئەو لێی تێ ئەگا و ئەڵێ: هەمانە. چوار هێلکە بە قڕانێ لەگەڵی ڕێك ئەکەوێ.

ژنە ئەچێتە بەر کولانەکە کە هێلکە دەرێنێ، دەرپێ لە پێیا نامێنێ، پاشەڵێکی سپی و قەڵەوی ئەبێ. کابرا خۆی لێ خۆش ئەکا؛ کە ئەو سەر ئەکا بە کولانەدا ئەم لە دواوە بلامانێ ئیشی خۆی لەگەڵا ئەکا و ژنەش هیچی بۆ ناکرێ. کابرا، کە لە ئیشی خۆی ئەبێتەوە، هێلکەکان وەرئەگرێ و پارەکەی ئەداتێ و ئەڕوا.

ئێوارە کە مێردی ژنە دێتەوە ژنەکە بۆی ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: «پیاوەکە ئیمڕۆ هەندێ یومورتەم فرۆشت بە کابرایەکی کاروانچی. هەر چوار یومورتە

بە قڕانێک». کابراش ئەڵێ: بەخوا خەڵەتاوی؛ لە کەرکووک سێ یومورتە بە قڕانێکە؛ باش گاوتی. ئەبوا نەتفرۆشتایە. ژنە ئەڵێ: جا من بڵێم چی، بەخوا سەرم لە کولانەکەدا نەبوایە بە باوکیشیەوە نەیئەتوانی بمگێ.

**١٥٨.** کابرایەک هەبوو لە سنە «شێخ‌تەیموور»ی ناو بوو. ئەم شێخ تەیموورە پیاوێکی گاڵتەچی و قسەقوت بوو. دیوەخانگێڕی خەسرەوخانی کوڕی ئامانەڵڵاخانی والی و مووچەخۆری والی ئەردەڵان بوو. گۆیا ئەم شێخ‌تەیموورە دەستی پاشبازی هەبووە لەگەڵ شێخ‌ژنیا. لەبەر ئەمە ژنەکەی هەڵئەستێ ئەچێتە لای «ماهشەرەف‌خانم» - ژنی خەسرەوخان - شکاتی لێ ئەکا. ماهشەرەف‌خانمیش بانگی ئەکا و گەلێ قسەی پێ ئەڵێ و لە ئەنجاما شاربەدەریشی ئەکا. شێخ ئیتر چاری نامێنێ پڕوپرپیاسکەی خۆی چی ئەبێ لەناو ماڵا کۆی ئەکاتەوە ئەیخاتە تاکی خورجێک و ئەیخاتە سەر گوێدرێژێک و لێ ئەدا لە شار ئەچێتە دەرەوە تا بزانێ بەڵکوو خوا دەروویەکی لێ ئەکاتەوە.

دیارە خورجەکە لەبەر ئەوە لارەسەنگ ئەبێ لەسەر پشتی کەرەکە ڕاناوەستێ. شێخیش خێراخێرا هەر ئەیخاتەوە سەری و بە دەستیەوە بە هیلاک ئەچێ. ماهشەرەف‌خانم لە پەنجەرەوە چاوی لێ ئەبێ، زۆر بە لایەوە سەیر ئەبێ. بانگی لێ ئەکا ئەڵێ: شێخ تەیموور تۆ شێت بوویت، چۆن ئەم شتومەکانە ئەخەیتە یەک تای خورجەکەوە؟ نازانی لارەسەنگ ئەبێ و ڕاناوەستێ؟ بیخەرە هەردوو تاکەکەیەوە تا نەکەوێ.

شێخیش ئەڵێ: خانم نازانم قوڕی کوێ بکەم بە سەرما! ئەی تۆ لەسەر ئەوە کە خستوومەتە هەردوو تاکەکەیەوە شاربەدەرت نەکردم؟ ئاخر نازانی من لەبەر ئەوە کە لارەسەنگ نەبێ بۆیە وام ئەکرد. ئیتر

ماهشەرەف‌خانم پێ‌ئەکەنێ و ئەڵێ: دەك بە لەعنەت بی بۆ خۆت و وەڵامت و کردەوەت! ئیتر فەرمانی دا بە گێڕانەوەی.

١٥٩. جارێك فەقێیەك لە خزمەتی مەلای بیارە ـ مەلا قادر ـ دا ئەبێ. فەقێکە شێت ئەبێ، ئەڵێ: مامۆستا بەخوا لەشم پیسە. مەلا ئەفەرموێ بیخەنە ئەو حەوزەوە لەشپیسی دەرکەن. فەقێکە قاقا دەست ئەکا بە پێکەنین و ئەڵێ: مەلا خۆ تۆ مەلای، نازانی نیەت بە دەست خۆمە!؟.

١٦٠. شێخ مارفی سەعاتچی بۆی گێڕامەوە وتی: «ساڵێکیان نەخۆش بووم، بردبوومیانە خەستەخانەکەی سولەیمانی لەوێ لە ژوورێکا بووم. یەك دوو ڕۆژی پێ‌چوو، پیاوێکی کۆنی ڕیش‌سپی لەوانەبوو بە ساغی بە گۆچان ئەڕۆیشت بە ڕێگەدا ئەویشیان بە نەخۆشی هێنایە ئەو ژوورە. لە نکە نکە و قسە کردنەکەیا بۆم دەرکەوت «یۆسۆجان»ـی بوو. دوکتۆر هاتە سەری و لەبەر ئەوەی سکی نەئەچوو وتی: دەستووری کەن. بەردەست و مەردەست و دەستوور و تڕوتفاقیان هێنا و دەرپێی کابرایان داکەند. کابرا کە ئەمەی دی زیندوو بووەوە و وتی: ئەوە چی ئەکەن؟ وتیان: دەستوورت ئەکەین. وتی: برا دەستوور چییە؟ تێیانگەیان کە دەستوور چییە.

کابرا هەناسەیەکی هەڵکێشا و دایە بانگدان: ڕۆڵەڕۆ! براڕۆ! چیم کرد وە خۆم. وتی: ئەوە بەچکە شاری بۆیە هەر وە منالی حیز ئەون فێری ئەمە کریاگن؛ دەسا وەو کەریمەسوورە نایەڵم پلتان وە قنگم کەوێ.

١٦١. دوو کابرای کوردی تاوەگۆزی چووبوون بۆ هەڵەبجە بۆ شتومەك کڕین. یەکێکیان پیرێکی بەساڵاچووی پشت کۆماوە بوو.

ئەوی‌کەیان باریکێکی لاوازی بێ‌تێن بوو. وا دیار بوو لە دوو خێڵ بوون؛ کۆنە قینێك لە بەینیانا هەبوو بەرپلاری یەك نەئەکەوتن. لەوێدا بە ڕێکەوت تووشی یەك بوون و بوو بە شەڕ و جنێویان بەیەك ئەدا. کابرای لاواز ڕووی کردە پیرەکە و پێی وت: «بچۆ وەو لاوە هەی سەگی گووکەری پشت هیز! یێژی ژیکەوانی هاتگیسە یەك. تۆیش ناوی خۆتت ناگەسە پیاگ؟»

ئینجا پیرە پشت کۆماوە بەوی وت: «کورە تۆ بچۆ بەولاوە بکەم وە قنگی دایکتەوە. یێژی پیاگی چاوی چارەڕێیت، وە خوا هیچ چەورت ناکەم ئەتکەم وە قنگی کەرا». لاوازەکەش پێی وتەوە: «نا، نایکەم، وە قنگی خۆتا خاسترە».

١٦٢. کابرایەکی خەڵکی «باوەکوچك»ـی لای هەڵەبجە ـکە کۆنە کۆچەری بوو- کوڕێکی چووبوو بۆ فەقێیەتی. کوڕە لە پاش ساڵێك دێتەوە بۆ ماڵی باوکی بۆ دیدەنی. دەستێ جلی جوان و پاك و پوختەی لە بەرا ئەبێ، جووتێ قۆندەرەی تازەی لە پێیا ئەبێ؛ هەموو جار بە پاژنەهەڵکێش لە پێی ئەکا. فەقێ لە پاش چەند ڕۆژێك ئەگەڕێتەوە بۆ خوێندنی خۆی. خەڵك و خوا لە باوکی ئەپرسن و ئەڵێن: ئەرێ خاڵە! حەمە دیار نییە، بێژی چووگەسەوە؟ ئەویش ئەڵێ: حەمەی کوڕم وە هێمە ڕازی ناوێ؛ کەوش وە چمچە هەڵئەکێشێ، کەڵکی بڕیاگە، یێژێ من فەق‌فەقێم.

١٦٣. شێخ بابەعەلی تەکیەیی جارێکیان ئەچێتەوە بۆ تەکیە. لە ڕێگادا شەوێك لە ئاوایی «کونەکۆتر» ئەمێنێتەوە. کونەکۆتریش هەموو خزم و ناسیاو بوون، ئەیویست هەموویان ببینێ. ئێوارێ بۆ

نوێژی شێوان چوو بۆ مزگەوت و خەریکی دەستنوێژ شتن بوو، تەماشای کرد خەڵکێکی ئێجگار زۆر لەناو بەردەکانا لە تەنیشت یەکەوە دانیشتوون و هەموو لە پشتێنان بەرەوژووریان بە دەرەوەیە، ئەو شوێنەش نزیکی کانی ژنان بوو. پرسی: ئەوە ئەو حەشامەتە چی ئەکەن لەوێ؟ وتیان: قوربان ئەوە عابخانەیە و ئەو خەڵکە لەسەر پێشاون. بابەعەلی وتی: کوڕم لەوە چاکتر دەست ناکەوێ بۆ چاوپێکەوتنی خزمان. دەستنوێژی لە نیوەدا بەجێ‌هێشت و خێرا چوو لە بەینیانا وتی: سەلامو عەلەیکم و دانیشت. یەکەیەکە ڕووی تێ‌کردن و دەستی کرد بە مەرحەبا و چاك و چۆنی لەگەڵیان، قوتوەکەشی دەرهێنا هەریەکە جگەرەیەکیشی دانێ.

خەڵکەکە کە ئەمەیان چاوپێ‌کەوت هەریەکە بە گەڵوگونی بەرەڵڵاوە ڕووەو شیوێك هەڵاتن. بابە عەلی وتی: برا بۆچ هەڵدێن؟ من بۆلای ئێوە هاتووم، لێرە نەبێ وا بە کۆمەڵی لە شوێنێکی‌تر ناتانبینم.

**١٦٤.** کابرایەکی خەڵکی «زاخە» بۆ کاروکاسبی ڕێی ئەکەوێتە ئەستەموڵ. کە ئەچێتە ناو شار هیلاك و ماندوو و پەرێشان ئەبێ، لەبەر گەرما و برسییەتی بە جارێ ئەوەندەی‌تر پەکی ئەکەوێ. بە ناچاری لە بن سێبەری دیوارێکی بەرزا خۆی دا بە عەرزا و لێی کەوت. کابراش گاڵتەی لەگەڵ نەئەکرا؛ کەڵەمێردێکی کەڵەگەتی سوور و سپی ناوشان پان، بازۆڵە بادراو، بەڵام هەژارییەکەی سەری لێ تێك دابوو.

چاوی چووە خەو و نەچوو یەکێ بە تورکی بانگی کرد: کە خانم داوات ئەکا، تومەز ئەم کە لە بن دیوارەکەدا کەوتووە خانمی ئەو ماڵە لە پەنجەرەوە چاوی پێ کەوتووە و ناردوویە بەشوێنیا. کابرا هەستا و ڕۆیشت. کە چووە سەرەوە بۆ خزمەت خانم، خانم بە تەواوی چووە

دڵیـەوە و پێـی وت: ڕەنگبـێ تازە لـە ڕێـوە هاتبیـت برسیـت بـێ. ناردی نانیان بۆ هێنا و ئەمجا ناردیە حەمام کە خۆی بشوا، دەستێ جلوبەرگی جوانیشـی بۆ نارد. کـوڕە لـە حەمـام هاتـە دەرەوە و بەرگـی نوێـی پۆشـی بوو، بـوو بـە پاشـازادەیەك. کـە هاتـەوە بـۆ خزمـەت خانم و خانـم چاوی پـێ‌کـەوت ئیتـر بـە تەواوی شیفتەی بوو، شـەرمی لـێ هەڵگیـرا و بانگی کردە تەنیشت خۆیـەوە.

ئەوەنـدە هەبـوو کابـرا لەبـەر ئەوە تا ئەو وەختە هیچ شـتێکی نەدیبوو لە ناوکی توند کرد و خەریك بوو سکی کون بکا، ژنەش لە ژێرەوە هەر هاواری ئەکرد و بە تورکی ئەیوت: «وڵان ئەشـاغە، وڵان ئەشـاغە»؛ واتە بـۆ خـوارەوە بـۆ خـوارەوە. کابـراش نەیئەزانـی ئەشـاغە چییـە، لای وابوو وشـەی ئەشـاغە یانی «باشە»، هەر خۆی پیا ئەدا و ئەیوت: «خانم خوا نەیوڕێ و لێت وە زیاکا، گشتی هەر ئەشاغەس!».

**١٦٥.** کوڕێکی «هەرتەل»ـی لەو خۆشناوە ژنێکیان لە بەری «کۆیـە» بۆ مارەکردبوو. ڕۆژێك کوڕە هەڵئەستێ دوو گوێدرێژ بار ئەکا لە مێوژ و دۆشاو ئەچێ بۆ ماڵی دەزگیرانی. کە ئەگاتە ئەوێ خەسووەکەی لە دوورەوە چاوی پێ ئەکەوێ و دێتە پێشوازی و گەلێ بە دەوریا دێت و ئەیباتـە ژوورەوە. بەڕەیەکـی پاکوخاوێنـی بـۆ ڕائەخاو پێـی ئەڵێ: کوڕم لەوێ دانیشە و خۆی ئەچێ بەلای تەقەتکردنی وڵاخەکانەوە.

کـە دێتـەوە تەماشا ئەکا کوڕەکـە بەڕەکـەی هەڵداوەتـەوە و لەسـەر زەوییەکە بە ڕانکە شڕەکەیەوە دانیشتووە. پێی ئەڵێ: کوڕم من بەڕم بۆ تۆ ڕاخستووە، بۆچی لە سەری دانەنیشتوویت؟ کوڕە ئەڵێ: «بەخودای دایە! قونانم من پێوەنە، ڕایەم ناکەوێ لەسەر بەڕەکی دانیشم». خەسووەکەی

سەرێکی بۆ با ئەدا و ئەڵێ: دەك موبارەکم نەبێ بۆ خۆم و زاوام.

کوڕە گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان و لە پاش ماوەیەکیتر برایەکی لە خۆی گەورەتری هەبوو، دایکەکەی پێی وت: دە کوڕم تۆش بچۆ سەرێك لە ماڵی خزمەکەمان بدە و شتێکیشیان بۆ بەرە. ئەویش هەستا بارێك دیاری دایە پێش و چوو بۆ ماڵی دەزگیرانی برای. ئەمیش کە گەیشتە ئەوێ ئامۆژنی هات و پێشوازی کرد و ڕایەخی بۆ ڕاخست و دانیشت. پاش بەخێر هاتن و چاك و چۆنی گلەیی براکەی لای کرد وتی: من ڕایەخم بۆ ئەو ڕاخستووە و پێم وتووە دانیشە، کەچی ئەو وای جواب دامەوە. ئەمە ئەقڵە ئەو هەیەتی؟ کوڕەی براش سوور بووەوە و تووڕە بوو و وتی: «دەك لە قوڕێم نا! دەسا وەڵڵا دوو جارم گاینە چ بڕ مووی بە قوونانەوە نینە؛ وەکوو کسۆکی درۆی کردینە». خەسووەکە کە گوێی لەمە بوو وتی: بەه... «هەتەر مەتەر ئەم لەو بەتەر».

ئەویش گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و پاش بەینێکیتر باوکی کوڕە بە دەستووری ئەو وڵاتە ئەویش هەستا دوو گوێدرێژی دایە پێش و چوو بۆ سەردانی بووك. هەرکە گەیشت، خەسوو هات بە پیریەوە و داینا و پاش حەسانەوە شکاتی کوڕەکانی لای کرد. کابراش وتی: «ئەو هەتیمە بیژیە گچکەکەیان هیچ، بەرا داخی کوڕە گەورە لە درا من». وتی: بۆچی؟ وتی: «ئەوێ ڕۆژێ کەرا دگێم، ئەو بیژیە دێ پخەی لە کەرا دەکا کیرم دە دوڕ قوزی کەرێ حاسی بن و ئەویش لۆ خۆ پی بکەنی». ژنە ئەڵێ: گوڵمە، گوڵمە ئیشێکی باشمان کرد و کچی چاکمان دا بە شوو.

کابراش ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و پاش چەند ڕۆژێك ئنجا دایکی زاوا هەڵئەستێ بە بارێ دیارییەوە ئەچێ بۆ ماڵی بووکی بۆ سەردان. دایکی بووك زیاد لە هەموویان بە دەوریا دێت و پاشان ئەکەونە ڕاز و گلەیی

و هەموو قسەکانی بۆ ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: شکاتم بردە بەر خاڵە مستۆی باوکیان کەچی ئەویش وای وت.

ژنەی دایکی زاوا بە لووتوپووت و لێو هەڵقرتانێکەوە وتی: «تو خوا وازبێنە، داخی باو زۆر گەورەن لە دڵا من». دایکی بووکیش وتی: بۆچی؟ وتی: «کچێ! ئەوا کوڕ و کالا دێ هەموو بە من خەنی دەبوون، کەچی ئەویش دەچوو جاشەکانی دەگا!)». ژنە وتی: دە خوا پێمان ڕەوا بینێ ئەم خزمایەتییە تازەمان.

**١٦٦.** کابرایەکی خۆشناو خەڵکی گوندی «کونەفلوسە» هەبوو؛ گەلێ کەسی کوشتبوو. ڕۆژێک لە کۆیە زەفتیە بەگیری دێنن نەک بەو ناوەوە کە خەڵکی کوشتووە؛ چونکە ئەو دەستەیە نەیانئەزانی ئەمە ئەوە، بەڵکوو بۆیە هەڵیانپێچابوو بیبەن بۆ «سوخرە». لە کابراش وایە بۆیە تێی ئاڵاون ناسیویانە کە ئەمە ئەو خەڵکی کوشتوو. دەستی کردبوو بە پاڕانەوە لە زەفتیەکان بۆ ئەوە بەڵکوو بەرەڵڵای کەن.

حاجی‌ڕەسووڵێکی‌کۆییش هەبوو لەو وەختەدا بەسەرا ئەچێ. پیاوێکی بە زمان و لێهاتوو بوو. کابرای خۆشناوی ئەناسی، چووە بن دەست زەفتیەکانەوە پێی وتن: ئێستە ئەم کابرایەتان بۆ سوخرە ئەوێ و ئەویش ماڵ و مناڵێکی وردی هەیە، ئەو بەرەڵڵا کەن و من لە باتی ئەو بگرن. بە هەرجۆر بوو زەفتیەکانی ساز کرد و کابرایان بەرەڵڵا کرد. کابرا هەر کە لە دەستیان دەرباز بوو ئیتر وەکوو مووررووی مار خۆی ون کرد. حاجی‌ڕەسووڵیش دەنگی نەکرد تا کابرا لە چاو ون بوو؛ ئنجا ئەویش ملی ڕێی گرت و ڕۆیشت. زەفتیەکان ویستیان بیبەن، پێی وتن: مردووتان مرێ! شێت بوون؟ بردنی چی؟ بێن دوو بدەن لەمە. ئەویش خۆی نەدا

بە دەستەوە و ڕۆیشت.

حاجی ڕەسووڵ بۆ ساڵی دوایی چوو بۆ «کۆنەفلوسە» بۆ دارگوێزکڕین. دارێکی کڕی و کرێکاری خستە سەری بیبڕنەوە. ئەم دارە لەق و پۆپەکەی بەسەرماڵێکا شۆڕ ببووەوە کە ئەیان بڕیەوە حەیشی بە ماڵەکەی تاڵ کردبوو. ژنی خاوەن ماڵ بانگی کرد لە مێردەکەی وتی: ئەرێ هیزە، ئەوە ما چاری ئەو سەگبابانە ناکەی؟ خۆ حەیشیان پێ تاڵ کردین. مێردەکەش دەست ئەداتە تفەنگ و بۆیان دەرئەپەڕێ.

تومەز ئەم ماڵە ماڵی کابرای پارە، کە «حاجی ڕەسووڵ» لە دەست زەفتیەکان ڕزگاری کردبوو، کابرا هەر کە دێتە دەرەوە چاوی بە حاجی ڕەسووڵ ئەکەوێ لە شوێنەکەی خۆی سارد ئەبێتەوە. ژنەکەش لە خوارەوە هەر قسەی ئەکرد و جنێوی ئەدا و بانگی پیاوەکەی ئەکرد: کە ما چاریان ناکەی؟ ئنجا کابرا ڕووی کردە ژنەکەی و بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد وتی: «کچێ وس بە. ئەوە حاجی ڕەسووڵە، حاجی ڕەسوو... ئەگەر ئەو نەبا جارێکی کە ئەو جووتە گونانەت بە قوونا نەدەکەت، دە ئیتر وس بە».

**١٦٧.** حەسەن بەگی عەلی بەگی جاف بۆی گێڕامەوە وتی: دوو تیرە لەو سەرە هەن یەکێکیان «کاک سەوەنی» و ئەوی کەیان «قەمەری»یان پێ ئەڵێن. تۆزێ ناکۆکی هەبوو لە بەینیانا. سمایلێکی «بامۆك»ـی هەبوو مەلای «سلێمان خان»ـی سەرۆکی عەشیرەتی ئەم کاك سەوەنییە بوو. مەلا نوێژی ئەکردن و بە منداڵەکانیشیانی ئەخوێند.

کوڕێکی ئەم سلێمان خانە هەبوو لای مەلا ئەیخوێند. هەر لە «ا، ب، ت»وە دەرزی پێ وت تا گەیشتنە سوورەی «والشّمس و القمر».

کە ئەگەنە ئەوێ کورە «مان» ئەکا و نایڵێت. مەلا ئەڵێ: بۆچ دەنگ ناکەی؟ کورە ئەڵێ: «مامۆستا تۆ نانی باوك و عەشیرەتی من ئەخۆیت و کەچی عەشیرەتی قەمەریت بە لاوە گەورەترە و ئەوان سەر ئەخەی بەسەر ئێمەدا!!»

مەلا زۆر سەری سوڕ ئەمێنێ، ئەڵێ: ئەمە مانای چییە؟ ئەڵێ: «ئەوە نییە تۆ ناوی قەمەری دێنی لە قورعان و هیچ گوێ بە ئێمە نادەی».

مەلا ئەمجا تێ ئەگا و ئەڵێ: ڕۆڵە ئەمە بە دەست من نییە و ئەمە قورعانە؛ خۆ من دامنەناوە. هەرچەند قسە ئەکا کورە ناچێ بە گوێیدا و نایڵێ و ئەچێ بۆ شکات بۆلای باوکی. کە باوکی تێ ئەگەیەنێ، باوك خراپتر. مەلا بانگ ئەکا و پێی ئەڵێ: «تۆ نانخۆر و بەرگدڕی منی، کەچی ناوی قەمەری سەگباب دێنی و ناوی کاك سەوەنی بەو نەجیمی و پیاوەتییەوە ناهێنێ لەو قورعانەدا کە بە کوڕەکەمی ئەڵێیت؟ دەسا هەر سێ تەلاقی ئەم سلێمان‌خانە کەوتبێ ناوی کاك سەوەنیش نەخەیتە قورئانەوە بە گوللەیەك ساردت ئەکەمەوە. هەی بکەم وە قنگ دایك خۆت و تەغارێك عەشرەتتەوە». مەلا ئیتر دەمی ئەبێ بە تەڵەی تەقیو و هیچی پێ ناوترێ، هەر ئەوەندە نەبێ کە ئەڵێ: خان ئەمە فەرمایشی خوایە من چۆن دەستی لێ دەم؟! خۆ بە دەست من نییە. خان پێی ئەڵێ: من ئەمانە نازانم هەر ئەوەیە کە پێم وتوویت.

مەلا، ناچار ئەچێتەوە قورئانەکە دێنێتە پێشەوە تیایا ئەنووسێ «"والشّمس" و کاك سەوەنی "والقمر"» و بەیانی کورەکە دێتەوە بەم جۆرە پێی ئەڵێت. کورە لە خۆشیانا پێی ناکەوێتە عەرز، ئەچێتەوە بۆ باوکی ئەگێڕێتەوە. باوکی ئەنێرێ بە شوێن مەلادا و خەڵاتێکی باشی ئەکا. ئەمجا مەلا ئەڵێ: «خان! من هەر بەمەوە ناوەستم، هەر ئێستە

ئەنێرم هەرچی قورئان هەیە بیهێنن و هەمووی ئەکەم بە "والشمس" و کاك سەوەنی "والقمر"». خان بە جارێ لە خۆشیانا شێت ئەبێ و ئەنێری دوو ئەوەندەی‌تر خەڵاتی مەلا ئەکەن!.

١٦٨. کابرایەك لەو دەشتی دزەییە ئەچێتە لای مەلایەك ئەڵێ: «مامۆستا، بێ عەدەبێ نەبێ پیاو کە چووە سەر ئاودەستان چەندە قنگی بشوا پاك دەبێتەوە». ئەویش ئەڵێ: «برا ئەوەندەی بشوا تا جیرە و زیرەی لێوە دێت».

ئەمجا کابرا کە دەچێتە سەر ئاودەست و دەست بە ئاو ئەگەیەنێ پاشان خۆی ئەشوا، هەر دەست بە خۆیا دێنێت و ئاوی پیا ئەکا، کوتوپڕ ترێك ئەکا. ئەڵێ: «ئەی بە کێری مەلاوە! چاك جیرە و زیرەی لێوە هات».

١٦٩. کابرایەك بێوەژنێکی لە سك وەستاوی هێنابوو. هەوەڵ شەو لێی پرسی: «ئەرێ دایکم، چەند شووت کردووە؟» وتی: «باوکم، بە گۆڕی جوانە مەرگەکە تەنها ٣١ شوو لەوە زیاتر پێم حەرام بێ».

کابرا وتی: «لەمانە هیچ مەلایان تیا هەبوو؟» وتی: «نەوەڵڵا». وتی: «کەواتە باشە هێشتا هەر کچی، خوا نەیبڕێ».

١٧٠. پیاوێکم لابوو لە بەغدا «مام پیرداود»مان پێ ئەوت. خەڵکی «دیبەگە»ی دەشتی دزەیی بوو. پیاوێك بوو بە دوبارا هەژار بوو، ئەوی خوا عەرەبیشی دانابێ ئەو نەیئەزانی.

ئەو سەردەمە بوو کە حاجییەکانی کوردەواری ئەهاتن ئەچوون بۆ حەج. دیارە ئەمانە بە بەغدادا تێ‌ئەپەڕن. ئەمانەش کە دێ خۆت ئەیزانی بە تایبەتی کە هاوین بێ زۆرتریان دزداشەیەك لەبەر ئەکەن و پشتێنێکی بە سەرەوە ئەبەستن و حەمایلەکەیان ئەخەنە ملیان و دیارە

جامەدانێکیشیان بە سەرەوەیە. ڕاستی، پیاو ئەمانە بە حاجی نازانێ بەڵام با حاجی بن.

مام پیرداودی لای منیش ئێوارە وەخت بوو، دزداشەیەکی سپی تازەی لە بەرابوو. جامانە ڕیشوەدارەکەی بە دەور سەرەوە بوو لە چەقی بەردەرگای مزگەوتەکەدا لەسەر چنچکان دانیشتبوو، جگەرەیەکی قامیشی بە لا لێوەوە بوو، جگەرەی ئەکێشا و سەیری ئەو عالەمەی ئەکرد کە ئەهاتن و ئەچوون.

هەندێ کەسیش هەن لە بەغدادا قاوەی دەستگێڕ ئەگێڕن. تووشی هەرکەسێ ئەبن ئەیدەنێ و پارەی لێ ئەستێنن؛ بڕوات ببێ سواڵکەری گەلێ باشترە لەو ئیشەی ئەوان.

ئەوەندەم زانی کابرایەکی ڕەشپێسی شڕی چڵکنی گرژن جەزوەیەکی قاوەی بە دەستەوەیە لە دوورەوە مامپیرداودی بەدی کرد و بۆی کشا. لە باوەڕی ئەوا ئەم حاجییەکە و هاتووە بۆ حەج ئەچێ، هیچ نەبێ شتێکی لێ ئەبەستێتەوە. هات و لە بەردەمیا ڕایگرت، مام پیرداودیش هیچ سێ و دووی لێ نەکرد، وەری‌گرت و خواردیەوە و فنجانەکەی دایەوە دەست کابرا. جگەرەکەی نەفەسێکی مابوو نەفەسەکەی لێ دا و فڕێی دا تا ئەم ئەمەی کرد کابرا قاوەیەکی‌تریشی بۆ تێ‌کرد. ئەویش وەری‌گرت و خواردیەوە.

ئەم قاوەچییانە ڕەوشتیان وایە لە قاوەی یەکەم و دووهەما ئەگەر کابرا نەیوت بەسە، بۆی ئەکەن بە سێ فنجان و ئیتر بۆی تێ ناکەن. جا لەبەر ئەوە کە مام پیرداود نەیوت بەسە، کابرا قاوەی سێهەمیشی بۆ تێ‌کرد. ئەویشی وەرگرت، خواردیەوە و فنجانەکەی دایەوە دەستی.

کابرا ئیتر ڕاوەستا و چاوەڕێی ئەوە ئەکا کە هیچ نەبێ مام پیرداود

حاجییە، دەست بەرێ پەنجا فلسی بداتێ. خۆ مام پیرداودیش ئەسپێ لە گیرفانیا «فەتاح‌پاشا» ئەکا. هەر نازانێ دنیا چ باسە.

کابرا کە سەیری کرد هیچ دیار نییە و زۆریش وەستا. ڕووی کردە مام پیرداود وتی: «**عمّي اَشُف ما تَلْعَب اِيدَكْ؟**»؛ واتە: مامە وەکوو ئەبینم دەستت ناخەیتە کار؛ (مەبەستی ئەوەبوو یانێ دەست ناکەی بەگیرفانتا پارە دەرێنی).

مام پیرداودیش هیچ چۆنیەتی دانیشتنەکەی تێك نەدابوو، نەشیئەزانی کابرا ئەڵێ چی. سەرێکی بۆ بەرز کردەوە و وتی: «چ دەریێ؟» کابراش نەیئەزانی ئەم ئەڵێ چی، هەر ئەیوت: «**عمّي اَشُف ما تَلْعَب اِيدَكْ؟**».

لەو وەختەدا مام پیرداود دەستی برد و کیسە تووتنەکەی لە پشتێنەکەی کردەوە، پەڕەیە بەرماخی دەرهێنا و ئەغزە کۆنەکەی کردبوو بە پێچی جامەدانەکەیا ئەویشی هێنا لەبەر ئەوە قاوەی خواردبووە ئارەزووی جگەرەی بوو، دەستی‌کرد بە جگەرە تێ‌کردن.

کابرای قاوەچی کە ئەمەی چاوپێ‌کەوت دەستێکی ڕاوەشان و وتی: «**إنّي أگول هيچي تَلْعَبْ اِيدَك**»؛ وا من ئەڵێم وا تۆ دەستت بخەیتە کار؟ ئەمیش هەر ئەیوت «چ دەریێ؟»

کابرا سەیری کرد هیچ کەڵکێك لەمە وەرناگرێ، قاوەکەی لە دەست دەرچوو، زۆریش ماتڵ بوو، سەری خۆی حیز کرد و بە بۆڵەبۆڵ لێی دا ڕۆیشت. لەبەر ئەوە چاوی بە خەڵکی‌ترەوە بوو، نەشی‌وێرا جامەدانەکەی لەسەر بکاتەوە.

لێرەدا سەیرتر ئەوەبوو وەکوو کابرا ئەڵێ: «ئاش لە خەیاڵێك و ئاشەوان لە خەیاڵێك»، کابرای قاوەچی لای وابوو نێچیرێکی قەڵەوی دەست کەوتووە و ئێستە بەبێ قرە پارەیەکی باشی لێ دەست ئەکەوێ.

مام پیرداودیش لای وا بوو لە دیواخانەکەی «سلێماناغا»دایە لە «دیبەگە»، کابرای قاوەچی ئاغە قاوە بەسەر کرمانجەکانا ئەگێڕێ. ئیتر هیچ ئەوەی بە دڵا نەئەهات کە ئەمە بەغدایە و ئەبێ پارە بدات.

تەنانەت لە پاشا من پێم وت: بۆچ ئەو قاوەت وەرگرت؟ وتی: لۆ؟ وتم: ئاخر ئەبێ پارە بدەیت. وتی: «کوو، ئەبێ پارەش بدەم؟» وتم: ئەی بۆچ سێبەری بن ئەشکەوتە؟ وتی: کوو؟ خۆ لە کن خۆمان چ پارە و مارە نییە جا من پارەم لە کوێ بوو بیدەم». وتم: کەواتە زۆر چاکە.

**١٧١.** ئەڵێ: شەیتان، جارێك لەو بەرکێوە تووشی کابرایەکی «بێسەری» بوو؛ پێی وت: نایەیت تۆزی دەمەتەقێ بکەین؟ کابرا وتی: با بیکەین. شەیتان زۆر شەکەت بوو، گەلێ سووڕابووەوە. بە کابرای وت: برا با یەکتر هەڵبگرین.

کابرا وتی: باشە بەڵام مەرجەکەمان چۆن بێ؟ شەیتان وتی: «قسەکەت باشە. تۆ من هەڵگرە و دەست ئەکەم بە گۆرانی وتن، هەتا هەچ گۆرانییەك ئەزانم ئەیڵێم، کە هیچ نەما دائەبەزم. تۆ سوار بە، تۆش دەست کە بە گۆرانی وتنی خۆت تا دوایی دێ، ئەو وەختە تۆش دابەزە».

کابرا وتی: باشە و ملی بۆ دانەواند. وتی: وەرە بچۆرە سەر قەڵادوشکانم. شەیتان سوار بوو دەستی کرد بە گۆرانی وتن. ماوەیەك بەم جۆرە سووڕانەوە و ئاهەنگەکانی هەموو وت و پاشان وەستا. کابرا وتی: ئەوە بۆچ دەنگت نایە؟ وتی: «وەڵڵا ئیتر هیچ نەما». وتی: کەواتە دابەزە نۆرەی منە.

شەیتان دابەزی و کابرا چووە سەرشانی و دەستی کرد بە وتن: «حەیولانێ، هەی حەیولانێ، حەیولانێ هەی حەیولانێ». هەر وتی و هەر نەبڕایەوە. شەیتان بە تەواوی هەموو دنیای [ گەڕاند و ] پرزەی لێ بڕا.

حەوجار دەوری دنیای دایەوە، «حەیولانێ» هەر دوایی نەهات. وتی: ئەرێ ئەوە تۆ چیت کرد؟ ئەم گۆرانییە هەر دوایی نەهات؟ کابرای کوردە: «لە کوێتە! ئەمە جارێ هەر حەیولانێیە؛ تڕحێوتڕحێوەکەی هێشتا لە دواوەیە».

شەیتان وتی: «کاکە نە لە من دەنگ و نە لە تۆ دەنگ. وەرە دابەزە بچۆ بە ڕێی خۆتەوە. لەمە زیاتر ئیتر مەمگێ، ئیشم زۆرن عالەم و زارۆڵەکانم بێ خاوەن ماونەتەوە».

**١٧٢.** سەدیق پاشا بۆی گێڕامەوە (صدیق القادری) وتی: قائیمقام بووم لە «چوارتا». عەشایری ئەم دیو هەمووجار ئەچوون تاڵان و بڕۆیان لە وڵاتی بانە و سەردەشت ئەکرد و ئەهاتنەوە. خەڵکەکەی ئەولاش ئەچوونە لای فەرماندەی سەردەشت شکاتیان ئەکرد. فەرماندەش قاقەزی بە فارسی بۆ من ئەنووسی کە جەردەکان بگرم و ماڵەکە بسێنمەوە. منیش هەموو جار لە وەڵامی نامەکەیا بە عەرەبی ئەمنووسی «لَم نَعثِرْ عَلى شَيءٍ».

هەموو ساڵێ جارێکیش بە ناوی ئەوەوە کە هەردووکمان قۆمیسەری سنوور بووین، لە دێیەك لەو دێیانە کۆ ئەبووینەوە و قسەمان لە کاروباری سنوور و هەڵ و هەواڵی ئەو یاڵەوە ئەکرد. وتی: ڕۆژێك بڕیارمان دا کە لە دێی «بێوڕێ» کۆ ببینەوە. من لێم دا چووم، شوێنیان بۆ چاك کردبووین، دانیشتم و زۆری پێ نەچوو فەرماندەش هات. بە شوێن ئەوا کابرایەکی ئەمنیەی ئێرانی ئەوەندەم زانی نقەنق نشتووە بە گۆنییەکی پڕ لە قاقەز و دەفتەر و شتومەکەوە هێنای لە تەنیشت منەوە دای بە ئەرزا و هەناسەیەکی دا، وەکوو بڵێیت زۆر هیلاك بووە. منیش

بەلامەوە سەیر بوو، وتم: ئەوە چییە؟ کابرا بە تووڕەییێکەوە وتی: «آغا این هم لم نَعثر است».

تومەز ئەوراقی ئەو ساڵە کە بە شوێن شتە دزراوەکانا نووسراوە و وەڵامی دراوەتەوە هەموویان هەڵگرتووە و هێنابوویان بۆ ئەوێ، پڕ ئەو گۆنییەیە و کابرا ناوی نابوو «لَم نَعثِر».

**١٧٣.** مەلایەك هەبوو هەموو دەوری گەنجی بەسەر بردبوو، بۆی نەلوابوو ژن بێنێ؛ هەر وانێکەکەی هەڵئەگلۆفت. پیر بوو، پشتی کۆمابووەوە ئەو وەختە ـ بە نسیبی هەموو لایەك بێ ـ ژنێکی بوو بە نسیب. شەوێ بووکی بۆ کرایە پەردە، بووك ئەتوت بەچکە حۆرییە. مەلا هەر بە دەوریا هەڵئەسووڕا و هیچی بۆ نەکرا ـ بلامانێ ـ وانێکەکەی هێزی ڕاست بوونەوەی تیا نەمابوو.

جا ئەیدا بە ڕانی خۆیا و ئەیوت: «ئاخ بۆ کێرەکەی شەرحی موغنی!». هیچ، بەیانی هەروەکوو خۆی هاتە دەرەوە.

(«شرح مُغنی» کتێبێکی «نەحو»وە فەقێ لە وەختی سوختەیەتیدا ئەیخوێنێ. ئەو دەورە کە ئەو کتێبە ئەخوێنرێ هەرەتی گەنجێتییە، وانێکەکە لەو دەورەدا ساج ئەسمێ، جا ئەم ئاخی بۆ ئەو دەورەیە هەڵئەکێشا).

**١٧٤.** جاران لەو دەشتی دزەییە مەلا زۆر کەم بوو. لە دە دوانزە گوندا بە حاڵ گوندێك مەلایەکی تیا هەبوو. مەلایەك هەبوو ئەیوت: مەلامحەمەدی بەهەشتفرۆش لە گوندی «قوشتەپە» دائەنیشت. ئەو مەلایە لە جەژنانی ڕەمەزانا سەری ئەهلی هەموو ئاواییەکانی چاك ئەکردەوە و سەرفیترەی هەموویانی وەرئەگرت.

لە ناو کرمانجایەتیشا لایان وایە، سەر هەر ڕۆژی جەژن چاك بکرێتەوە،

ئەگینا بەرناکەوێ. مەلاش خۆی پێی نەئەکرا هەر ڕۆژە بەسەر هەموو گوندەکانا بسووڕێتەوە و سەریان چاك بکاتەوە. هەر ئەوەی پێ ئەکرا یەك دوو دێ بگەڕێ.

جا ئاواییەکانی‌تر پێیان ئەوت: «مامۆستا خۆ سەری ئێمەت چاك نەکردیتەوە. کوو سەرفیترەت بدەینێ؟» ئەویش ئەیوت: «بابم، من هەر لە بەیانی ڕۆژی گێژنێوە بێ فیترە سەری هەمووم چاك کردیتەوە».

(مەبەستەکەشی ئەمەیە، گۆیا سەرلەبەیانی لەو دێیەدا کە لێی بووە چووەتە قەراخ ئاواییەکە پەنجەیەکی درێژ کردووە بە دێهاتەکانی ترا و فیکەیەکی بۆ کێشاون، ئیتر بەم جۆرە ئەوە سەری هەموویانی چاك کردۆتەوە).

ئەم چەند قسەیە فازڵ‌محەمەد حوسێن لە سولەیمانییەوە بۆ ڕشتەی ناردووە:

١٧٥. کابرایەك دایکێکی پیری ئەبێ نەخۆش ئەکەوێ. مەلایەك بانگ ئەکا کە یاسینێ لەسەر دایکی بخوێنێ. لەو کاتەدا کە مەلا خەریکی یاسین خوێندنەکە ئەبێ، کوڕە قاشە شووتییەکی سووری گەیشتووی جوان ئەدا بە دایکی کە بیخوا. دایکە هیچ دەستی بۆ نایەنێ، تومەز مردووە. مەلاش هەر خەریکی یاسین خوێندنی خۆیەتی.

کوڕە ڕووی تێ ئەکا و ئەڵێ: «مەلا بیوڕەوە، بیوڕەوە ترپیا بە کێرتا. جاران بۆ توێکڵە گواوییێك هەزار گانی ئەدا، ئێستە ناوە سوورەکەیشی ناخوا. دە ئیتر بیوڕەوە».

١٧٦. ژنێك هەبوو لەو بنارە دۆستێکی هەبوو، هیچ شوێنێکیان نەبوو بۆ ژوان. قسەیان هاتە سەر ئەوە کە هەموو شەوێ کابرای

دۆستە بێت و ژنەش لە باخەڵی مێردەکەیا بێت لە تەنیشتیەوە ڕاکشێت و گەمەوگاڵتەی خۆیان بکەن. بەڵام خۆت ئەزانی دنیا تاریکە، بۆ ئەوەی کابرای دۆستە لێی تێك نەچێ، ژنە پێی وت: «من پەتێکی سپی ئەبەستم بە قاچمەوە، ئیتر بەوەدا بزانە کە ئەوە قاچی منە و هی مێردەکەم نییە».

چەند شەوێك بەم جۆرە گەمەوگاڵتەیان کرد، شەوێك مێردەکەی چاوی بە پەتەکە کەوت، لێی پرسی: ژنەکە ئەو پەتە چییە بە قاچتەوە؟ ژنەش وتی: «پیاوەکە ئەمە دەزووی بەن‌دەزووی پەت‌دەزووی شادەزووی شۆخ‌دەزووی پیرۆزی شەودۆزی سەرهۆزی مرادە؛ هەرکەس لە پێی کا ئیمامی نازداری خدری زیندە ـ ڕۆحم بە قوربانی بێ! ـ بە خۆی و دارعەساکەیەوە دێ بەلایەوە. گوڵاوێکی ڕوونی بە بۆن و تینی ئەداتێ، بە خشەیەکەوە بە شکەیەکەوە بە مشەیەکەوە مرازی هەردوو دنیای ئەداتێ».

پیاوەکە ئەمەی بیست خۆی لێ مات دا، بۆی ڕێ کەوت بەبێ چرپە و بە دزییەوە پەتەکەی لە قاچی ژنەکەی کردەوە و بەستی بە قاچی خۆیەوە.

ئەو شەوە لە نیوەشەوا کابرای دۆستە دێت و دەست ئەکوتێ، بە پەتەکە قاچەکە ئەدۆزیتەوە و بە قاچی ژنەکەی ئەزانێ. دەرپێکەی دائەکەنێ و تێی بەرئەبێ. کابرا بە خەبەر دێ و کە سەیر ئەکا یەکێ تێی بەربووە ئەیکا بە هەرا. کابرای دۆستە کە ئەزانێ لێی تێك‌چووە لنگی کابرا فڕێ ئەدا و بۆی دەرئەچێ.

ژنە خەبەری ئەبێتەوە و ئەڵێ: ئەوە چی بوو؟ کابرا ئەڵێ: «سوانم مردیت مرێ! عەزرەت خدر ـ ڕۆحم بە قوربانی بێ! ـ هێندی نەمابوو بە دارعەساکەی قوونانم بدڕێ. دی خەبەرم بووەوە ئەویش چووەوە ژێر پەردەی غەیبی».

١٧٧. مەلایەك هەبوو لە سولەیمانی مەلا حەسەنەشێتەیان پێ ئەوت؛ بە منالآنی ئەخوێند. کە تووڕە ئەبوو دەستی ئەکرد بە جنێودان و قوتابییەکانی بە لێدان دائەگرتەوە.

قوتابییەکی لاساری هەبوو ڕۆژێك زۆری لێ دا، قوتابییەکە چووەوە بۆ ماڵەوە لای دایکی شکاتی کرد و وتی: ماموٚستا زۆری لێ داوم. دایکیشی هات بۆلای ماموٚستا و دەستی کرد بە گلەیی کردن کە بۆچی ئەوەندەت لە کوڕەکەم داوە؟ مەلاحەسەنیش وتی: «دایکم، خوشکم "لاحَیاءَ في الدّین" لە گرێی قنگت بەم! کوڕەکەت زۆر لاسار و بێحەیایە. بۆیە لێم دا، ئەگینە ئەستۆی بشکێ و چاویشی دەرێ».

١٧٨. کابرایەك هەبوو لەو ناو «نەورۆڵی»یە دەستی حەکیمی هەبوو. ئافرەتێکیش هەر لەوێدا هەبوو برینێکی ناقۆڵا لە لاڕانی هاتبوو، چاك نەئەبووەوە.

کابرای حەکیمیان بردە سەری. هێنای بە دەوا و دەرمان مەعجوونێکی دروست کرد و کردی بە شاپڵیتە و کێشایە کونی برینەکەوە. کونی برینەکە قووڵ بوو، شاپڵیتەکەش زۆر زل بوو، ئافرەتەکە لە تاو ئازارەکەی خۆی پێ ڕانەگیرا ـ بلامانێ ـ یەکێکی کەند. کابرای حەکیم ڕاچەنی و پاشان وتی: «ئەهوو! لە کوێوە لێم دا و لە کوێوە دەرچوو».

١٧٩. مەلا عەبدولڵای حەبانیە بۆی گێڕامەوە وتی: مەلا عەباسی گەڵاڵە وتی: ئەو سەردەمە ڕەز ئەخەسێنرا؛ (واتە ڕەزانەی ئەخرایە سەر). مودیرێکی پڕی زل لە سووورداش هەبوو، خۆی هەستا چوو بۆ «سەرگەڵوو» بۆ تەخمینی ڕەزانەی ئەو ناوە. ئەو ساڵەش تەرزە ئەو ناوەی هەموو کوتابوو، ترێ زۆر کەم بوو. مودیریش توند و تیژییەکی

وای ئەنواند تۆزی ئەکرد. «شەش بە تەشپیەکە حەوتی ڕبەیەکە» ئەیدایە بەری، هەرچەند تکایان لێ ئەکرد کە زۆر نەنووسێ، ئەو زۆرتری ئەنووسی.

شەوێ لە دیواخانی حاجی شێخ عارف کۆ ئەبنەوە و دیواخان گەرم ئەبێ. کوێخا و ڕیش سپی و پیاوماقووڵی ئەو وڵاتە هەموو لەوێ ئەبن و مودیریش بە فیزێکەوە لەو سەرەوە دانیشتووە. هەرچەن ئەو عالەمە تکای لێ ئەکەن ئەو هەر بای دێ و بەلای گوێیدا ئەڕوا.

میرزا قادرێک هەبوو خەڵکی سولەیمانی بوو، پیاوێکی ئەدیب و قسەزان بوو. زۆر دەمێک بوو لەو وڵاتە بوو؛ هەموو ئەیانناسی و بە چاوێکی بەرزەوە سەیریان ئەکرد.

کوتوپڕ میرزا قادر هات بۆ دیواخان و خەڵکەکە هەموو لە بەری هەڵسان و لەو سەرەوە دایاننا. مودیر نە لە بەری بزووت وە نە قسەشی لەگەڵ کرد.

میرزا قەندەیەکی درێژی هەبوو دەری هێنا و تێی کرد و کەڵەپشکۆیەکیان بۆ خستە سەر و دەستی کرد بە مژ لێدانی. حاجی شێخ عارف و دانیشتووان هەموو تکا لە مودیر ئەکەن تۆزێ لەم ڕەزانەیە کەم کاتەوە. مودیربەگ هەر بە خەیاڵیشیا نایە. میرزا مژ ئەدا لە قەننە و گوێشی بۆ ئەم قسانە ڕاگرتووە، کە سەیری کرد مودیربەگ بە هیچ جۆر هەر بێزی نایە لەگەڵ ئەم خەڵکەدا قسە بکا. دەمی لە قەننەکە بەردا و ڕووی کردە مودیر و وتی: «جەنابی مودیربەگ! مادام جەنابی حاجی شێخ عارف و ئەم هەموو خەڵکە تکات لێ ئەکەن، ئەگەر [قسەکەیان] نەشکێنی گەلێ سەربەرزییە بۆ جەنابت؟» مودیر ئەمجا هاتە قسە و ڕووی کردە میرزا قادر و وتی: «ئەوە تۆ چ کارەیت؟ ئەڵێی گونی منی وا خۆت قوت کردووتەوە دێیتە قسە کردن».

حاجی شێخ عارف و خەڵکەکە زۆر ئەم قسەیان لەبەر گران ئەبێ و بۆ میرزاقادریش دڵگران ئەبن؛ چونکە ئەو پیاوە لەو پیاوانە نەبوو کە قسەی وای دەربارە بکرێ. حاجی شێخ عارف بۆ دڵدانەوەی میرزا قادر ڕوو ئەکاتە میرزا و ئەڵێ: جەنابی میرزاقادر دڵت هیچ نەکا، ئەوە جەنابی مودیر بە گاڵتەوە شتی وا ئەفەرموێ؛ چونکە حەز لە نوکات و قسەی خۆش ئەکا. حاجی شێخ عارف لە دڵیشیا ئەزانێ کە میرزاقادر ئەم قسەیە قووت نادا و وەڵامێکی باشی بۆ ئەدۆزێتەوە.

ئەمجا میرزا قادر بەبێ ئەوەی هیچ خۆی تێك بدا، مژێکیتر ئەدا لە قەننەکەی و ڕوو ئەکاتە حاجی شێخ عارف و ئەڵێ: «یا شێخ! قسەکەی مودیربەگ زۆر جوانی فەرموو، کوا خوا ئەوەی بکردایە من گونی ئەو بومایە بە ڕۆژ لەسەر قنگی خۆی و بە شەو لەسەر قوزی ژنەکەی بوومایە».

مودیربەگ کە ئەم قسەیەی بیست چین‌چین ئارەقی دەردا و هیچ نەهاتە قسە. ئیتر دەستبەجێ بەو شەوە هەڵئەستێ ـ هەر لەگەڵی خەریك ئەبن ـ سوار ئەبێ و ئەگەڕێتەوە بۆ کەرکووك، ڕەزانە و مەزانەی هەموو بەجێ هێشت.

**١٨٠.** ساڵێك «کوێخا نامق» هەبوو، تیلەکۆیی بوو. لەو دەشتی گوێی «شێروانە» خستبوویان. کوڕێکی خوشکەزای هەبوو تەڵاقی خواردبوو. بۆ ئەم مەسەلەیە هاتنە لام لە بەغدا. منیش کوڕێکیترم لابوو، ئەمانە کە لە شێروانە خستبوویان، بەرەجووتێك لە ئاوایی کەلارەوە دوور بوون، لە پاش پرسیار و وەڵامێکی زۆر کوێخا نامق وتی: «بێژم چی؟ ئەم کوڕە نەگوەتیەسی. هەر ماڵمان تۆزێ لەولاترەوە بوایە لە ئاوایی کەلار، هەزار تەڵاقی وا بوایە قنچکێکی نەئەکەوت؛ کەچی وا ئێستا بە ناچاری کەوتگمە شوێنی وە وڵاتانا و یەکێکیش جواوێکی ڕاستم نادا بە دەسەوە».

**١٨١.** محەمەد مەلا شەریف بۆی گێڕامەوە وتی: مەلایەك هەبوو لای ئێمە کتێبێکی دەسنووسی کۆنی گەورەی گرتبوو بە دەستەوە موتاڵای ئەکرد. بە تەواوی تیایا کوڵا بوو. کتێبەکە خۆی بە خەتێکی درشت نووسرابووەوە پەراوێز (حاشیه)یشی هەبوو، ئەو بە خەتێکی زۆر ورد نووسرابووەوە.

پیاوێکیش هەر لەو گوندە بوو، سۆفی حەسەنیان پێ ئەوت. زۆر بەدین و هەموو وەخت هەر لە خزمەت مەلا و فەقێکانا بوو. لەو وەختەدا کە مەلا موتاڵای کتێبەکەی ئەکرد، ئەمیش چوو لە بن‌دەستیەوە هەڵتووتا و سەیری مەلا و کتێبەکەی ئەکرد.

مەلاش لەبەر خەریکبوونی خۆی هیچ ئاگای لەم نەبوو. سۆفی حەسەن لە پاش سەیر کردنێکی زۆر وتی: مامۆستا ئەوە دەزانی ئەو خەتە درشتانە بخوێنیتەوە؟ مامۆستا وتی: ئا. سۆفی وتی: «ئەی کسۆك مەلا». ئەمجا وتی: هەر هەنووکەش دەزانی وردەکانیش بخوێنیتەوە؟ مەلا وتی: ئا. وتی: «ئەی بەراز مەلا». مەلاش هیچ، نقوم بووە و ئاگای لە هیچ نییە!.

**١٨٢.** حوکمەتی عێراق تازە دامەزرابوو، بڵاویان کردەوە کە «ئیمام» بۆ سەرباز ڕائەگرن. چەند مەلایەك چوونە ئیمتحانەوە. یەکێ لە پرسیارەکان ئەوەبوو کە: «عێراق چەند لیوای هەیە؟» مەلایەك هێنای لە وەڵامەکەیا نووسی: «کاك ئەحمەدی شێخ، شێخ عومەری بیارە، شێخ عەبدولقادر گەیلانی، شێخ جونەیدی بەغدادی و... هتد». بەم جۆرە چواردە کەسی نووسی و وتی: «ئەوەندەی ئەولیای تێدایە!».

هەر لەو ئیمتحانەدا یەکێکی‌تر لە پرسیارەکان ئەوەبوو کە: «ڕەوشت و کردەوەی «هارون رشید» چۆن و چی بووە؟».

١٨٣. لەو سەرشیوە شێخێك هەبوو عەمری خوای کردبوو. زۆرتر لە دەروێشەکانی لەو تیرەی «روغانی»یە بوون. هەندێکیان کۆ ئەبنەوە ئەچن بۆ پرسە و کۆڕی شین و شەپۆڕ گەرم ئەبێ و دەروێش لە تاو نەمانی شێخ هەموو حاڵ ئەیانگرێ؛ هەریەکە بە جۆرێك بە باڵای شێخا هەڵئەدەن. پاش زیکر و فیکر و «تەهلیلە»، هەموو دائەنیشن و شێخ کوڕێکی مناڵی ئەبێ، هەموو قسەیان دێتە سەر ئەوە ـ بۆ ئەوە کە شوێن ئاگردان کوێر نەبێتەوە ـ ئەو کوڕەی لە شوێن دانێن.

کوڕە دێنن و مێزەرێکی ئەبەستن بە سەرەوە و لەسەر کەڵپۆستەکەی شێخ دایئەنێن. کوڕ مناڵ ئەبێ و بەوجۆرە خۆی ئەبینێ، ئەکەوێتە قنگەجوولێ و ئەڵێ: من ئەم ئیشەم پێ بەڕێوە نابرێ. زیاتر لە های و هووی دەروێشەکان زۆر دەترسێ، ئەمانیش گەلێکی لەگەڵ خەریك ئەبن و ئەڵێن: نابێ تۆ بەچکە مراویت، [ئەبێ] هەر لە شوێنی باوکت دانیشی و دەروێشەکان بەری بەڕێوە با وەجاخ کوێر نەبێتەوە.

ئەمان زۆر ئەڵێن و ئەم کەم ئەبیەت. دەروێش مارف ناوێکیان تیا ئەبێ ڕیش سپی و دەم سپی هەموویان ئەبێ. تەزبیحی زیکرەکەی بە دەستەوە بوو وتی: هەر ڕاست دانانیشێ؟ ـ ڕۆحم وە فیدای وێ ـ دەسا وە قەورەکەی شێخ، نووزە لە دەمت بێتە دەرەوە ئا ئەو گەماڵە بۆرە ئەنێم وە خۆت و باوکت؛ دەسا بخۆ! لەمە زیاتر زیکرەکەم لێ تێك مەدە، ئیتر بوڕێتەوە. کوڕە کە ئەمە ئەبیەت لە ترسانا نقەی لێ ئەبڕێت.

١٨٤. پیاوێك هەبوو «سەیعەولقادر»ی ناو بوو؛ خەڵکی ئەو وڵاتی دزەیيە بوو. ساڵێك هاتبووە بەغدا بۆ ئیمامەتی لەشکەر. کوڕێکی تریش لە بەغدا هەبوو دووکانی بۆیاغچیەتی هەبوو؛ ئەویش

هەر سەی عەولقادری ناو بوو. نەخوێندەوار بوو؛ خەتی ڕەش و سپی لەیەك نەئەکردەوە. لەگەڵ ئەو سەی عەولقادرەکەی ترا ناسراوییان هەبوو.

ڕۆژێك پۆستەچی کاغەزێك دێنێ کە لە سەرەکەی نووسرابوو: «مەولانا سەید عەبدولقادر». ئەیدا بە دەست ئەو سەی عەولقاری بۆیاغچییەوە، ئەمیش قاقەزەکە ئەدا بە یەکێ بۆی بخوێنێتەوە. پاشان سەیر ئەکا ئەوی لەم قاقەزەدا نووسراوە پەیوەندییەکی بەوەوە نییە. ئەیزانێ کە ئەمە هی سەی عەولقادرەکەی ترە. قاقەز هەڵئەگرێ و کە سەید ئەچێتە لای قاقەزەکەی ئەداتێ.

سەید کە سەیر ئەکا قاقەزەکەی هەڵپچڕاوە پێی ئەڵێ: «لۆ ئەم قاقەزەت هەڵپچرییە؟» ئەویش پێی ئەڵێ: تۆ خۆت ئەزانی من نەخوێندەوارم، پۆستەچییەکە هێنای بۆ من و منیش ناوم سەی عەولقادرە؛ لام وابوو هی منە، دام بە یەکێ بۆی خوێندمەوە. پاشان زانیم هی من نییە و هی تۆیە؛ ئیتر من چووزانم.

ئەویش ئەڵێ: «کوو نازانیت هی تۆ نییە مردیت مرێ؟ تۆ نابێ هەقت ببێ، ئاخر کوو لۆ تۆ دەنووسن مەولانا؟ تۆ کەی مەولانا بوویتە؟ تۆ خۆت و مەولانا لێك ناکەیتەوە؟»».

**١٨٥.** «ساڵح قازی» بۆی گێڕامەوە وتی: موعەللیمێکی وەکوو من هەبوو، ڕۆژێك داوی نابووەوە بۆ چۆلەکە گرتن. دەوروبەری داوەکەی پڕ کردبوو لە دان و خۆی لە دوورەوە لێی دانیشت. چۆلەکەیەکی زۆر لە دەوروبەری دانەکە کۆ بوونەوە و دەستیان کرد بە چینە کردن. وتی: کابرا کەڵەشێرێکی هەبوو، لەو کاتەدا کەڵەشێرەکەش هات و لەگەڵ چۆلەکەکانا دەستی کرد بە دان خواردن. مامۆستا ویستی کەڵەشێرەکە

دەرکا بۆ ئەوە بەڵکوو چۆلەکەکان نزیکی داوەکە بکەونەوە و ببن بە داوەکەوە. بەڵام نازانێ چۆن ئەم کەڵەشێرە دەرکا؛ ئەگەر ئەڵێ کش، چۆلەکەکان هەڵئەفڕن، ئەگەر ئەبزوێتەوە و بەردی تێ ئەگرێ، دیسان هەر لەبەر چۆلەکەکان ڕێ ناکەوێ.

وتی: چاك وایە بە زمانێك قسە لەگەڵ کەڵەشێرەکەدا بکەم کە چۆلەکەکان تێ نەگەن. زمانەکەش ئەمە بوو وتی: «کاف، شین، کاف، شین، کاف، شین، شەك، شەك، شەك».



# گەنجی درەخشان

**١٨٦.** ئەڵێن: دەوری زوو لەو وڵاتی «مادستان»ـە پادشایەکی بەدەسەڵاتی زۆر ساماندار هەبوو. هیچ مناڵی نەئەبوو، بەم بۆنەیەوە شەو و ڕۆژ لە پەژارەدا بوو، هیچ شێخ و پیاوچاك و پزیشکێکی نەهێشت، کەڵکی نەبوو. قەڵەمڕەوەکەشی ڕۆژبەڕۆژ هەر زیادی ئەکرد، بەڵام دڵی ئەو ڕۆژبەڕۆژ تەنگتر ئەبوو.

ڕۆژێـك هەموو ئەستێرەژمێری مەملەکەتی کۆ کردەوە کە بەڵکوو لە ئەستێرەی بەختی ئەوا شتێکی بۆ بدۆزنەوە. ئەستێرەژمێران لە پاش ئەوە کە بە زانایی خۆیان هەموو ئەستێرە گەڕان، شتێکی زۆر سەیریان چاوپێکەوت. قسەیان هاتە سەر ئەوە کە بۆ پادشای نەگێڕنەوە، بەڵام پادشا تەنگی پێهەڵچنین و وتی: هەر شتێکتان دیوە ئەبێ پێم بڵێن. ناچار ئەوانیش وتیان: ئەوەی ڕاستی بێ، پادشاهم لە ئەستێرەی بەختی تۆدا کوڕێـك بەرچاو ئەکەوێ و کوڕێکت ئەبێ؛ بەڵام ئەم کوڕە کە بوو بە تەمەنی حەو ساڵان مار پێوەی ئەدا و ئەمرێ.

پادشا بەمە لە لایەکەوە دڵخۆش بوو کە کوڕی ئەبێ، لە لایەکیشەوە دڵتەنگ بوو کە کوڕی ئەمرێ. وتی: دیسان بۆم سەیر بکەنەوە. ئەستێرەژمێرەکان هەرچەندە کەلێن و قوژبنی ئەستێرەیان پشکنی لەمە زیاتریان بەرچاو نەکەوت. وتیان: پادشاهم لەمە زیاتر هیچیتر نییە. تۆ کوڕێکت ئەبێ و قەزاوقەدەر وای هێناوە کە ئەبێ لەو تەمەنەدا و لە

فلانە کات و وەختا مار پێوەی بدا و بمرێ.

پادشا وتی: خۆ لە حسابی ئەستێرەدا هەیە کە من کوڕێکم ببێ؟ وتیان: بەڵێ، بەڵام قەزاوقەدەر وایە کە ئەبێ بڕوا. وتی: سا من ئەو قەزاوقەدەرە ئەگێڕمەوە و نایەڵم ڕوو بدا.

بەڵێ، لە پاش ماوەیەك وەکوو ئەستێرەژمێران وتبوویان پادشا خوا کوڕێکی پێ ئەدا و لە هەموو قەلەمڕەوی وڵاتا بوو بە ئاهەنگ و زەماوەند و شایلۆغان، شا و شاژن کۆرپەی ئیمڕۆژ و جێنشینی پاشەڕۆژیان نەوەك لەناو دڵی خۆیانا، بەڵکوو لەناو دڵی هەموو مەردمی وڵاتا بە نازی شیر و شەکەر بەخێو ئەکرد. پادشایش ئیتر هەر لەو فیکرەدا بوو کە چۆن ئەم قەزاوقەدەرە بگێڕێتەوە و ئەم جگەرگۆشەیەی بۆ بمێنێتەوە. هەموو ڕۆژێ هەموو دانا و زانا و توانای مەملەکەتی کۆ ئەکردەوە و ئەکەوتنە ڕاوێژ کردن. ئەوان ئەیانوت: قەزاوقەدەر ناگێڕدرێتەوە. ئەم ئەیوت: ئەبێ بیگێڕمەوە. بەم جۆرە شەش ساڵی ڕەبەق تێپەڕی و پێ نرایە ساڵی حەوتەمین.

ئینجا پادشا هێنای لە دەشتێکی پان و فراوانی وەکوو دەشتی «سەرنوێ»دا فەرمانی دا هەموو خۆڵی دەشتەکەیان تا قووڵایی چوار گەز هەڵکۆڵی و خۆڵەکەیان فڕێ دا. شوێنەکەیان بە بلوور و مینا داڕشت. ئەم دەشتە هەتا چاو کاری ئەکرد بەم جۆرەی لێ کرا. پاش ئەوە هێنایان لە ناوەڕاستی دەشتەکەدا چوار کۆڵەکەی زۆر ئەستوور و زۆر درێژیان هەر لە بلوور و مینا داڕشت و بردیان بە عاسمانا. چوار زنجیری ئەستووری بلووریان هێنا لەگەڵ «کەت»ێکی گەورەی داڕژاوی بە تۆراغی بلوور. ئەمەیان بەم جۆرە هەموو ئامادە کرد و هەرچی تیرەنداز و تیر بە دەستی مەملەکەت بوو هەموو کۆ بوونەوە و چاوەڕێی وەخت و سەعات بوون. ئەستێرەکانیان

ئەگرت، حسابی ئەستێرەیان وا گەیاندبوو لە پادشا: ئەگەر لە فلانە دەقیقە و سەعاتا ئەو کورە بپارێزرێ و مار پێوەی نەدا ئیتر قەیرانەکەی بەسەر ئەچێ و هەزار ساڵ لە دنیادا ئەمێنێ.

وەخت نزیك بووەوە و هەتا ڕۆژی قەیران. ئنجا کورەیان هێنا و قووتیان کردەوە و خستیانە ناو کەتەکەوە. زنجیرەکانیان هێنا، سەری هەر زنجیرێکیان شەتەك دا بە یەکێ لە کۆڵەکە بلوورەکانەوە، ئەو سەرەکەیان بەست بە پێچکەی کەتەکەوە و ڕایانکێشا. کەت بەرز بووەوە چوو لە ناوەڕاستی عاسمانەوە ڕاوەستا. تیرەندازان و تیر بە دەستان هەموو خۆیان ڕووت کردەوە و تیر لە کەوانا و هەریەکە دوو چاویان پێوە بوو، بوو بە چوار چاو، سەیری ئەملاوئەولایان ئەکرد. ئەم هەموو ئیشەیان بۆ ئەوە کرد کە نەوەك مار پەیدا ببێ وەیا کوتوپڕ خۆی لە شوێنێ وە یا لە جلوبەرگی یەکێکا حەشار دابێ.

وردە وردە وەختی قەیران هەر ئەهات و نزیك ئەبووەوە و مار لە هیچ لایەکەوە دیار نەبوو. خۆ ئەگەر ماری هەموو دونیاش کۆ ببوایەوە لەوانە نەبوو بتوانێ بگا بەو کورە؛ پادشا و ئەهلی مەملەکەت کەوتنە خۆشی خۆشی و دڵەتەپێی خۆشی کردنەوە؛ چونکە قەیران هەر زۆر کەمی ماوە و مار لە هیچ لایەکەوە دیار نییە. هاتە سەر ئەوە کە نیو دەقیقەی ماوە بۆ بوونی ڕەتبوونی قەیرانەکە. کوتوپڕ لە دوورەوە سەیریان کرد وا حاجیلەقلەقێك ڕووبەڕووی کەتەکە هات و مارێکی بە دەمەوەیە، تیرەندازان و کوتەك بە دەستان و هەموو عالەم شڵەژان. ناڵە و نەوا لە جەرگی فەلەکەوە بەرز بووەوە، تیرەندازان کەوتنە تیر هاویشتن. حاجیلەقلەق نزیك بووەوە و تۆزێکی مابوو بۆ سەر کەتەکە، تیرەندازێ تیرێکی هاوێشت بۆ مارەکە بە دەمیەوە، تیر هیچ سەری نەکرد بە هاژەهاژ

چوو نووسا بە گەرووی حاجی‌لەقلەقەوە. حاجی‌لەقلەق ماری لە دەم بەر بووەوە و مار کەوتە ناو کەتەکەوە و دای بە کوڕەکەوە و کوڕە مرد.

چەرخی زەمانە پێکەنی، قاقا و ئافەرینی کرد لە ئەقڵی بەندەی لاواز و لە دەستی تیرەندازان. پێکەنی بەوە کە گۆیا ویستیان قەدەر بگێڕنەوە، ئافەرینیشی کرد لەو تیرەندازە کە چۆن توانی لەو عاسمانەوە ئەو تیرەی سەر نەکا و بدا لە گەرووی ئەو حاجی‌لەقلەقە.

**١٨٧.** جارێك دوو کابرا لە بەینی دوو شاخا ڕێگری ئەکەن. کاروانچی تووشی ئەبێ بە تووشیانەوە ڕووتی ئەکەنەوە و دێنە سەر ئەوە کە بشی کوژن. کابرا گەلێکیان لێ ئەپاڕێتەوە کە نەیکوژن و هەر شتومەکەکەی لێ وەرگرن و لێی‌نەدەن، بڕۆن. هەتا ئەم زیاتر ئەپاڕایەوە ئەوان زیاتر تووڕە ئەبن. پێیان ئەڵێ: کوڕینە خوا ڕەوای هەقی نییە، لە خۆڕایی بۆچ ئەمکوژن؟ خوا ئەم هەقە ون ناکا و تۆڵەتان هەر لێ ئەکاتەوە.

ئەوان لەم قسەیە ئەوەندەی‌تر شێت‌گیرتر ئەبن. ئەڵێن: تۆڵەی چی و هەقی چی؟ کوا؟ کێ هەیە لەم دەشتە چۆڵە کە بتوانێ هەقی تۆ وەربگرێ؟ ئەمە ئەڵێن و پەلاماری ئەدەن، ئەیکوژن. لەو کاتەدا کە ئەیکوژن دوو کەو لەم‌بەری شاخەکەوە هەڵئەفڕن بۆ ئەوبەری شاخەکە. کابرا ڕوویان تێ ئەکا و ئەڵێ: «کەوەکان، بە شاهێد بن ئەم کابرایانە لە خۆڕایی و بە ناهەق منیان کوشت». ئەمە ئەڵێ و گیانی دەرئەچێ.

چەند ساڵێکی زۆر بەسەر ئەم کارەساتە تێ‌ئەپەڕێ و کابرا وەکوو کوژرا، خوێنی هەروا ڕۆیی. ڕۆژێك ئەو دوو کابرایە کە ئەم چەند ساڵە هەر ئیشیان جەردەیی و پیاوکوشتن بووە، بە میوانی لە وڵاتێکی دوور لەو کوێستانە ڕێیان ئەکەوێتەماڵی ئاغایەك و لە دیواخانا دائەنیشن.

ئاغا زۆر خزمەتیان ئەکا و بە دەوریانا دێت. نایانناسیٚ کە ئەمانە جەردە و ڕێگرن. شەویٚ نان دائەنریٚ و پڵاو و گوشتێکی زۆر دێتە ناوەوە.

کابراکان سەیر ئەکەن وا دوو کەو بە ساغی ئاوەڕووت کراون و سوور کراونەتەوە و لەسەر دەورییە برنجەکە دانراون. یەکێکیان سەیری ئەوی‌کەیان ئەکا و زەردەخەنەیەك گرتی. [ئاغا ئەڵیٚ:] ئایا نانەکە خراپە؟ ئەگەر خراپیش بیٚ ئەبیٚ ببوورن. کابرا ئەڵیٚ: نەوەڵڵا لەبەر ئەوە نییە؛ نان و خوانێکی زۆر ڕێکوپێکە، بەڵام یادگارێك بوو لەبەینی خۆمانا کە ئێستە ئەم کەوانەم چاوپیٚکەوت، ئەو یادگارەم هاتەوە بیر؛ بۆیە پێکەنین گرتمی.

نان خورا و هەڵگیرا، بەڵام کابرای خانەخویٚ ئەو زەردەخەنەی کابرای، هەر لە دڵا بوو بە گریٚ و لە دڵی دەرنەئەچوو. دیسان ڕووی تیٚکردنەوە وتی: فڵانی! زۆر حەز ئەکەم سەمەرەی ئەو پێکەنینەت تێم‌بگەیەنی؛ چونکە من هەروا چووەتە دڵمەوە کە بە نانەکەی من پێکەنیوی!.

کابرای میوانیش کە زانی وایە وتی: «تۆ دڵت هیچ نەکا، کەواتە مەسەلەکە ئەمەیە: من و ئەو هاوڕێیەم چەند ساڵێك لەمەوپێش لەو وڵاتە ڕێگریمان ئەکرد. لە شیوێکا تووشی کابرایەك بووین، ڕووتمان کردەوە و سەرەڕای ئەوە هاتینە سەر کوشتنیشی. کابرا زۆر پاڕایەوە کە نەیکوژین. لەو کاتەدا کە کوشتمان، دوو کەو بەوێدا تیٚپەڕین، ئەوەندە ئەقڵی وابوو، هات ڕووی کردە کەوەکان وتی: کەوەکان ئێوە بە شاهێد بن کە ئەم پیاوانە بە ناهەق من ئەکوژن. کە ئەمەی وت، ئیتر گیانی دەرچوو. ئێستەش کە چاوم بەم دوو کەوە سوورکراوەیە کەوت، ئەو کارەساتەم هاتەوە بیر و بە هاوڕێکەی خۆمم وت: ئەقڵی ئەو کابرایەت بێتەوە بیر کە ئەچوو لەبەر بیٚدەسەڵاتی شتی وەکوو ئەمانەی ئەکرد بە شایەت. ئەگینە

خوا هەقە نان و خوانی تۆ هیچ بێ تفاقییەکی تێدا نەبوو».

کابرای خانەخوێ تۆزێ سەری داخست و پاشان سەری بەرز کردەوە و وتی: «کوڕینە! ئێوە ئەزانن کە کەوەکان شاهێدییان لێ دان؟» وتیان: چۆن؟ وتی: «وا ئەم کەوە سوورکراوانە ئێستە بە منیان وت: کە ئەم دوو کابرایانە لەسەر هیچ و بە ناهەق ئەو پیاوە بێگوناحەیان کوشت و ئێمەش شاهێدین. کەواتە ئەبێ لەخوێنی ئەو پیاوەدا بیانکوژیتەوە و نەیەڵی دەرچن. کابراکان وتیان: چۆن شتی وا ئەبێ؟ ئەمە قسەیەکی کۆن بوو ئێمە گێڕامانەوە، تۆ چۆن ئەبێ بە شتی وا بڕوا بکەی؟ ئەمە هەر دەمەتەقێیەك بوو کردمان.

ئاغاکە وتی: بەسەری ئێوە هیچ چار نییە و کەوەکان شایەتییان لێتان دا و خۆیشتان بە دەمی خۆتان وتتان. خوێنی ناهەق ناڕوا و ستەمی نابەجێ تا سەر نابێ. مەسەلی کوردی خۆمانە ئەڵێ: «زاڵم زەواڵی هەر بۆ ئەگا». وەڵڵا بەسەری تۆ نەیهێشت ڕۆژ ببێتەوە هەردووکی نان بە نیشانی تفەنگەوە. جا ئەمەیە ئەنجامی جەور و ستەمی ناهەق.

**١٨٨.** لە قسەی گوێئاگردانی کوردەوارییە ئەڵێ: جارێك «ئەنەوشیروان» و «بەختەك»ـی وەزیری بە قەراخ شاری «مەدائین»ـدا ئەگەڕان. ئەو سەردەمە ئەنەوشیروان پیاوێکی زۆر ستەمکار و زاڵم بوو، هەموو وڵات و مەملەکەت لەبەر جەوری ئەو بوو بە وێرانە و ئەهلەکەی هەموو تەفروتوونا بووبوون.

ئەڵێ: کە چوونە قەراخ شار، هەمووی کەلاوە و وێرانە بوو. ئەنەوشیروان سەیری کرد بایەقوشێك لەسەر دیواری کەلاوەیەك نیشتووە و ڕووی کردۆتە بایەقوشێکی‌تر کەوا بەسەر دیواری کەلاوەیەکی‌ترەوەیە، کلکی

هەڵئەتەکێنێ و بەسەر ئەویترا ئەخوێنێ. ئەویتریش بەو جۆرە هەڵئەستێتەوە و وەڵامی ئەداتەوە.

بەختەك لە زمانی هەموو جرِوجانەوەرێکی ئەزانی. ئەنەوشیروان رووی تێ کرد و وتی: «بەختەك ئەوە ئەو کوندەپەپووانە ئەڵێن چی؟» ئەویش وتی: شاهم! چیت عەرز بکەم؟ شتێکی وا نییە. وتی: نابێ، هەر ئەبێ پێم بڵێیت. وتی: شاهم ناتوانم عەرزت بکەم. ئەگەر هیچم لێ ناکەی عەرزت ئەکەم. وتی: لە ژێر سێبەری منای مەترسە. ئنجا بەختەك وتی: «قوربان! ئەو بایەقوشەیان داوای کچی ئەویتریان ئەکا بۆ کوڕی خۆی. ئەویش داوای مارەیی لێ ئەکا».

ئەنەوشیروان وتی: جا داوای چی لێ ئەکا؟ وتی: «قوربان، ئەڵێ: ئەبێ سەد کەلاوە بکەی بەمارەیی کچەکەم!». شا وتی: ئەی ئەو چی جواب ئەداتەوە؟

وتی: «قوربان، ئەڵێ ئەنەوشیروان پادشا بێ و بەختەك وەزیر بێ، نەوەك سەد کەلاوە بەڵکوو هەزار کەلاوە بە پوولێك».

ئەنەوشیروان تاسێك بردیەوە و وتی: «چۆن من وام لێهاتووە کە پەلەوەریش لە زوڵم و ستەمم بکەونە قسەکردن و باسم بکەن». ئیتر نەچوو بۆ گەڕانەکەی هەر لەوێوە گەڕایەوە و ئەو ڕا و ڕەوشتەی کەتا ئەو وەختە هەیبوو، هەمووی فڕێ دا و دەستی کرد بە دادپەرستی و وڵات ئاوەدان کردنەوە و زنجیری عەداڵەتی ڕاکێشا و بوو بەو ئەنەوشیروانەی کە پێی دەڵێن: «ئەنەوشیروانی عادڵ».

**١٨٩.** دیسان هەر لە قسەی گوێئاگردانی کوردییە ئەڵێ: کابرایەك لەو دەشتە برِە مەرِێکی هەبوو. یەکێ لە مەرِەکانی لە شەوی

نەورۆزا، زا و بەرخێکی هێنا. کابرا دەستبەجێ کاردێکی هەڵگرت و چووە سەر بەرخەکە سەری ببڕێ. بەرخەکە هاتە زمان وتی: ئەوە چی ئەکەی؟ کابرا وتی: چی ئەکەم؟ سەرت ئەبڕم و ئەتخۆم.

بەرخە وتی: کاکەبرا! تۆ ئەزانی من ئێستە پێم ناوەتە ئەم دنیایە. نازانم دنیا چۆنە و چۆن نییە. هەر ئەوەندە ئەزانم تاریکە. بۆچی دنیا هەر وایە؟ وتی: وا نییە. ئەمە شەوە بۆیە تاریکە. کە کەوتینە ڕۆژ دنیایەکی ڕووناکترە. وتی: کەواتە سەرم مەبڕە با ئەو دنیا ڕووناکەش ببینم. وتی: باشە.

ئەو شەوە لێی‌گەڕا و ڕۆژ بووەوە دنیایەکی ڕووناك هاتە پێشەوە. ئەو ڕۆژەش بەسەر چوو کەوتنەوە شەوێ. کابرا بە خۆی و کاردەکەیەوە چووەوە سەری وتی: وا ڕۆژیش بەسەر چوو کەوتینەوە شەوێ، ئیتر سەرت ئەبڕم.

بەرخەکە وتی: کاکە! بۆچی ئەمە چە وەختێکە؟ کابرا وتی: ئەم وەختە سەرەتای بەهارە و دنیای دڵدارانە. وتی: کاکە تۆ ئەزانی من بەهارم نەدیوە، لێم گەڕێ با بەهار ببینم چۆنە و ئەو وەختە سەرم ببڕە. وتی باشە.

بەهار بەسەر چوو کەوتنە هاوین. کابرا بە خۆی و کاردەکەیەوە چووەوە سەری وتی: ئەوا بەهاریش بەسەر چوو، ئیتر سەرت ئەبڕم. وتی: بۆچی کەوتووینەتە کەی؟ وتی: کەوتووینەتە هاوین. وتی: کاکە! تۆ ئەزانی من هاوینیشم نەدیووە، لێم گەڕێ با سروەی هاوینیش ببینم. وتی: باشە.

هاوین بەسەر چوو، کەوتنە پاییز. دیسان کاردی هەڵگرت و چووەوە سەری. وتی: ئەوا هاوین دوایی هات و ئەبێ سەرت بڕم. وتی: بۆچ ئێستە واین لە چییا؟ وتی: واین لە پاییزا و گەڵاخەزانی پاییزە. وتی: کاکە بە دەروون، تۆ لە من چاکتر ئەزانی کە پاییزم نەدیوە. وازم لێ بێنە با پاییزیشم چاو پێ‌بکەوێ. وتی: باشە.

پاییز بەسەر چوو پێ نرایە زستان. کابرا کاردی هەڵگرت و چوو

بۆلای بەرخەکە وتی: برا ئەوا پاییزیشت چاوپێکەوت و پاییزیش بەسەر چوو. ئیتر سەرت ئەبڕم. وتی: بۆچی ئێستە چ وەختە؟ وتی: وەختی زستانە و کلێڵەی کاوانە. وتی: کاکی بە مۆبەت! خۆ ئەزانی کە من نە زستانم دیووە نە کلێڵەی کاوان. کەواتە لێم گەڕێ با ئەم زستانی تووشەش ببینم. وتی: باشە.

زستان بەسەر چوو کەوتنە شەوی نەورۆز و کەوتنە بەهار. کاردی هەڵگرت و چووەوە بۆلای بەرخەکە وتی: بەرخە! ئەوا زستانیش بەسەر چوو؛ ئێستە چی ئەڵێی؟

وتی: بۆچی کەوتینە چی؟ وتی: کەوتینەوە بەهار. وتی: وەکوو بەهارەکەی پار. وتی: ئا. وتی: بۆچی شتیتر نەماوە؟ وتی: نە. وتی: «کەواتە ئیتر سەرم بڕە. دنیا عیبارەت لە شەو ڕۆژ و چوار وەختە لە بەهار و هاوین و پاییز و زستان. هەر شتێکیتر بەشوێنیا بێت دەور کردنەوەیە و وەنەبێ شتێکی تازە بێت. لەگەڵ ئەوەشا هەر ئەم هەناسەیەیە کە تیایام، ئیشی خۆت بکە و خوات لەگەڵ».

١٩٠. ئەمیر تەیموری گورکانی (٧٧١-٨٠٧ هیجری) گەلێ وڵاتی گرتبوو. مەتەڵێکی لە عالم و زاناکانی ئەو وەختە داهێنابوو کە «خوا ئیشی چییە؟» ئەچووە هەر وڵات و مەملەکەتێك ئەم پرسیارەی ئەکرد و هەرکەس هەر وەڵامێکی ئەدایەوە بە دڵیا نەئەچوو. ئەم پرسیارەی ئەم لە هەموو وڵاتێکا ناوبانگی دەرکردبوو؛ ئەوەیش بڵاوبووبووەوە کە کەس وەڵامی پێ نەدراوەتەوە.

لە پەلامارەکەیا بۆ سەر بەغدا دیارە لە ڕێگەی کوردەوارییەوە چووە. ئەڵێن: لەوێشا کوڕێکی گرتووە و ئەم پرسیارەی کردووە. مەلاکان هەموو

لەرزیان لێ ئەنیشێ. مەلایەك فەقێیەکی بچکۆلەی لا ئەبێ، پێی ئەڵێ: «مامۆستا سبەینێ کە چوویتە دیوان، من لەگەڵ خۆتا بەرە و بە ئەمیرتەیموور بڵێ: ئەم پرسیارە لە من بکا، من وەڵامی ئەدەمەوە». مەلا ئەمەی بەلاوە زۆر سەیر ئەبێ، چونکە هەموو عالمەکانی ئەو دەورە نەیانتوانیوە وەڵام بدەنەوە، ئێستە ئەم مناڵە چۆن ئەتوانێ؟

ناچار مەلا، کە ئەکەونە سبەینێ، فەقیە بچکۆلە لەگەڵ خۆی هەڵئەگرێ و بە ترس و لەرزەوە ئەچێ بۆ بارەگا. بارەگای پادشاهی پڕە لە عالمەکان و لە وەزیرەکان. «سعدالدّین تَفتازانی»یش لەگەڵ ئەمیرتەیموور ئەبێ و لە تەنیشتی ئەمیرەوە دانیشتووە و ئەمیرتەیموور خۆی لەسەر تەختێکی بەرزی پادشاهی دانیشتووە.

مەلا ئەچێتە ژوورەوە، پاشان قسە دێتە پێشەوە و ئەمیرتەیموور ڕوو ئەکاتە مەلا و دانیشتووەکان ئەڵێ: خوا ئیشی چییە؟ مەلا ئەڵێ: پادشاهم پرسیار لەو فەقیە بچکۆلەیە بکە، ئەو وەڵامت ئەداتەوە. پادشا و دانیشتووەکان سەریان سوڕ ئەمێنێ لەم قسەیە کە شتی وا چۆن ئەبێ؟ پرسیارێکی وا کە تا ئێستە هیچ عالمێك جوابی نەداوەتەوە، ئێستە بە مناڵێکی وا چۆن جواب ئەدرێتەوە؟

لە ئاخرا پادشا ڕوو ئەکاتە فەقێ بچکۆلەکە و ئەڵێ: کوڕم تۆیت کە خۆتت ئامادە کردووە بۆ وەڵامدانەوە؟ ئەڵێ: بەڵێ پادشاهم، بەڵام لە پێش پرسیارەکەتا من پرسیارێکت لێ ئەکەم. پادشا ئەڵێ: بیڵێ. فەقێ ئەڵێ: «پادشاهم ئەو کەسەی پرسیاری لێ ئەکرێ لە شوێنی بەرز دائەنیشێ یا ئەو کەسەی کە پرسیار ئەکا؟» پادشا ئەڵێ: دیارە ئەو کەسەی پرسیاری لێ ئەکرێ. ئەڵێ: «کەواتە تۆ هەستە وەرە شوێنەکەی من و من دێمە شوێنەکەی تۆ».

پادشا و دانیشتووان هەموو لەم قسە قوتە سەریان سڕ ئەمێنێ و پادشا قسەکەی ئەچێ بە دڵەوە و هەڵئەستێ لەسەر تەختەکە دێتە خوارەوە و فەقێ ئەچێتە سەر تەخت و ئەم بە چۆکا لە بەردەمیا دائەنیشێ. ئینجا فەقێ ئەڵێ: ئێستە پرسیارەکەت بکە.

پادشا ئەڵێ: «خوا ئیشی چییە؟» فەقێ بەبێ وەستان ئەڵێ: «ئیشی ئەوەیە تۆ لەسەر تەخت دێنێتە خوارەوە و من ئەخاتە سەر تەخت». پادشا و دانیشتووەکان لەم وەڵامە واقیان وڕ ئەمێنێ. پادشا وەڵامەکەی ئەچێتە دڵەوە، هەڵئەستێ ناوچەوانی فەقێ ماچ ئەکا و فەقێ ئەڵێ: پرسیارت تەواو بوو؟ ئەڵێ: بەڵێ. ئەڵێ: «کەواتە وەرەوە شوێنی پادشاهی خۆت و من دێمەوە شوێنی خۆم. من تەنها بۆ ئەوەندە ماوە، شایستەی ئەم شوێنە بووم. لە ئێستە بەدواوە ئیتر شایستەی تۆیە و هەرکە بۆ شتێك دروست کراوە. لە کوردی لای ئێمەدا هەیە ئەڵێ: نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەساب». ئەمە ئەڵێ و هەڵئەستێ دێتە خوارەوە.

ئەمیرتەیموور ئەم قسانەی لە جەرگی وەڵامەکە زیاتر پێ خۆشتر ئەبێ و هەموو عالم و دانیشتووەکانیش ئەیسەلمێنن کە وەڵامەکەی و قسەکانی هەموو لە شوێنی خۆیا بووە و هەموو بەرزی و نزمییەك سەرچاوەکەی ئەچێتەوە سەر خوا.

هەندێك ئەڵێن: ئەم مناڵە وەختی خۆی «سَعدَالدّین»ی تەفتازانی بووە. بەڵام وا نییە. بەڵێ سەعدەدین هاوڕێی ئەمیرتەیموور بووە و زۆر پایەبەرز بووە لەلای. ئەوەندە هەبووە وەختێ کە ئەو بووە بە هاوڕێی ئەمیرتەیموور، پیاو بووە و تا (٧٩٢) هیجری لەگەڵیا بووە و پاشان مردووە.

١٩١. کابرایەك هەبوو لەو سەرە، سامان وماڵەکەی لەوا نەبوو. لە هەموو ئەو وڵاتەدا ناوی دەرکردبوو. لە جووت و بەرەجووت،

لە گوند و ئاواییی، لەرزە و باخ، لە پارە و پووڵ هەڵیدابووەوە، مەگەر خوا بیزانێ. کۆشکێکی دروست کردبوو لەو دەورە و لەو ناوەدا مەگەر هەر کۆشکی پادشاهی وا بووایە. بە هاتوچۆ کردنی نۆکەر و کەنیزەکان و بە پڕمە و حیلەی ڕەوەئەسپان و قەڵەمباز پەستنی توولە و تانجی، بە دەنگی نەوای بولبول و قومری لەسەر چڵی داران و لەناو باخچەی گوڵستانا و بە خوڕەی جۆگەلە ئاوی ناو حەوزی کافووری ژیانی ئەم کابرایە، بووبوو بە ژینی دڵداران؛ بووبوو بەو کەسانە کە لەم دنیایەدا بەهەشتی بەرینیان دەستکەوتووە.

هەر ڕاست لە بن دەستی کۆشکی ئەم کابرایەوە کەوێڵێکی پچکۆڵەش هەبوو کە هی پیاوێکی هەژاری دوور لە هەموو عەنعەناتێکی دنیایی بوو. چوار تۆپەڵە قوڕی خستبووە سەر یەك و بە بەڵم و زەل سەرەکەی گرتبوو، ناوی نابوو خانوو. خۆی و ژنەکەی بە شەو تیایا دەحەسانەوە و بە ڕۆژیش هەر ئەوەندەیان ئیش دەست ئەکەوت کە نانێکی هەرزنیان دەستکەوێ و هیچی‌تر.

ڕواڵەت‌پەرستی دنیا زۆر سەیرە؛ ئاگر و ئاو، ڕەش و سپی، تاڵی و خۆشی زۆر جار لە تەنیشت یەکەوەیە. کۆشکی ئاغا بەو هەموو خۆشی و جوانییە، بەو هەموو خواردن و پۆشینی ڕەنگاوڕەنگ و نازدارییە، پیاو هیچی‌تری لێ نابینێ تەنها کامەرانی نەبێ. کوڵێتی کابرای هەژاریش بەو هەموو خراپی و پیسییە، بەو ڕووتوقوتی و بێ نان و بەرگییە، دیسان پیاو هیچیش لەوا نابینێ تەنها کەساسی و دڵتەنگی نەبێ. کەچی وەکوو ئەم بورجە عاجییە و ئەم زنجە ئاتاجییە لە تەنیشت یەکەوە لە ژێر سێبەری بستێکی عاسمانا کۆبوونەتەوە. لەناو هەردووکیشیانا تاڵی و خۆشی هەر کۆبووەتەوە. نە ئەو بەتەواوی نە ئەمیش بە تەواوی کەوتۆتە

کۆشی کەساسی و ناخۆشییەوە وەکوو ڕواڵەتەکەی خۆی بانگ ئەکا.

هەر لەبەر ئەمەبوو بۆیە ئاغەژنی خاوەن کۆشك بەیانییەك نەبوو لە خەو هەستێ و لە سەرەوە چاوی بە بەژن و باڵای کابرای ڕووتەڵەی ناو کۆڵیت نەکەوێ کە ئەچوو لەناو گۆمە قوڕاوی بەر ماڵەکەیانا لە کاتی مەلا بانگدانا مەلەی ئەکرد و وسڵی ئەکرد بۆ ئەوە نوێژەکەی بەیانی نەڕوا. کەچی مێردەکەی ئەمیش بە دوو حەفتە جارێ ڕێی نەئەکەوتە گەرماوێ و ئەو کۆشکە جوانە کە ئاوەکەی ئەتوت چۆڕی شیرە و ناوەکەی ئەتوت ئاوێنەبەندی دەرگای میرە. هەر نەبوو جارێك ڕێ کەوێ و بڵێ: «نیەتمە بەم ئاوە لەشپیسی لەسەر خۆم لا ئەبەم».

ئەم دوو دیمەنە کاری کردە دڵە ناسکەکەی ژنی ئاغە؛ وەیا ژنی ئاغەی خاوەن کۆشکی فراوانی دڵتەنگ. ناچار ئەمیش ئاگری جگەر هەڵیگرت و ڕووی کردە مێردەکەی وتی: «پیاوەکە! ئا ئەو ژن و پیاوەی کە لە تەنیشتمانەوەن لێفەیان ئاسمانە و ڕایەخیان زەوی. شەو نییە بەبێ شەوچەرەی بووکێنی ڕۆژ کەنەوە و بەیانییەك نییە لەشیان بە ئاوی «کام» تەڕ نەکەنەوە. خۆراکی گەروویان هەرزنە و تەڕایی دەمیان دۆی تورش. کەچی ئێمە بەم هەموو ناز و نیعمەتە و شوێنی دڵگوشا و ماڵ و سامانەوە جارێك نابینم بە هیوای ئارەزوویەکەوە دەستێك لە گەردنی یەك کەین. ئەمە چە ڕۆژێکە و ئەمە چ ژیانێکە ئێمە هەمانە؟»

مێردەکە وتی: «ئافرەت ئەوان وایان بۆ هاتووە، ئێمەش وامان بۆ ئەلوێ. ئەگەر ئەو ناز و نازدارییەی ئێمەی تیاین ئەوانی تیا بوونایە، نەوەك بە مانگێك بەڵکوو بە ساڵێ جارێکیش پێیان ناکرێ ئاوڕ لە شەوچەرەی بووکێنی بدەنەوە».

ماوە، زۆری خایان، پیاو زۆری وت و ژنە کەمی بیست. لە ئاخرا

پیاوەکە وتی: ئەم هەویرە ئاوی زۆر ئەخوا، ئەگەر هەر وا بڕوا ئەم ژنەم ئەکەوێتە دنیایەکی ترەوە. نەوەڵڵا وا چاکە با چاری بکەم.

ڕۆژێك ناردی بەشوێن کابرای هەژاری دراوسێدا و هات، پێی وت: تۆ ئیشت چییە؟ وتی: قوربان، کۆڵکێشی، ئەچمە بازاڕ؛ سا چوار کۆڵ بۆ چوار کەس هەبوو، هەڵیئەگرم و شتێکم ئەدەنێ و دێمەوە و ئیتر شوکری خوا ئەکەم. ئاغەی خاوەن کۆشك وتی: باوکم تۆ هەقی دراوسێیەتیت بەسەر منەوە هەیە، نامەوێ وا ڕابوێری. ها ئەمە سەد لیرە بچۆ دووکانێکی پێ دانێ و پێوە دەست بکە بە کەسابەت و تجارەت. دەستی برد سەد لیرەکەی نایە بەر دەمی وتی: هەروەختیش ئەگەر بووت بمدەوە، ئەگەر نەشتبوو هیچ.

کابرا گەلێ دوعای خێری بۆ کرد و بە دڵێکی پڕ لە خۆشی خۆشییەوە سەد لیرەی هەڵگرت و هاتەوە. ئەو شەوە کەوتە لێکدانەوە، کە چی بکا و چی نەکا و چی بکڕێت و بە چییەوە خەریك بێ؟ لەوانەبوو خەوەکەی لێ تێك چوو؛ گەمەوگاڵتەکەشیان نەکرد. شەوی دوایی هەر بەو جۆرە و سەرباری ئەوەش پەژارە دایگرت کە ئا خۆ ئاخری ئەم ئیشەی بە چی ئەبێ و بەچی نابێ؟ ئەو شەوەش هەر هیچ. بە هەرجۆر بوو بە شەوی سێهەم پووچەڵێك کرا.

لەولاوە ژنی ئاغەی خاوەن کۆشك بەیانیان وەکوو جاران سەرەتاتکێیەتی بزانێ کابرای دراوسێیان لەسەر ئیشی خۆی ماوە. سەیری کرد دوو شەوە بەیانیان مەلە و وسڵەکەی نەماوە. چوو بە مێردەکەی خۆی وت، ئەویش وتی: جارێ هێشتا لە کوێتە و لە کۆیانە.

کابرا لەملاوە ڕۆژی سێهەم چوو هەندێ شتومەکی کڕی و دووکانێکی دانا. کە دووکانی دانا و کەوتە ناو پارە و حساباتەوە، نە شەوچەرەی بووکێنی

لە فیکرا ما و نە خواردن و نوستنیشی بۆ ئەکرا. بەجۆرێك خەریك بوو نە شەوی شەو بوو نە ڕۆژی ڕۆژ بوو. ئەوی لە دڵیا نەهاتایە هەر ئەو ئیشە خێرە بوو. ژنەکەشی جارجار دەستێکی تێوە ئەژەند کە پیاوەکە بۆچ وات لێ هاتووە؟ پیاوەیش ئەوا کەوتۆتە عالەمێکی ترەوە.

ئەمجا ژنەی خاوەن کۆشك چووە لای مێردەکەی خۆی و وتی: پیاوەکە تێم ناگەیەنی ئەمە چە باسێکە؟ جاران ئەمانە وەکوو چۆلەکە وابوون؛ کەچی ئێستە هەزار خۆزگە بە ئێمە. پیاوەش وتی: ژنەکە چیت تێ بگەیەنم؟ ئەمانە لە هەوەڵەوە هیچ شتێکیان نەبوو؛ بەتایبەتی پیاوەکە ئەوی کە فیکر و خەیاڵ خەریك بکا ئەو نەیبوو. هەموو شتێکیان هاتبووە سەر ئەو ئیشە. ئێستە پەژارە و هەڵسووڕاندنی ئەو چوار پوولە کە بە دەستیەوەیە خەریکی کردووە و ئیتر بەسەر هیچیتریەوە ناپەرژێ. ئەمەیە ئیشی دنیا: «ئەوی بانی زۆرترە بەفری زۆرترە». کەواتە پەڕۆیەك لە حاڵی من دادڕە.

کابرای هەژار هەندێ شتومەکی کڕیبوو، فرۆشتبوویەوە، شەوێ لەناو جێگەکەدا کەوتە پەژارەی ئەوە کە ئەمجارە چی بکڕێ؟ ئایا ئەگەر شتێکیتری کڕی تیایا سەر ئەکەوێ یا پارەکەی ئەڕوا؟ ئەم شەوەیان هەر بە جارێ تێك چوو؛ وەختێك بە خۆی زانی گزنگی بەیان لە کلاوڕۆژنەی کۆڵیتەکەوە هاتە خوارەوە. ئەو وەختە هۆشی هاتەوە بەخۆیا. دەنگی نەکرد تا هەتاو کەوت، هەستا سەد لیرەکەی هەڵگرت و چووەوە بۆ لای ئاغەی خاوەن کۆشك و وتی: «قوربان، خوا ڕاوەستاوت کا! ئەمە سەد لیرەکەت و خۆشییەکەی جارانم بدەرەوە!».

١٩٣. «نەوزاد»، لە خانەدانێکی گەورە و بنەماڵەیەکی ناودار بوو. بەپێی ڕۆژ و چەرخ بەرەبەرە لە پلەی خوێندەواریدا سەرکەوت.

هەر بۆ خوێندن ڕووی کردە وڵاتان و دانشگا بەرزەکان. باوکیشی هیچ دریغی لێ نەئەکرد؛ (چۆن دریغی لێ ئەکا ئەو بە سامانی زۆر لە هەموو وڵاتا ناوبانگی دەرکردبوو). نەوزادیش بە زیرەکی و دانایی مامۆستاکانی دانشسار و دانشگاکانی کردبوو بە ئەموستیلەی دەستی. بەم هۆیەوە هەچ خوێندنێك هەبوو نەوزاد تەواوی کرد و هیچ نەمایەوە کە دەستی نەیگاتێ.

ڕۆژانی قوتابییەتی -با زۆر درێژەش بکێشێ- هەر دەوری گەڵاڵەیە. ئەوی بیەوێ پەرە بسێنێ و بکەوێتە ناو دەریایەکی زانایی و فیکرەوە ئەو ڕۆژانەیە کە دەوری دەرز خوێندن لە کۆڵ ئەبێتەوە و خۆی ئەکەوێتە ناو ئەو دەورەوە کە باوەڕی لەسەر نەفسی خۆی بێ و پشتیوانی موتاڵا و کۆششی خۆی، خۆی پێ بگەیەنێ؛ جا هەریەکە لە ڕوویەکەوە و هەریەکە لە قاپییەکانی عیلمەوە.

نەوزاد لەو ڕۆژانەدا کە قوتابی بوو، خوێندنەوەی بێجگە لە دەرسەکانی خۆیشی هەر زۆر بوو. هەموو جار لە کون و قوژبنی کتێب و گوڤار و ڕۆژنامەکانا چاوی بە وشەی کامەرانی (سەعادەت) ئەکەوت و چاوی بەو مانعایانە ئەکەوت کە لە کامەرانییان ئەدایەوە و هەریەکە بە جۆرێ باسی ئەکرد؛ یەکێ ئەیوت: کامەرانی ئەوەیە کە پیاو زانا بێ؛ یەکێ ئەیوت: ئەوەیە کە لەشی ساغ بێ؛ یەکێ ئەیوت: ئەوەیە کە سامانی زۆر بێ؛ یەکێ ئەیوت: ئەوەیەکە پیاو ژن وماڵی بە دڵی خۆی هەبێت. بەکورتی هەریەکە بە جۆرێ باسی ئەکرد و هیچیشیان نەئەگەیشتنە ئەنجام؛ چونکە هەموویان لە ئاخری قسەکانیانا تەگەرەیەکیان تێ ئەخست و کامەرانییەکە تێك ئەچوو.

نەوزاد، ئەم خوێندنەوانە و ئەم جەنگ و هەرای بیر و باوەڕانە وای لێ کرد کە مرخی بپەڕێتە سەر دۆزینەوەی کامەرانی و هەستێ

بچێ بسووڕێتەوە بزانێ کامەیە. خوێندنی خۆی تەواو کرد و سامانی باوکیشی زۆرە، ئەتوانێ بۆ ئەم ڕێگەیە چۆنی بوێ وا بکا. هەستا لەم شار بۆ ئەو شار و لەم گوند بۆ ئەو گوند، دەستی کرد بە گەڕان. زیاتر مەبەستیشی لەم فرمانەیا ئەوەیە بزانێ کامەرانی لای کێ هەیە، تا ئەمیش خۆی بکاتە وەکوو ئەو و بەو خۆشی و ئاسایشە ڕابوێرێ.

سەرەتا ڕێی کەوتە دێیەك لەو کوێستانە، کۆشکێکی گەورەی بەرچاو کەوت. ڕووی تێ‌کرد و چوو لە دیواخانەکەدا دانیشت. دیواخانێکی گەورە گەلێ لە هی ماڵە گەورە جوانتر و خۆشتر بوو؛ پڕ فەرش کرابوو لە قاڵی کاشان، سەماوەری هەشت تەرخان لەولاوە، چەند خزمەتکارێك هەموو بە جلوبەرگی کوردی جوانەوە دەست لەسەر خەنجەر ڕاوەستاوەن و چاوەڕێی فەرمان ئەکەن. دەوری کۆشکەکەش هەموو باغ و گوڵ و دارستانە. نەوای بولبول و قومری و کوترەباریکە لەناو دارەکانا دەنگیان لەگەڵ فریشتەی ئاسمانا تێکەڵاو کردووە.

ئەم دانیشت و زۆری پێ نەچوو، خۆر لە زەردەپەڕا بوو، بەر دیواخانەکە شڵەژەی تێ‌کەوت. کە سەیری کرد وا پیاوێکی کەڵەگەتی هەر زۆر جوانچاك دوو دەستەفیشەکی ڕاوی لە پشتایە و تفەنگەکەشی بەدەستەوەیە (تفەنگی ڕاو) سواری ماینێکی ڕەشبۆرە بووە و چەند سوارێکی‌تری لە پشتەوەیە. دە دوانزە توولە و تانجی بە دەوریانا هەڵقون هەڵقونیانە. چەند دانەیەکیش کەروێشك و مەڕەکێوی سەر بڕاوە و بەسەر وڵاغێکەوەیە.

سواری لاوچاك دابەزی و چەند زەلامێك چوون بە پێشوازیەوە تفەنگ و فیشەکەکەیان لێ وەرگرت و بە ڕوویەکی خۆش و دەمی پڕ لە پێکەنینەوە هاتە دیواخانەوە. تومەس ئەمە ئاغەی وڵات و خاوەنی کۆشکە لە ڕاو بووە و هاتۆتەوە. کە چاوی بە کوڕەی میوان کەوت، کوڕەش

لە سەر و ڕواڵەتا پیاوێکی پیاوانە بوو، نەوازشێکی زۆری کرد و لەوانە بوو وەکوو شەکەر لە بەردەمیا بتوێتەوە. دانیشتن و زۆر بە خۆشی ڕایانبوارد.

کوڕ هەرچەندە سەیری ئەکرد هیچ ناتەواوییەك لە ژیانی ئەم کوڕە ئاغەیەدا نییە و ڕەنگ و ڕواڵەتی بە تەواوی وا پێشان ئەدا کە ئەوەی خەفەت و هۆی ناخۆشی بێ، لە دنیادا توخنی نەکەوتووە.

کوڕە دوو سێ ڕۆژ مایەوە و ڕۆژبەڕۆژ خزمەتی زیاتر ئەکرا و تاپۆی شادمانی لە ئاغادا زیاتر دەرئەکەوت. ئەمیش بە تەواوی کەوتە سەر ئەوە کە کامەرانی ئەوەتە لەلای ئەو پیاوە و لە هیچ شتێکا بە هیچ جۆر ناتەواوی نییە. لە دڵی خۆیا وتی: کە چوومەوە، ئەو جۆرە ژیانە کە ئەم بۆ خۆی ڕێکخستووە من بۆ خۆمی ڕێك ئەخەم و ئیتر دەست ئەکەمە ملی کامەرانی و تا ماوم بەم جۆرە ڕائەبوێرم.

ئەو ڕۆژە، کە ڕۆژی ڕۆیشتنی بوو، دانیشت و لەگەڵ کوڕەئاغادا کەوتە قسە کردن وتی: برا من وەکوو بۆم دەرکەوت لەم چەند ڕۆژەدا تۆ لە هیچ شتێك ناتەواویت نییە و وا دیارە بە ئەندازەی سەری دەرزییەك ئەو شتانە کە ژیان ناخۆش ئەکەن، نەهاتوون بەلای تۆدا. لەم دیدەنییەت کە کردم زۆر سوپاسگوزاریت ئەکەم؛ چونکە خستمتە سەر دۆزینەوەی ڕێگەیەکی شادمانی.

ئاغە بە ڕوویەکی خۆش و لێوێکی پڕ لە زەردەخەنە [هاتە] قسە و وتی: بەڕاستی منیش ئەم چەند ڕۆژە بەهۆی ڕابواردنم لەگەڵ تۆدا هیچ خەفەت و ناگوزوورییەکم هەبوو هەموویم لە فیکر چووەوە.

کە ئەم ڕستەی وت، کوڕە کسپەیەك لە جەرگیەوە هات. وتی: دیارە خراپ تێگەیشتووم. [ئاغە وتی:] داوای ئەوەت لێ ئەکەم کە من و تۆ دوو براین و تا ماوین پێکەوە ڕابوێرین و بەجێم نەیەڵی. کوڕە وتی:

«چۆن؟ بۆچی هیچ شتێك هەیە کە ئەم ژیانە جوانەی من لە تۆوە دیومە تێکی بدا؟ وا داوای مانەوەی من ئەکەی لەگەڵتا بم؟!»

وتی: هەر دەنگ مەکە و مەپرسە، ئەوی من تیایام یاخوا کەس تێیدا نەبێ. ئامۆزایەکم هەیە ئەمە چەند ساڵە لەسەر هەندێ بەرەجووت لێمان بووە بە کێشە و فڵانی دەردم ئەداتێ. سووراوسوور زەوییەکە هی منە و لێی داگیر کردووم. پەلاماری قاپی حوکمەتم دا سەیر ئەکەم ئەو زیاتر تووشی پارە و خەم و خەفەتی کردم. ئەمە چەند ساڵە من بە هاتوچۆی ڕێگەی شار و پارە خەرجکردن لەم ڕێگەیەدا بە تەواوی پشتم شکاوە.

ڕۆژێك لە سەرا چاوم پێ کەوت کۆڵی حەماڵێك قاقەز و دەفتەر لەم ئیشەی منا دروست کراوە، کەچی تازە هێشتا هەر هیچی دیار نییە. ئەگەر بڕوا ئەکەی نرخی زەوییەکانی من گەلێ کەمترە لەم پارانەی تا ئێستە من تیایانام خەرج کردووە. ئەمە بێجگە لە پارەی ئەو هەموو قاقەز و دەفتەرانەیە کە لە قاپی حوکمەتا بۆیان دروست کراون. چونکە خۆ ئەوانەش بە خۆڕایی پێك نەهاتوون، ئەو کاك مەعموورە کە ئەوە ئەنووسێ ئەوەی لەچاپی ئەدا ئەوەی لەم ژوور ئەیبا بۆ ئەو ژوور، ئەو مەرەکەبە، ئەو قاقەزە، ئەو قەڵەمە کە ئەمانەی پێ جێبەجێ ئەکرێ، هەمووی کراوە؛ کەچی من هەر لە شوێنی خۆمم. توخوا برا وازم لێ بێنە دەرد و خەفەت کوشتوومی. ئێستەش ئەم تکایەت لێ ئەکەم کە لەلای من بمێنەرەوە. تۆ برا گەورە و من برا بچووك، دڵم پێت ئەکرێتەوە.

کوڕە وتی: سوپاست ئەکەم بۆ دۆستایەتی و هەستت بەرانبەر بە من، بەڵام من بەشوێن شتێکا ئەگەڕام. سەرەتا لام وابوو لای تۆ دەست ئەکەوێ، کاتێ کە ئێستە سەیر ئەکەم ناز و نیعمەت و کۆشك و دیواخانی

تۆش دوور لەو شتەیە، کەواتە بە دوعا! هەرچەندە کوڕەئاغا تکای مانەوەی لێ کرد ئەم گوێی نەدایە، ماڵاوایی لێکرد و بەجێیهێشت.

ملی ڕێی گرت و وردەوردە ڕووبەڕووی شارێکی جوان بەڕێ کەوت. هاتە ناو شارەکە و دەستی کرد بە گەڕان بەناو بازاڕ و کۆڵانەکانا و چاوی ئەبڕیە ناوچاوی دانیشتووانی ئەو شارە. سەیری هەرکەسی ئەکرد ـ لە گەورە و بچووك ـ بە ئاشکرا بۆکرووزەی جەرگسووتاوی و دووکەڵی پەژارەی ئەچوو بە عاسمانا. کوتوپڕ لە لاکۆڵانێکا تەماشای کرد پیاوێکی ڕیش‌سپی نوورانی دەزگایەکی لە بەردەمایە و پارچە چەرمێك لەولاویەوە و گاز و گازنێك لەملایەوە و جووتێ کەوشەکۆنی بەدەستەوەیە بە دەرزی و دەزوویێك خەریکە پینەی ئەکا و هەر تۆزە نە تۆزێك یەکێك دێت جووتێتری بۆ دێنێت و ئەمیش لێی وەرئەگرێ و بە تەواوی ڕووی گەش ئەبێتەوە.

چوو لە نزیکی ئەم کابرایەوە ڕاوەستا و ئەو ڕۆژە هەر سەرنجی ئیشی ئەم پیاوە و سەرنجی سەر و ڕووە خۆشەکەی ئەم پیاوەی ئەدا. کە کەوتە ئێوارێ، تەماشای کرد پیاوەکە کیسە پارەکەی لە باخەڵی دەرهێنا، دەرامەتی ئەو ڕۆژە سا هەرچەندە بوو، لێکی دایەوە و بژاردی، زۆری پێ خۆش بوو. پاش ئەوە شتومەکەکانی کۆکردەوە، خستنیە هەمانەیەکەوە و دای بە شانیا ڕووەو ماڵ بووەوە؛ ئەمیش شوێنی کەوت. سەیری کرد کابرا ڕووی کردە خانووێکی بچکۆلەی نیوەڕووخاو. ئەو چووە خانووەکە و ئەمیش گەڕایەوە. ئەو شەوە چوو لە مزگەوتێك نوست.

هەموو لە فیکری ڕابواردنی ئەم پیاوەدا بوو کە چەن بە خۆشی و بێخەم و خەفەت ڕائەبوێرێ و وەکوو بڵێیت ئەوەی تۆوی پەژارەیە توخنی ئەو پیاوە نەکەوتووە، وتی: ببێ و نەبێ «کامەرانی» ئەوەتە لای

ئەم پیاوە؛ سبەینێ منیش ئەچم دەزگایەك و چەكوش و گازنێك لەگەڵ پارچە چەرمێکا ئەکرِم و لە لاکۆڵانێکا منیش بۆ خۆم دەست ئەکەم بە پینەچییەتی و بەو دڵخۆشییە کە ئەو ڕایئەبوێرێ، منیش ڕایئەبوێرم.

ئەو شەوە نوست و بەیانی هەستا نوێژی کرد و چووەوە بۆ شوێنی کابرای پینەچی، لەوێ ڕاوەستا. زۆری پێ نەچوو کابرای پینەچی بە خۆی و هەمانەکەیەوە هاتەوە و دانیشت و دەستی کرد بە ئیش‌کردن؛ بەڵام بڵێیت ڕووخۆشییەکەی دوێنێی نەماوە. کوڕە لەمە زۆر سەری سڕ ما، هەستا چوو بەلایەوە سڵاوێکی لێ‌کرد و بە بیانووی ئەوەوە کە کەوشەکانی لەلا پینە ئەکا، لە تەنیشتیەوە دانیشت و هەروا دەستی پێ‌کرد کە باری گوزەران چۆن بەسەر ئەبا؟

کابرای پینەچی دەستی پێ‌کرد و وتی: هەزار شوکر بۆ خوا بەیانیان دێمە سەر ئەم ئیشەم تا ئێوارە، خوا ئەوی کە بە بەشی منی زانیبێ بۆم ئەنێرێ و ئێوارە ئەچمەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆم و خۆم بە شا ئەزانم. ژیانی خۆم بە ژیانی هیچ گەورە پیاوێك ناگۆڕمەوە؛ بەڵام... کە وتی بەڵام ئەم دڵی داخورپا. وتی: ئێ.

بەڵام کوڕێکی فیقنەم هەیە؛ بەلای خۆیەوە لە مەکتەب ئەخوێنێ. لێم بووە بە ئاغەی سەر مانان و بە خانی دیواخانان. بەیانیان کە هەڵئەستێ، هەزار بڕوبیانووم پێ ئەگرێ. سێ چوار جۆرە خواردنی ئەوێ. پارەی گیرفان و قیتەقیتی ناو کۆڵانەکانی ئەوێ. جلی جوانی دەق کراو و ڕۆنی «فوکول»ی سەری ئەوێ. ئەو خەرج و باجەی ئەو لە منی ئەوێ، قەرەنی‌ئاغا لە بایزئاغای باوکی داوا ناکا. ئیتر چاوی لەوە نییە کە من پیاوێکی هەژاری پینەچیم؛ تا دوو قران پەیدا ئەکەم هەزار دەرزی و درەوشە ئەچێ بە دەستما و هەزار کسپە لە جەرگمەوە هەڵئەستێ. چاوی

لەوە نییە کە ئێمە لە ماڵ خێزانبارین؛ ئەگەر هەموو دەرامەتەکەی من ئەو خەرجی کا، خێزانەکە چی بکەن و چی بخۆن؟ سەرباری ئەمانەش کاسە ئەکەوێ لە کەوچك جنێو بەم ئەدا و شەق لەو هەڵئەدا و خێزانی ئەو ماڵە بەدەستیەوە هاتوونەتە زەلالەت. خۆی بە مەکتەبلی و ئەفەندی ئەزانێ. تەماشای کوڕی حەماغای کۆیە ئەکا، تەماشای ئەوە ناکا کە باوکی پینەچییەکە و دەرامەتەکەی بە هەزار شەڕەشەق دوو قرانە.

بەڕاستی برا خەم و پەژارەی کردەوە و خۆنەناسینی ئەم کوڕە مەکتەبلییەم دنیای لێ کردووم بە چەرمی چۆلەکە و بۆیشم ناگێڕێتەوە. ئەوا گیرم خواردووە بە دەستیەوە نازانم چی لێ بکەم. هەموو ڕۆژێ ئاوات بە مردنی خۆم ئەخوازم.

کە کابرا ئەم قسانەی کرد کوڕە وتی: برا کەوشەکانم بدەرەوە من کەوش چاك ناکەم و لە دڵی خۆیا وتی: دیارە کامەرانی سەری بە ماڵی ئەم هەژارەشا نەکردووە لێی دا ڕۆیشت.

لێی دا ڕۆیشت و وڵاتی مامەی پینەچی بەجێهێشت و ڕووەو شارێکی تری گەورەی بە دیمەن بە ڕێ کەوت. شارەکە بە دیمەن بوو، هەر لە دوورەوە دیار بوو کە کۆشکەکانی وەکوو مەنارەی ڕەنگاوڕەنگ لووتیان تەقیبووە بە ئاسمانا. لە دەوروبەری کۆشکەکانا گڵۆپی ئاڵوواڵا ئەدرەوشانەوە. لەناو چیمەنی کۆشکەکانا داری دارعەرعەر و سنەوبەر شانیان ئەدا لە شانی بەرزایی کۆشکەکان. کە چاوی بەم دیمەنە کەوت وتی: بێگومان ئەمانە کە من بەرچاوم ئەکەون، ئەمە هەمووی دیمەنی کامەرانییە و بێگومان خەزنەی خۆم لەم شارەدا ئەبینمەوە.

بە کۆڵی دڵخۆشییەوە ڕووی کردە ناو شار و دەستی کرد بە گەڕان بەناو کۆڵان و شەقامەکانا. دیارە پیاو کە چووە شوێنێك کوێی لێوە دیار بێ و

بەرچاو بێ، ئەو جێگایانە ئەگەڕێ. وەکوو لە دوورەوە دیبووی، کۆشکە بەرزە پەرداخەکان ڕاست بوو، زۆر جوان بوون، شەقامی دەوروبەری ئەم کۆشکانە هەموو پاك و خاوێن و چەوڕێژ و قیرتاو بوون. گەسكدەرەکان بەملاوبەولادا بەخۆیان و بە گەسکەکانیانەوە جرتوفرتیان بوو. دارتەلی کارەبای ئەو کۆڵانە هەریەکە سێ چوار گڵۆپی گەورەگەورەی پێوە بوو.

لەبەر ئەوە ژێر شەقامەکان هەمووی «ڕهەن» بوو، هەر بەینی چەند هەنگاوێ لە قەراخ شەقامەکەوە کون هەبوو مەحەجەری ئاسنی بە سەرەوە بوو بۆ ئەوە ئاوی باران وە یا ئاوی شۆردنی کۆڵانەکان لەوێوە بچێتە لەغەمەکەوە و «میکرۆب» و جڕوجانەوەر دروست نەبێ بۆ دانیشتووی کۆشکەکان.

کوتوپڕ سەیری کرد لەو کاتەدا مەکینەیەك هات دەرمانی جڕوجانەوەر کوشتنیشی بە کۆڵانەکانا بڵاو کردەوە. بەر دەروازەی هەر کۆشکێکیش ئوتۆمۆبیلی تایبەتی خۆی لێ ڕاوەستابوو. خەتی تەلەفۆنیش لە هەموو کۆشکێکا دیار بوو؛ بەڕاستی شارێکی جوانی بەرچاو کەوت. لەوێوە ڕووی کردە شەقامە گشتییەکان و ئەو شوێنانەکە زۆرتر ڕێبازی بێگانان و هەموو کەسێکە و زۆر لە بەرچاوە. تەماشای کرد ئەم شوێنانەش گەلێ گەلێ لە شوێن وڵاتی کۆشکەکان ڕێکوپێکتر و جوانتر و پانتر و پاکوپوختترن. کاخی دایەکانی حوکوومەت ئەوەندە بەرز و ڕێکوپێکن و ئەوەندە تەواو و بەدیمەنن، بەبێ قسە پیاو ئەخەنە سەر ئەو باوەڕە کە ئەمانە پەیکەری عەدل و دادن؛ نەوەك هەیکەلی خشت و ئاسن و چیمەنتۆ.

کوڕە لە بینینی ئەم دیمەنانە، بست بست گەشکەی ئەکرد و لە خۆشیانا ئاگای لە خۆی بڕابوو. هەر هەنگاوی هەڵئەهێنایەوە و ئەگەڕا.

وەختێ لە خەوی دیمەنی جوانپەرستی خەبەری بووەوە خۆی لە

لاکۆڵانێکی تەنگەبەری پیسی پڕ لە چڵکاو و قوڕاوا چاوپێکەوت. خۆی لە شوێنێکا چاوپێکەوت، نازانێ لەبەر پیسایی و بۆگەن چۆن هەنگاو هەڵێنێتەوە و چۆن بڕوا. خانووەکان هەموو وەکوو کۆڵیتی ماڵەدۆم وابوون؛ چرا لەناو کۆڵانەکانا نەبوو. بۆگەنی ئاوی ماڵان کە ئەیانڕشتە کۆڵانەکانەوە، مێشکی پیاوی ئەبرد بە عاسمانا. منالانی زەرد و لاوازی ئەو ماڵانە ئەچوونە ناو قوڕ و چڵپاوەکەوە تا ئەژنۆیان بووبوو بە قیری ڕەش و مێش و مێشوولە دەوری لێ دابوون، بە جۆرێکی وا هەموو خوێنی لەشیان مژیبوون.

کوڕە ئەمانەی زۆر بەلاوە سەیر بوو. وتی: ئەمە چییە؟ من لە کوێوە کەوتمە کوێ؟ بە هەرجۆر بوو خۆی لەو کۆڵانە دەرباز کرد و چووە کۆڵانێکیتر سەیری کرد ئەو خراپتر. وتی: کەواتە با من چاك بگەڕێم. چاکی لێ بەلادا کرد هەموو شارەکە گەڕا؛ ئەو شوێنانە کە دوورن لە ڕێبازی هاتوچۆکەران تەماشای ئەکا یەك لەیەك خراپترن.

تومەس ئەمە لەم شارەدا تەنها ئەو جێگایانە کە لەبەرچاوە و ئەو گەڕەکانە کە شوێنی پیاوە گەورەکانە زۆر بە جوانی تەماشایان ئەکرێ و شوێنەکانیتریش لەناو ئەو پیسایی و بۆگەنەدا ئەتلێنەوە. کە ئەمانەی بەرچاو کەوت وتی: «ئافەرەم عەداڵەت و کامەرانی».

گەڕایەوە بۆ گەڕەکی پیاوماقووڵان. ئەهلی وڵاتی پیاوماقووڵان هەموویان ڕوومەتیان وای پێشان ئەدا، کە لە بەزم و خۆشیدان و هەموو لە کۆشکی کامەرانیدان. لەو کاتەدا کوتوپڕ سەیری کرد پیاوێکی بەدیمەن لە یەکێ لە کۆشکەکانەوە هاتە دەرەوە، هەموو لەشی هەر پێ‌ئەکەنی. لە پێش هاتنە دەرەوەی ئەودا شۆفێرەکە ئوتۆمۆبێلەکەی لە گەراجی کۆشکەکە هێنابووە دەرەوە و دەرگاکەی کردبووەوە. پیاوە بەدیمەنەکە هات و سوار بوو، شۆفێر دەرگاکەی داخستەوە و چوو لغاوی ئوتۆمۆبێلی

گرت بەدەستەوە لێی خوڕی بەسەر شەقامەجوانەکانا.

کوڕەکە دیمەنی ڕەنگ جوان و گۆنای سووری ئەم پیاوەی چووە دڵەوە، وتی: ببێ و نەبێ ئەم پیاوە یا خۆی تاپۆی کامەرانییە و چووەتە پێستی ئەمەوە، وەیان بە لانی کەمەوە بەشێکی زۆری لە کامەرانی هەیە؛ بەڵکوو بچم و ئەم تەلیسمەم بۆ بشکێ.

ئوتۆمۆبێلی بە کرێ بەسەر شەقامەکانا ئەڕۆیشت، ئەویش هەر خێرا بانگی ئوتۆمۆبێلێکی کرد و سوار بوو بە شوێن کابرای گۆنا سووری خاوەن کۆشکا تێی‌تەقان. زۆری نەخایان ئوتۆمۆبێلی پیاوەکە لەبەر کۆشکێکی گەورەدا ڕاوەستا و لێی دابەزی و ڕووی کردە کۆشکەکە. ئەمیش دابەزی و بەشوێنیا ڕۆیشت، مەگەر ئەمە شوێن سەرای حوکمەتە و ئەو پیاوەش پیاوێکی گەورەیە لە حوکمەتا. لە ژوورەکەی خۆی دانیشت.

مایەوە سەر ئەم؛ ئەمیش شڕەبارە و دیمەنێکی وای نییە، چۆن ئەتوانێ خۆی لە پیاوێکی وا گەورە نزیك بخاتەوە. ڕەوشتی ئەم کوڕەش وابوو بیویستایە لەگەڵ هەرکەسێك ببێ بە ئاشنا، لە ڕواڵەتا خۆی ئەبردە پایەی ئەو کەسە.

کابرای پیاوماقووڵی لە ژوورەکەی خۆی دانا و هاتە دەرەوە. بە فڕکانێك چوو لە یەکێ لە کۆگا گەورەکانا دەستێ جلی زۆر نایابی هەڵگرت کە شایانی شا بێ. لەولاوە ئوتۆمۆبێلێکی مۆدیلی ئیمساڵی بە کرێ گرت و پێی وت: بمبە بۆ فڵانەشوێن و لەوێش چاوەڕێم بکە تا دێمە دەرەوە.

گڕ، بە ترۆمبێل لەبەر قاپی سەرادا وەستا و کوڕە دابەزی. فەڕاش و شتەکە چاویان پێ‌کەوت، ڕێگەیان بۆ چۆڵ کرد و سەلامیشیان بۆ ئەگرت.

سەیرتریش ئەوەبوو نەیائەزانی ئەمە کێیە؟ ئەم بەوی ئەوت ئەمە بەگە و ئەو بەوی ئەوت نە؛ ئاغەیە. ئەمیش بە سەربەستی لێی دا ڕۆیشت تا گەیشتە بەردەرگای کاورای زلە. دەرگاوانەکەی ئەویش دەرگای بۆ کردەوە و چووە ژوورەوە.

کە چوو سەیری کرد وا کابرای ئاشنای لەو سەرەوە لەسەر سەنگەڵییەکی ئابابی یایلی دانیشتووە و مێزێکی هەر فرەگەورەی لە داری گوێز دروستکراوی بریقەداری لە بەردەمایە؛ سەرەکەی پڕیەتی لە قاقەز و فایلی و هەڵچنراوە. زەنگەکە بە پشت سەریەوەیە. چوار دەوری ژوورەکە بە مۆبلیاتی جوانی تازە پڕ کراوەتەوە؛ چەند کەسێکیش لەوێ دانیشتوون هەریەکە فنجانێ قاوەیان لە بەردەمایە.

ئەمیش چوو سەلامێکی دایە حازری ـ خوا هەقە ـ هەموویان هەستان. دیمەن و جلوبەرگەکەی ئەم، دیمەنە و جلوبەرگ نەبوو، هەموو کەس شەرمی لێ ئەکرد. ئەمیش دانیشت و قاوەیەکیان بۆ هێنا. کە ئەم چوو بەگەکە خەریك بوو باسی ڕابواردن و ئاهەنگی وڵاتەکانی ئاورووپای ئەگێڕایەوە بۆ میوانەکانی کە چۆنی ڕابواردووە و چۆن هەر شەوە لە شوێنێك ڕۆژی کردۆتەوە. کە قسەکانی ئەگێڕایەوە ئەتوت شەکەر لە دەمی ئەبارێ، شەکرێکی وا کە بە درێژایی زەمان هەر شیرین بێ. کابرای لای خۆمان وتی: «لێگەڕێ پیاوی کامەرانم دەست کەوت و کە چوومەوە منیش ئیتر وەکوو ئەم ئەکەم».

کوتوپڕ زەنگی تەلەفۆنەکە لێی دا. بەگ بەرزی کردەوە و هەڵلاو هەڵلاو، دیار بوو بە قسەکانا کە باسی ڕابواردنی شەوی ڕابردووی ئەگێڕایەوە، ئەمیش دۆستێکیتر بوو کە ئەو تەلەفۆنەی کردبوو. بە بەیاد کردنەوەی ڕابواردنی شەوی، زیاتر لە چارەك سەعاتێ خەریك بوو؛ قاقای پێکەنین

ئەچوو بە عاسمانا.

لەم کاتەدا کە ئەم خەریکی تەلەفۆنەکە بوو فەڕاشەکە هاتبووە ژوورەوە وەستابوو. کە بەگ تەلەفۆنەکەی دانایەوە فەڕاشەکە وتی: «قوربان ئەو پیاوانە لە دەرەوە چاوەڕێی ئەوراقەکانیان ئەکەن کە لە خزمەت جەنابتانایە». هەر فەڕاش ئەمەی وت، بەگ لێی توورە بوو وتی: بچۆرە دەرەوە چاوت لێ نییە میوان دانیشتوون. بچۆ پێیان بڵێ: سبەینێ بێنەوە.

فەڕاشەکە چووە دەرەوە. ئەو لەگەڵ میوانەکان کەوتەوە قسەکردن و تەواوکردنی باسەکەی ئەورووپای. لەو قسانە بووەوە، نەبووەوە، یەکێ لە مێوانەکان لێی پرسی وتی: مەسەلەکەتان لەگەڵ خانەبەگدا چی لێ هات؟

کە ئەو ناوی خانەبەگی هێنا کابرای بەگەی لای خۆمان ڕوومەتە سوورەکەی نەما و ڕەنگی تێك چوو. ئەو کوڕەش بۆیە دانیشتووە چاوەڕێی هەستانی مێوانەکان ئەکا، کە ئەوان بڕۆن و ئەم هەندێ پرسیاری زیاتر ڕوون بوونەوەی کامەرانی لە بەگ بکا. دەستی کرد بە قسەکردن و هەناسە هەڵکێشان. وای لێ‌هات وەکوو لە هەموو ژیانیا کاتێك خۆشی نەدیبێ وا بوو، کەوتە دەردەدڵ کردن.

هەر کەوتە ئەم قسانە کوڕە سەیری کرد وەکوو لە دنیادا لەم کابرایە خەمبارتر و لەمە پەرێشانتر نەبێ وایە. بۆکزەی هەناسەی بەدەست خانەبەگەوە لەوانەبوو ژوورەکە بسووتێنێ. ئەمجا کەوتە گێڕانەوەی ئەو دەردەدڵە و گێڕانەوەی ئەوە کە چۆن شەو و ڕۆژ لە پەژارەی بەربەستکردنی ئەم خانەبەگەدایە.

مەسەلەی خانەبەگیش هیچی‌تر نییە تەنها ئەوە نەبێ مەعموورێکە لە ژوور ئەمەوەیە. ئەیەوێ ئەم لەو شوێنە نەهێڵێ بینێرێتە شوێنێکی‌تر

و سەرەڕای ئەمەش لەوانەیە بووبێ بە هۆی دواکەوتنی تەرفیعەکەشی. ئیتر جا نازانم ئەم ناکۆکییەیان لەبەر چییە؟

کوڕە کە ئەم کەینوبەینەی چاوپێکەوت و ئەو دەردەدڵەی گوێ لێ بوو وتی: «دۆم بە دانیشتن ماڵی وێرانە، با هەستم بچم بەشوێن ئیشمەوە؛ ئەمیشیان فت».

لە شوێنەکەی خۆی ڕاست بووەوە و بەگ پێی وت: «جەنابتان فەرمانێکتان هەبوو؟» وتی: «بەڵێ، بەڵام وەختێکی‌تر بە خزمەتتان ئەگەم. ئێستە مێوانتان هەیە». ئەمەی وت و هاتە دەرەوە و ڕۆیشت. کە لەوێ هاتە دەرەوە لە کردەوەی ناهەمواری ئەو وڵاتە، ئەو شارەی هەر بە تەواوی بەجێ‌هێشت و ڕووی کردە وڵاتێکی‌کە.

ڕووی کردە شارێك وەکوو شاری ئامێدی. سەیری کرد هەر لە دوورەوە منارە بەرزەکەی لەگەڵ ئاسمانا چەپۆکان ئەکا. دیمەنی ئەو منارەیە [سەرنجی ڕاکێشا و] ڕاستەوخۆ چوو بۆ ئەوێ؛ کە نزیکتر کەوتەوە تەماشا ئەکا پۆل‌پۆل خەڵکوخوا ڕوو ئەکەنە مزگەوت. ئەوەندەی‌تر تینوو بوو بە چوونەکە و خێرا خۆی گەیاندێ.

کە سەری کێشا بە حەوشەی مزگەوتەکەوە بینی وا ئەم مزگەوتە بە حەوشە و بەرهەیوان و ژووری مزگەوتەوە جمەی دێ. مەلایەکی ڕیش‌سپی مێزەرێکی لە سەرایە و جوبەیەکی لە بەرایە لەو سەرەوە دانیشتووە و وەعز ئەدا بۆ ئەو عالەمە. وەعزەکەی ئەوەندە خۆش و دڵگیرە عالەمەکە وەکوو پەلەوەر سێبەری بەسەرەوە کردبێتن، بەبێ دەنگ و سەنگ دانیشتوون و گوێی بۆ ڕایەڵن. ئامۆژگارییەکانی وەکوو داشەکانی شەترەنج ئەیسووڕێنێتەوە، دەمێك لە باری ڕۆژی دوایی و ناز و نیعمەت و خۆشی بەهەشتەوە قسە ئەکا، دەمێ لەلایەن کردەوەی

چاکە و دەستووری هەڵسوکەوتی ئادەمیزاد و موسڵمان لە بەینی یەکا ئەدوێ، دەمێ بە نوکاتی شیرین و جوان باسی ڕابواردنی مێژووی پیاوانی ڕابردووە و ڕووی عالەمەکە ئەکاتە خۆی لە مەعبەینی هەرچەند قسەیەکا ئەیباتەوە سەر ئەوەکە دنیا هیچ نییە و پیاو نابێ ئەرك و خەم و خەفەتی هەڵبگرێ، مادام دنیا ماوەی نییە و ئەبڕێتەوە. کەوابوو ئەو چوار ڕۆژە کە پیاو تیایەتی، بە خۆشی و بە فراوانی دڵ ڕایبوێرێ و فەرمانبەرداری خوا بکا بە هەموو ئامانجێکی.

لە ڕاستیدا ئەم قسانە کاری کردە کوڕە و لە عالەمەکەی‌تر زیاتر عاشقی قسەکانی مەلاکە بوو؛ بەتایبەتی کە سەیری ئەکرد مەلا بەدڵێکی پاك و ڕاستەوە قسەکان ئەکا و سەر و ڕوومەتی ئەو گەواهییەی بۆ ئەدا کە خۆی لە هەموو کەس دڵخۆشتر و بێ‌پەرواترە بەرانبەر بە دنیا و بە ئێش و ئازاری دنیا. بە تەواوی هاتە سەر ئەوەکە چەند ڕۆژێك لەم شوێنە بمێنێتەوە و ئامۆژگارییەکانی مەلای نوورانی وەربگرێ و پاشان بچێتەوە بۆ وڵاتی خۆی بەو ژیان و دڵخۆشییە کە ئەم مەلایە ڕایئەبوێرێ، ئەویش بەو جۆرە ڕایبوێرێ. وا دیارە کامەرانی و سەعادەت باڵی بەسەر ئەم مەلایەدا کێشاوە و ڕایەڵێکی مەعنەوی ئەم کوڕەی ڕاکێشاوە بۆ ئەوە کە ئەمیش بێت لەناو دەریاچەی ئەو کامەرانییەدا مەلەوانی بکا.

چەند ڕۆژێك بەم جۆرە کوڕە دانیشت و ڕۆژبەڕۆژ و سات‌بەسات زیاتر شەیدای ڕواڵەت و مەعنەویاتی مەلا ئەبوو. هەموو وەختێ کۆڕی وەعزەکەشی وەکوو پوورەی هەنگ وابوو.

لەپاش چەند ڕۆژ بڕیاری دا کە سبەینێ مەلا و وڵاتی مەلا بەجێ بێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی. ئەو شەوەش بەسەر چوو، سبەینێ وەکوو دەستووری ڕۆژەکانی‌تر چاوەڕێی هاتنی مەلای کرد بۆ سەر کورسی

وەعز بۆ ئەوە ماڵئاوایی لێ بکا و بڕوا. مەلا هەر دیار نەبوو، خەڵکەکە چاوەڕێ ئەکەن مەلا هەر دیار نییە. کوڕە لە نەهاتنی مەلا زۆر عاجباتی هات، تەماشای کرد لەلایەکی حەوشەی مزگەوتەکەوە لە بەردەم یەکێ لە ژوورەکانا مەردم هاتوچۆ ئەکەن و بەپەرۆشن. ئەمیش هەستا و ڕووی کرد بۆ ئەوێ. سەیری کرد وا مەلا لەو ژوورەدا ـ کە ژووری دانیشتنی بوو ـ دانیشتووە و وەکوو بارانی بەهار ئاو بە چاویا دێتەخوارەوە؛ هەناسە هەڵئەکیشێ و فریاد و فوغان ئەکا.

کوڕە کە چاوی بەمە کەوت تاسێك بردیەوە و ئەو تاسە کە تا ئێستە ئەم، ئەم مەلایەی بە کانی کامەرانی ئەزانی، ئێستە ئەم گریان و زاری و پەژارەیە چییە؟ کامەرانی لەکوێ و ئەم فریاد و ئەندۆهە لەکوێ؟

خەڵکەکە دەوریان لە مەلا دابوو دڵیان ئەدایەوە و دڵنەواییان ئەکرد. ئەمیش چوو لەناویانا دانیشت بۆ ئەوە بزانێ چ باسە؟ مەلا بەدەم قەڵپی گریان و جگەری بوریانەوە ئەیوت: «کوڕەکەم کوڕ نەبوو، مایەی بەختیاری و ئارامی گیانم بوو. بەری داری بەرداری هەردوو دنیام بوو؛ هۆی ژیان و بەندی جگەرم بوو. من ئاگام لە هیچ نەبوو ئەو ژیانە چاکە و ڕابوردنە نایابە کە ئێوە ئەتانبینی، ئەمانە هەمووی ئەو بۆی دروست کردبووم. لە بەیانیەوە تا ئێوارە من ئەهاتم بۆ مزگەوت بەبێ ئەوە چاوم بڕیبێتە دەست یەکێك و بەبێ ئەوە بووبێتم بەسەر یەکێکەوە، خزمەتی ڕۆحیاتی موسڵمانانم ئەکرد، ئێوارە کە ئەچوومەوە نان و خواردەمەنی ئامادەیە، جلوبەرگم پاك و پوخت شۆراوە بۆ ئەوە کە بەیانی لەبەری کەم. ماڵ و خێزان هەموو لە جۆشی خۆشی و خۆشگوزەرانی دان، ئەمانە هەموو بەهۆی کۆشش و تەقالای ئەو کوڕەمەوە بوو. ئێستە مردن نەمامی لە باخی جوانیدا هەڵکێشا و دنیای ڕووناکی لێ کردم بە شەوەزەنگی

تاریك. ئیتر بە چیمەوە لەمەودوا بتوانم بمێنم و چۆن ئەو دڵ و سەودایە کە بوومە بمێنێتەوە؟»

ئەمانەی ئەوت و ئەیدا بەسەر خۆیا و ئاو بە ڕیشە سپییەکەیا ئەهاتە خوارەوە؛ ئەتوت بە هیچ جۆر ئەو پیاوەی دوێنی نییە کە ئامۆژگاری خەڵکی ئەکرد و پێی ئەوتن: گوێ بە پەژارەی دنیا مەدەن. ئەتوت بە هیچ جۆر ئەوە پیاوە واعزەکەی دوێنی نییە، کە خەرمانێکی عیلم و زانیاری و هێمنی بوو؛ کەچی ئیمڕۆ وەکوو کەسێك تاقە وشەیەکی عیلم و زانیاری نەزانێت و نەخوێندەوار بێ وا بوو.

کوڕە کە ئەمەی چاوپێکەوت وتی: دیارە من بە هەڵەدا چووم، کە ئەموت کامەرانی ئەمەتە لای ئەم پیاوە و ئەم خۆی کامەران نییە. وتی: ئەمیش هیچ، هەستا بە ناهومێدی ئەو وڵاتەشی بەجێهێشت.

ڕێگاوبان چۆڵ بوو؛ ڕێ کاروان و هاتوچۆ کەران هەموو دەمی بەرەڵا بوو. بەڕێ کەوت ڕووەو شاری دڵنەوایان، ڕووەو ئەو شارە کە دانیشتووەکانی هەموو هەریەکە خەریکی کار و کاسبی خۆیان بوون، بەم هۆیەوە پیاوێکی بێکاری تیا نەبوو. لەبەر ئەوە هەرکەسە بە ئیشی خۆیەوە خەریك بوو، سەری ئەوەیان نەئەپەرژا باسی یەك بکەن و لە پاشملە دەست بکەن بە ناو و ناتۆرە لەیەك هەڵهێنان. چونکە ئەم ڕەوشتەیان نەبوو، خواش پێی دابوون، هەموویان دەوڵەمەند و خاوەن سامان بوون.

وڵات لە وڵاتێکی کامەرانی ئەچوو. دڵخۆشی دەستەڵاتی هەیە بەسەر دیمەن پەرستیدا. ئەگەر دڵ خۆش بوو، کاروباری ڕواڵەتیش ڕێکوپێك ئەبێ. ئەمانە هەبوو بۆیە ئەم شارە لە دیمەنی ڕواڵەتیدا لە هیچ شتێك ناتەواوی نەبوو.

بەو بۆنەوە کوڕە وتی: شوێنهەوارێکی چاکم دیەوە؛ ئەم شوێنە دیارە

بەهاری دوو بەهارە. دەست لە دەست و قوەت لە خوا. خەریکی گەڕان بوو بەناو شاردا سەیری دیمەنە جوانەکانی ئەکرد و سەیری ڕوومەتە گەشەکەی دانیشتووانی ئەم شارەی ئەکرد. کوتوپڕ ڕێی کەوتە گوزەری تجارەتخانە و کارخانەیەکی گەورە. سەرایەکی گەورە بوو، ئەوی پێویستی ئادەمیزاد بێ بە خەروار تیایا هەڵدرابووەوە. کارگەچی و شاگردەکان بەم دەست و بەو دەست شتیان ئەفرۆشت و دراویان وەرئەگرت و بە هیچا ڕانەئەگەیشتن.

لە ناکاو هێمنییەك باڵی کێشا بەسەر گوزەرەکەدا و شاگرد و کارگەچییەکان خەریـك بوون بە فرمانەکەی خۆیانەوە، کە لای کردەوە ئەوا پیاوێکی تۆزێ بەساڵاچوو بۆشناخ لە بەر دەرگای گوزەرەکە، ترۆمبێلەکەی بۆ کرایەوە و دابەزی و هات لەلایەکی گوزەرەکەیەوە - پێپلیکانە بوو- پیایا سەر کەوت و چووە کۆشکی سەرەوە. تۆمەز ئەمە خاوەنی ئەم داو دووکان و دەزگایەیە. چوو لە سەرەوە دانیشت. کوڕە وتی: شوێنی کەوم و ڕازی خۆمی لا دەست خەم.

ئەمیش بەشوێنیا بە پێپلیکانە سەرکەوت و گەیشتە ئەم شوێنە کە ئەم تجارە گەورەیەی لێیە. سەیری کرد شوێنێکی ئێجگار کۆك و ڕازاوەیە. هێشتا نەچووبووە ژووری پیاوەکە، تەماشای کرد دەستەدەستە خەڵك هاتن و باقەباقە دراو و قاقەزیان بەدەستەوەیە.

شوێنی بازرگانی بوو؛ ئەوەندە دەرگاوان و شتە ڕێگەیان بە پیاو ئەگرت ئەمیش هەرچەند کەسی نەئەناسی، بەڵام لە باوەڕی هاتوچۆکەرانی ئەو شوێنەدا ئەمیش ئەبێ یەکێ لەو کەسانە بێ کە فرمانی بازرگانی بەو شوێنە هەیە، بۆیە چووەتە ئەوێ. دیمەنەکەشی هەڵیئەگرت کە وابێ. لەبەر ئەم باوەڕە بە سەربەستی چووە ژووری پیاوە گەورەکە و دانیشت.

بە ڕەوشتی شوێنی تجارەتخانەکان قاوەیەکیان بۆ هێنا و بەدەم قاوە خواردنەوە دەستی کرد بە سەرنجدان.

ژوورەکە زۆر ڕازاوە بوو. مێزێکی گەورە دانرابوو، سەنگەڵییەك لەو دیویەوە بوو، پیاوەکە لەسەر ئەوە دانیشتبوو. لووتی بەسەر میزەکەدا شۆڕ کردبووەوە، خەریك بوو ئیمزای کۆمپیالە و ئەوراقی‌تری ئەکرد کە دەستەدەستە بۆیان ئەهێنا. فنجانێ قاوەشی لە بەردەما دانرابوو لەگەڵ ئاوخۆرییەك ئاوا. دوو تەلەفۆن لەولایەوە بوو، یەکێکیان سەربەخۆ هەر بۆ خۆی بوو، یەکێکیشیان تایبەتی بوو بەخەتی تەلەفۆنی ئەو دایەرە و دەزگا و دووکانەوە. دوو زەلامی‌تر ڕاوەستابوون لە بەردەمیا؛ یەکێکیان ئەو دراوانە کە ئەهێنران ئەو بە ئیمزا لە خەڵکی وەرئەگرت و پەیتاپەیتا ئەیدا بە یەکێکی‌تر بیبا بۆ بانك. ئەوی‌کەشیان دەفتەرێکی بەدەستەوە بوو لەگەڵ چەند دەفتەری چەکێکی نووسراوەدا. دەفتەری چەکەکەی لە بەردەم پیاوەکەدا دانابوو بۆ ئیمزا کردن، سەیری دەفتەری خۆی ئەکرد کە فڵانەکەس ئەوەندە هەزار دینارە، ئەو ئەوەندە هەزار دینارە. لە پەڕەیەکی دەفتەری چەکەکەش نووسرابوو هەر چاوەڕێی ئیمزای چەلەبی بوو، بەم جۆرە ئەم ئەیخوێندەوە و بەرانبەری لەگەڵ چەکەکەی پێ ئەکرد و چەلەبیش ئیمزای ئەکرد. هەر لەم کاتەدا زەنگی تەلەفۆنەکە لێی ئەدا یەکێك بەرزی دەکردەوە، هەڵاوهەڵاو پاش ئەوە ئەیدا بەدەست چەلەبییەوە. لە قسەکانا وا دەرکەوت کە دەنگی وڵاتێکی دوورە و قسە لە بارخانەی ئەو وڵاتەوە ئەکرێ. لە هەمان وەختا زەنگی تەلەفۆنەکەی‌تریش لێی ئەدا. کابرا ئەویشی بەرز ئەکردەوە و چاوەڕێی ئەوەی ئەکرد کە چەلەبی لە تەلەفۆنەکەی‌تر بیێتەوە و ئەم بدا بەدەستیەوە. کە لە ئەم ئەبووەوە ئەمیشی ئەدایە دەستی. ئەمیش بۆ ئیش و کاری گۆشەیە لە

گۆشەکانی تجارتخانەکە قسەی لەگەڵ ئەکرا. هێشتا لەم نەئەبووەوە تەلەفۆنەکەی‌تر لیێی ئەدایەوە. تا بە مانەوە خەریک ئەبوو کۆڵێ چەك و کۆمپیالە و ئەوراقی تاپۆ و زەریبە و بانك لە بەردەمیا بۆ ئیمزا کردن کەڵەکەی ئەبەست. بە کورتی وەکوو گورگی چوار چاوی لێ هاتبوو؛ نەیئەزانی چی بکا.

ئاو و قاوەکەش هەر لەسەر مێزەکەیە نەیخواردۆتەوە. کوڕەش وا هەر دانیشتووە و سەیری ئەم سەرقاڵی و خەریك بوونە ئەکا. کوتوپڕ پۆستەچییەکە کردی بە ژوورا «بەرقیە ـ برووسکەیەکی هێنا. کابرای دەفتەردار لێی وەرگرت و هەڵیپچڕی و خوێندیەوە. لە خوێندنەوەکەیدا ڕەنگی هەڵبزڕکا. چەلەبی گۆشەی چاوی دابوێ، بە حەپساوییەکەوە وتی: «چییە پێم بڵێ؟» بە کزییەکەوە کابرا برووسکەکەی دایە دەستی. لەبەر ئەوە تیایا نووسرابوو «کەشتی ژمارە ٤ کە هی ئێوە بوو پڕی بوو لە فاسۆن و ماوەت، لە سەعات هەشتی بەیانی ئێمڕۆدا لە دەریای سپیدا نقوم بوو».

کابرا سارد بووەوە و بە بێهۆشی هەردوو مەچەکی خستە سەر مێزەکەی بەردەمی و سەری خستە سەری. کشوماتی باڵی کێشا بەسەر ژوورەکەدا.

دەرگاکە کرابووەوە، پیاوێکی ئاوەڵدامەن سپی جانتایەکی بەدەستەوە بوو کردی بەژوورا و هات. بە جلوبەرگەکەیا دوکتۆر بوو. کە تەماشای کرد دنیا کش و ماتە، پرسی: ئەمە چییە؟ یەکێ لە پیاوەکانی بەر مێزەکە بە هێواشی وتی: «فەرموو جارێ دانیشە؛ چەلەبی تۆزێ لە فیکرایە».

لەپاش ماوەیەکی تۆزێ زیاد دەفتەردارەکە چوو هەر زۆر بە هێواشی سەری نایە بناگوێی چەلەبییەوە و وتی: «قوربان وا دوکتۆرەکە تەشریفی هاتووە». چەلەبی بە نیوە مردن و بە ڕەنگ لە ڕوو بڕاوی بە هەرجۆر بوو،

سەری بەرز کردەوە و دەفتەردارەکە دەستی دایە باڵی و هەڵیسان و بردیە ئەولاوە، پشتێنی سەر پاتۆڵەکەی کردەوە. دوکتۆرەکە هات جانتاکەی کردەوە و هەندێ دەوا و دەرمانی تێکەڵاو کرد و کردیە دەرزییەکەوە و لە لاڕانی چەلەبی دا. پاش ئەوە هەندێتر دەرمانی سوورکاری کردە ناو پیاڵەیەکەوە و ئاوی تێکرد و دای بە چەلەبی وتی: فەرموو بیخۆرەوە.

ئاو و قاوەکەی خۆیشی هەر لەسەر مێزەکەیە، هێشتا نەیخواردۆتەوە. دوکتۆر دیسان جانتاکەی تێکدایەوە و دەرمانێکی‌تری گرتەوە و کردیە ناو دەرزییەکی‌تر و ئەوەشی دا لە باڵی چەلەبی. دەرزی یەکەم هی هێز (قوەت) بوو؛ دەرمانی ناو پیاڵەکە هی نەخۆشی مەعیدە بوو؛ دەرزی دووەم هی نەخۆشی شەکرە بوو. پاش ئەمانە قاقەزێکیشی دەرهێنا تۆزێ دەرمانی سپی و وشکی تێکرد، بە ئەندازەی ئەوە کە خۆی ئەیزانی، بە چەلەبی وت: «خواردنی ئەم نیوەڕۆیەشت شۆربای برنج، ئاوی دانەیەك پرتەقاڵی پەنجا گرامییە، پاش خواردنەکەت ئەم دەرمانەش بکە وەناو ئیستکانێ ئاوەوە بیخۆوە».

تومەس ئەم دوکتۆرە هەموو ڕۆژێ ئەمە ئیشیەتی و دوکتۆری تایبەتی چەلەبییە، دێت بۆ دەرمانکردنی ئەم نەخۆشییانەی چەلەبی.

دوکتۆر ڕۆیشت و دەفتەردار لە پاش ئەوە چەلەبی پۆشتە کردەوە، هێنایەوە سەر سەنگەڵییەکەی خۆی. ئاو و قاوەکەش هەر دانراوە، نەیخواردۆتەوە. چەلەبی هاتەوە شوێنەکەی خۆی و هەناسەیەکی پیا هاتەوە. سەرێکی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و وتی: «خوایە! ئەمە حاڵە من هەمە؟»!

کوڕەکە ـکە ئەم کەینوبەینانەی چاوپێکەوت ـ وتی: «یادت بەخێر کامەرانی! وا دیارە لەلای پیاوی وایش دەست ناکەوی». ئەمەی وت و

هەستا ئەوێشی بەجێ‌هێشت.

بەڵێ، ئەوێشی بەجێ‌هێشت؛ نەوەك هەر ئەوێ، بەڵكوو هەر بە تەواوی وڵاتی چەلەبی بە ناهومێدی بەجێ‌هێشت. کاروان بە کاروان چووە شارێکی‌کەوە. ئەو شارە کە زۆری نەماوە شاری کامەرانان وەیا شارستانی شادمانان بێ.

ئەم جارە لەم شارەدا تەنانەت حەمام و کەبابخانەشی نەهێشت، هەمووی گەڕا بۆ ئەوە بەڵکوو تیشکی کامەرانی لە ناوچەوانی یەکێکەوە بەدی بکا. ئەو باوەڕە کە سەرەتا ڕووی کردە شارەکە و چاوی بە چاوەندازی شارەکە کەوتوو، بۆی پەیدا ببوو لە گەڕانەکەیا ئەو باوەڕەی نەهاتە دی. چاوەندازی شار وای پیشان ئەدا کە بێجگە لە خۆشی و کامەرانی، هیچی‌تر لەم شارەدا نەبێ. کە ئەگەڕێت و تەماشا ئەکا تەنانەت حەمامچی و کەبابچیش هەر هەناسە هەڵئەکێشن: ئۆف خوا دەرد!

زۆری نەمابوو شارەکە بەجێ بێڵێ، سەرلەبەیان بوو بەناو یەکێ لە شەقامی گەڕەکەکانا ئەسووڕایەوە، کوتوپڕ دەروازەی کۆشکێك کرایەوە پیاوێکی سەربازی کە نیشانە و ئەستێرەکانی پایەی «عەقید»یان پیشان ئەدا، هاتە دەرەوە. سووك، ڕەنگ گەش، گورجوگۆڵ و چالاك؛ تەماشای هەر شوێن و شتێکی ئەکرد لە خۆشیانا لەرەیەك لە لێویەوە ئەهات، لەگەڵ نیمچە زەردەخەنەیەکدا، لە هەندامیا هەموو لەشی هەر خۆشی بوو، گزنگی هەتاوەکە ئەیدا لە ئەستێرە مشتوماڵ کراوەکانی سەر شانی ئەبریسکانەوە. جلوبەرگەکەی هەر ئەوەندە جوان و پاك و تەمیز بوو مەگەر هەر خوا بیزانێ. جزمەکانی هەر ئەو کاتە بۆیاغی سوور کرابوون، بریقەی ئەهات؛ هاتە دەرەوە.

لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو، زۆر بە گورجی شۆفێرەکە دەرگای گەراجی

کۆشکەکەی کردبووەوە؛ ئوتۆمۆبێلەکەی هێنایە دەرەوە. لەبەر دەروازەکەدا ڕایگرت، ئوتۆمۆبێلی مۆدێلی ئیمساڵ ئەتوت بووکە. دەرگاکەی کردەوە، پیاوەکە هات، چوو لە شوێنی شۆفێرەکە دانیشت و دەستی خستە سەر جڵەوەکە و پێی نا بە بەنزینا. شۆفێر دەرگای پێوەدا و پیاوە خۆی ئوتۆمۆبێلی لێ‌خوڕی و وەکوو تیسکەی تفەنگ بۆی دەرچوو. شۆفێرەکەش لە ناوەوە، دەرگای گەراجەکەی داخستەوە و چووە کۆشکەکەوە.

ئەم دیمەنە کوڕەی شەیدا کرد؛ وای لێ کرد هاتە سەر ئەوە کە ئەم پیاوە نەوەك کامڕەوایە، بەڵکوو هەر تاپۆی کامەرانییە. ئەگەر بەختیاری و کامەرانی ببێ لە دنیادا، لەلای ئەم پیاوەیە و ئەگەر نەبێ ئەوا هیچ.

لە دەوروبەری ئەم کۆڵانەدا هەروا ڕایبوارد تا پاش نیوەڕۆ. سەعات بوو بە یەکی پاش نیوەڕۆ سەیری کرد ئوتۆمۆبێلەکە گەڕایەوە. هەر لە دوورەوە هۆڕنی لێ دا. خێرا شۆفێرەکە لە دەروازەی کۆشکەکەوە دەرپەڕییە دەرەوە، تا ئەم هات ئوتۆمۆبێلیش گەیشتە جێ. دەرگاکەی کردەوە، پیاوەکە دابەزی و چووە کۆشکەکەوە. ئەمیش ئوتۆمۆبێلەکەی بردە گەراجەکەوە.

ئەمجا کوڕە کەوتە سەودای ئەوە کە چۆن خۆی بگەیەنێ بەم پیاوە و چۆن دەمی بگاتێ. بەتایبەتی ئەم پیاوەش پیاوێکی عەسکەری گەورەیە و پێگەیشتن و هاوڕێیەتی لەگەڵیا بەپێی یاسای سەربازی تۆزێ گرانە.

لەو کاتەدا سەری بەرز کردەوە، تەماشای کرد لەسەر دەروازەی کۆشکی ئەمبەری کۆشکی پیاوە عەقیدەکەوە هەر ڕاست بەرانبەر بە هینەکەی ئەو پارچە مقەبایەك هەڵواسراوە و لەسەری نووسراوە: «ئەم کۆشکە بە هەموو شتومەکێکەوە بۆ کرێیە و قسەش لەگەڵ تەلەفۆنی ژمارەی (٢٥٩٧٦) ئەکرێ».

کە ئەمەی چاوپێ‌کەوت وەکوو گوڵ گەشایەوە. ئەجزا خانەیەك

لەسەر کۆڵانەکە بوو، چووە ئەجزاخانەکەوە لەوێ تەلەفۆنی بۆ ژمارەکە کرد و ڕێکەوتن. تەلەفۆنی داخستەوە. زۆری پێ نەچوو ئوتۆمۆبێلێك هات پیاوێکی تیا بوو کلیلی کۆشکەکەی بۆ هێنا و چوون دەرگاکەیان کردەوە. کۆشك هەموو شتێکی تەواو بوو. تازە بۆیاغ کرابوو، باخەکەی جوان و تازە ئاو درابوو، ژوورەکان هەموو پڕ فەرش بوون، هەر ژوورە، کانتۆر و مێزی تەوالێت و جامخانەی کتێبی تیا بوو، لەگەڵ چوارپایەی یابلی فەنتازیدا. ژووری مێوان زۆر ڕێك بوو. مەتبەقەکە پڕی بوو لە فەخفووری و چینی و پێویستی کۆشکێکی وا، هەموو بە ڕێکوپێکی لە «ئۆفی»یەکەدا دانراون. حەمامەکەی ئاڵافەرزەنگی بوو. لەناو ڕاڕەوەکە بە تەنیشت ژووری مێوانەوە تەلەفۆنێك هەبوو.

ئەمانەی هەمووی بەپێی لیستەیەك وەرگرت، ئەمجا دەستی برد دەفتەری چەکەکەی دەرهێنا، چەکێکی بە پێنجسەد دیناری ئێمە بۆ سەر بانکی «ئیستەرن بانك» نووسی و دای بە پیاوەکە بۆ کرێی کۆشکەکە. ئەم پیاوە خزمەتچی خاوەن کۆشکەکە بوو. دەستی برد پێنج دیناریشی بەخشیش دا بەو پێی وت: ئەگەر پیاوەتیم لەگەڵ بکەی چێشتکەرێك و خزمەتچییەکم بۆ پەیدا بکەی زۆر سوپاست دەکەم. پیاوەش سوپاسگوزاری کرد و وتی: تا نیو سەعاتی دیکە هەردووکیانت بۆ دێنم و لێی دا ڕۆیشت. لە ڕاستیدا زۆری پێ نەچوو دوو کەسی هێنا؛ یەکێ چێشتکەر و یەکێ خزمەتچی.

کوڕە تەلەفۆنی هەڵگرت و داوای تاکسییەکی لە یەکێ لە شوێنی ئۆتۆمۆبێلە کرێیەکان کرد و ژمارەی کۆڵان و خانووی دانێ. زۆری پێ نەچوو تاکسی هات. کوڕە دەستووری دا بە چێشتکەر و خزمەتچییەکە و خۆی سوار بوو. بە شۆفێرەکەی وت: «بمبە بۆ شەریکەی ئۆتۆمۆبێلی کادیلاك».

بەدەم ڕێگە ڕۆیشتنەوە دیسان پێی وت: «ئەگەر ئۆتۆمۆبێلچییەکم بۆ پەیدا بکەی پیاوەتیم لەگەڵ ئەکەی». ئەویش وتی: کوڕێکی دۆستی من هەیە شۆفێریکی چاکە و ئەگەر ئارەزوو ئەفەرموون هەر ئێستاکە بۆتانی دێنم. وتی: سوپاست ئەکەم.

زۆری نەبرد چوونە شەریکەکەوە هەقی تاکسییەکەی دا و خاوەن تاکسی چوو بەشوێن شۆفێرا. ئەمیش چوو بۆلای مودیری شەریکە قسەوباسی کڕینی ئوتۆمۆبێلێکی تازەی کادیلاکی مۆدیلی ئیمساڵی کرد و «کەتەلۆک»ـیان خستە بەردەست، لەگەڵ لیستەی نرخا. نەخشەی ئۆتۆمۆبێلێکی جوانی هەڵبژارد و نایە بەردەستی مودیر و وتی: ئەو مۆدیلە. مودیر فەرمانی دا ئۆتۆمۆبێلێکیان هێنایە دەرەوە لە کۆگا. ئۆتۆمۆبێلی چی، ئەتوت پێشەنگی پێشڕەوی قافڵەیە، نرخیش (٢٥٠٠) دینار بوو؛ ئەمیش دەستی برد دەفتەری چەکی دەرهێنا و حەواڵەی کرد بۆ سەر بانکی ئیستەرن بانك.

مودیر وتی: ئەگەر ئارەزووی شۆفێریش ئەکەن لای ئێمە هەیە کە لە خزمەتتانا بێ و... قسەکەی تەواو نەکرد، خاوەن تاکسییەکە هاتەوە کوڕێکی لەگەڵ خۆی هێنا و هات وتی: «قوربان! ئەمە ئۆتۆمۆبێلچییەکەیە ئەوا هێنامە خزمەتتان». ئەمیش وتی: سوپاست ئەکەم و عەزیەتتان بۆ کێشام، ڕووی کردە مودیرەکەش وتی: منەتباری پیاوەتیتانم و لەبەر ئەوە بڕیارم بەم دۆستە دابوو بۆ ئۆتۆمۆبێلچی و ئەویش هێنای ئیتر ئەبێ ئێوە لێم ببوورن.

مودیر وتی: ئێمە ئاسایشی ئێوەمان ئەوێ، ئەم بێ یا ئەو جیایی نییە لە بەینیانا. هەستا و کوڕەی تا بەر دەرگای شەریکە بەڕێ کرد و تەوقەی لەگەڵ کرد، شۆفێر چووە ئۆتۆمۆبێلەوە خستیە گەڕ و دابەزییەوە

دەرگاکەی کردەوە کوڕە سوار بوو، دەرگای پێوە دایەوە و چوو دانیشتەوە و ئۆتۆمۆبێلی لێخوڕی چوونەوە بۆ ماڵەوە. ئۆتۆمۆبێلچی، ئۆتۆمۆبێلی بردە گەراجەکەوە و ئەمیش چووە ناو کۆشکەکەوە.

کوڕە لە دیمەن و ڕابواردنی پیاوێکی گەورەی بنەماڵە چەند ڕۆژێك ڕایبوارد و هەموو ڕۆژێك بەیانی زوو بە شۆفێرەکەی ئەوت: ئۆتۆمۆبێلەکە لەبەر قاپی حەوشەدا ڕاگرێ و چاوەڕێی هاتنە دەرەوەی ئەم بکا. خۆیشی بە بیجامەیەکەوە جارجار ئەهاتە بەر قاپی و سەیرێکی ئۆتۆمۆبێلی ئەکرد و تۆزێ لە باخچەی بەر دەرگا ئاسنەکەدا خۆی خەریك ئەکرد و ئەمجا درەنگێك خۆی کۆ ئەکردەوە و ئەهات سوار ئەبوو. ئەچوو هەندێك ئەگەڕا و لە سەعات دوانزەدا ئەهاتەوە بۆ ماڵەوە. چۆنیەتی دەرچوون و هاتنەوەی لە دەقیقە و سەعاتی دیاریدا وای پیشان ئەدا کە خاوەن ئیشێکی ڕەسمی، وەیا خاوەن تجارەتخانە و بانکێکە.

یەك دوو حەفتەیەك بەسەر ئەم ژیانەیا تێپەڕی. هەموو ڕۆژ عەقیدەکە لە بەیانیا دەرئەچوو بۆ سەربازخانە و لە نیوەڕۆدا ئەگەڕایەوە. ئۆتۆمۆبێلێکی کادیلاکی تازەی لە بەرامبەر کۆشکەکەی خۆیەوە چاو پێ ئەکەوت کە شۆفێرەکە خەریکی پاکەوە کردن و ئامادە کردنیەتی بۆ ئاغەکەی. کاروباری کۆشك و هاتوچۆکەری خزمەتچی لەم کۆشکەدا و بوونی ئۆتۆمۆبێلێکی وا، وای پیشان ئەدا کە پیاوێکی گەورە لەم کۆشکەدا دانیشتبێ. هەر جارەش کوڕێکی گەنجی بەدیمەنی بەرچاوئەکەوت کە بە بیجامەوە لەبەر قاپی حەوشە دەستوور ئەدا بە ئۆتۆمۆبێلچییەکەی، وەیا خەریکی باخەکە ئەبێ. تێگەیشت کە خاوەنی ئەم کۆشکە ئەم کوڕەیە.

ڕۆژێك و دوو ڕۆژ بەم جۆرە، ڕۆژێکیان بەیانی بوو عەقیدەکە هاتە دەرەوە بۆ ئەوە وەختی سەربازخانەی بوو بچێت بۆ ئەوێ، کوڕەکەی

دراوسێی لەبەر قاپییەکەی خۆیانا ڕاوەستابوو. ئیتر ئەم بەلایەوە جوان نەبوو کە هەموو ڕۆژێ ئەم دێتە دەرەوە و ئەو کوڕە لەوێ ڕاوەستاوە و بەتایبەتی بووە بە دراوسێشی، هیچ قسەی لەگەڵ نەکا.

هەرکە هاتە دەرەوە چاوی پێ‌کەوت، تۆزێ لێی نزیك بووەوە و پێی وت: بەیانیت باش. کوڕە بە ڕوویەکی لە گوڵی ئەو باخە گەشتر چوو بە پیریەوە و پێی وت: ژیانت باش و هەروا تۆزێ دەستیان کردە قسە کردنی «مُجامَلە».

ئەم «بەیانیت باش و ژیانت باش»ەی ئەم ڕۆژە قاپی دۆستایەتی لە بەینیانا کردەوە و بوو بەهۆی ئەوە کە کوڕە ئیتر وردەوردە خۆی لێ نزیك ئەخاتەوە. چەند ڕۆژێکیش تێ‌پەڕی و هەتا ئەهات دۆستایەتی زیاتر بەهێز ئەبوو؛ بەڵام هەر تەنها دۆستایەتی قسەی بەر دەرگا.

ڕۆژێك سەعات یەك بوو، عەقیدەکە لە سەربازخانە هاتەوە. کوڕەکە لە بەردەرگا ڕاوەستابوو. کە ئەو دابەزی کوڕە گرتیە قسە و بەدەم قسەوە چوون تا بەر دەرگاکەی خۆیان. ئینجا پێی وت: فەرموو لە پێش ئەوەدا بچنەوە بۆ حەسانەوە، بچینە ژوورەوە شتێکی سارد و قاوەیەك بخۆینەوە. لەبەر ئەوە تۆزێ یەکێتییان پەیدا کردبوو، بێ دڵی نەکرد، چوو لەگەڵیا چوونە ژوورەوە. لە ژووری مێوان دانیشتن. ژوورەکە زۆر ڕێکوپێك بوو، خێرا ئاوی سارد و پاش ئەوە «سینالکۆ» و «کۆکا» و پاش ئەوە قاوەی بەشەکریان هێنا. پاش خواردنەوەی ئەمانە و کەمێك دانیشتن هەڵسا و وتی: ئەچمەوە خۆم ئەگۆڕم و تۆزێ ئەحەسێمەوە. جەنابیشتان ئیسراحەت بکەن دنیا گەرمە. گەلێ لەگەڵی خەریك بوو، بۆ ئەوە دانیشێ پیکەوە نیوەڕۆژە بکەن، دانەنیشت؛ وتی: ئێرە و ئەوێ هیچ جیاییەکیان نییە و ڕۆیشت.

بە کورتی ئەم هاتنەی بوو بەهۆی ئاشنایەتییەکی تەواو. وایان لێهات زۆرتری وەخت لەگەڵ یەکا و لە ماڵی یەکا ڕایانئەبوارد. کوڕەکە تەماشای کرد ئەم عەقیدە ڕابواردن و هەڵسوکەوتێکی زۆر خۆش و ڕێکوپێکی هەیە. کۆشکەکەی جوان و هەموو دەوروبەری باخچە و گوڵە. ژوورەکانی کۆشکەکە یەك لە یەك جوانتر و بەویلێترن. ژووری کتێبخانە جامخانەی کتێبی تێدایە، هەموو جۆرە کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەی تیایە. لەولاوە پیانۆیەك دانراوە، مەیموونێك و بەچکە پشیلەیەکیش هەر جارە دێن پێکەوە یاری دەکەن و دیمەنێکی جوان درووست دەکەن. کوڕە کەوتە سەر ئەو باوەڕە کە کامەرانترین کەس لە ژێر ئەم ئاسمانی شینەدا هەبێ ئەم زابتەیە و ئەوی ناتەواوی بێ ڕووی تێ نەکردووە. وتی: باش بوو تەقەلاکەم ـکە ئەمە چەند ماوەیەکە ئەیدەم بۆ دۆزینەوەی کامەرانی ـ بە خۆڕایی دەرنەچوو؛ پێی گەیشتم.

رایەڵی ئاشنایەتییان زۆر توند و بەهێز بووبوو. هیچ نهێنییەك نەمابۆوە لە بەینی یەکا، کە بۆ یەکی نەگێڕنەوە. ڕۆژێك دانیشتبوون، کوڕە پێی وت: من حەز ئەکەم بزانم تۆ لە دنیادا چ ناتەواوییەکت هەیە و چی هەیە کە هۆی دڵتەنگی تۆ بێ؟ من ئەم ماوەیە بۆم دەرکەوتووە کە لە تۆ بەختیارتر و کامەرانتر بڕوا ناکەم ببێ و ئەوی ڕاستی بێ ئەمەوێ منیش ئەو ڕێگەیەی تۆ گرتووتە، بیگرم.

زابتەکە وتی: چاك دۆزیوتەتەوە. ڕاستە، منیش خۆم وائەزانم کە لە من کامەرانتر نییە. ژیان هەر ئەوەیە کە منی تیام. ڕابواردن هەر ئەوەیە کە من ڕایئەبوێرم، بۆ هەر شتێك وەختێکم داناوە و لە هیچ شتێکا ناتەواویم نییە؛ بەیانیان هەڵئەستم شتومەکی تەراشم بۆ دانراوە، تەراش ئەکەم ئەچم دەست و دەموچاوم ئەشۆم. دێمەوە نان دانراوە و نان و

چا ئەخۆم، جلەکانم شۆراوە و لە ئوتوو دراوە و هەموو پاك کراونەتەوە. جل لەبەر ئەکەم و ئەچم بۆ سەر ئیشی خۆم. نیوەڕۆ کە گەڕامەوە، خۆم ئەگۆڕم و دەست و دەموچاوم ئەشۆم. نان ئامادە کراوە، ئەچم نان ئەخۆم و ئەچم ئەنووم. بە ئەندازەی دوو سەعات ڕائەکشێم، ئیسراحەت ئەکەم. کە هەستام ئەچم خۆم ئەشۆم، چا ئەخۆمەوە، پاش ئەوە ئەو مەیموون و پشیلەیە دێنم تۆزێ یاریم بۆ ئەکەن. پاش ئەوە هەندێ پیانۆ لێ ئەدەم و مەیموون و پشیلەکەش بە دەنگی پیانۆکە ئەکەونە سەما. کە تۆزێ لەوە تاقەتم چوو، ئەچم هەندێك لەگەڵ باخەکە خۆم خەریك ئەکەم. پاش ئەوە ئەچم سوار ئەبم، ئەچم هەندێکیش ئەگەڕێم و ئەچم بۆ سینەما و دێمەوە. کردوومە بە ڕەوشت دوو سەعات خەریکی خوێندنەوەی کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤاریش ئەبم. پاش ئەوە جێگەکەم بۆ ڕاخراوە ئەچم ئەنووم.

کوڕەش وا بە دڵ گوێی بۆ ڕاگرتووە و کات‌بەکات گەشکە ئەیگرێ لەم ڕابواردنە.

وتی: پارەیەکی زۆرم هەیە لە بانکا. مانگانەکەشم زۆرە ئەم کۆشکە هی خۆمە، خانووبەرە و موڵکی‌تریشم هەیە. ئۆتۆمۆبێلم هەیە، ئەمانەم هەموو هەیە، بەڵام...

هەر لەگەڵ وتی بەڵام کوڕە کسپەیەك لە دڵیەوە هات و هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و وتی: «ئەم ڕەنجەشم بە هیچ دەرچوو». وتی: ئێ. وتی: بەڵام شەو و ڕۆژ لە پەژارەی ئەوەدام کە فەرزەندێکم نییە پاش خۆم ئەم ماڵ و موڵکەی بەرکەوێ و نەکەوێتە بەردەست ئەم و ئەو و میری.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ژنم نەهێناوە و ژنم نییە تا منالم ببێ. وتی: چۆن؟ بۆچی ژنت نەهێناوە؟ وتی: نەمهێناوە. ئەمەش داستانێکی هەیە. وتی: «توخوا برا ئەوەشم بۆ بگێڕەوە». وتی: من باوکم دەوڵەمەند بوو،

خستمیە قوتابخانە و پێی خوێندم. بەرەبەرە سەرکەوتم و چوومە دانشگای جەنگەوە. ئەویشم تەواو کرد و دبلۆمم وەرگرت و بە ملازمی دووەم دەرچووم. تا ئەم ماوەیە باوك نەما و هەندێ خزم و کەسوکارمان هەبوو هەموو سامانەکەیان لەناو دا. من جۆشی گەنجیم بوو، پێویستم بە سامانی باوکم نەما. مانگانەکەم بەشی ئەکردم. لەناو سەرخۆشی هەرزەکاریدا ئەتلامەوە و ڕامئەبوارد تا بووم بە ملازمی یەکەم هەر سەرخۆش بووم. لە پاش چەند ساڵێکیتر بووم بە ڕەییس. لەم وەختەدا فیکری ژنم کەوتە سەر. ئەوەندە هەبوو وتم: من هێشتا دەمەدەمی جوانیمە و هەر لە ئێستەوە ژن بێنم باشە؛ بەڵام لە کوێی دانێم؟ چاك وایە با جارێ لێی گەڕیم تا شوێن و خانوویەکم ئەبێ. کەوتمە سەر ئەم فیکرە و وازم لە ژنهێنان هێنا و خۆمم بەم هیواوە خەریك کرد. پاش ماوەیەك بووم بە ڕەئیسی یەکەم و لە ڕاستیدا لە پارەی مانگانەکەم ئەوەندەم بۆ دوا کەوت کە خانوویەك دروست بکەم. خانووم کرد و ئەو وەختە وتم: من ڕەئیس ئەوەڵێکم، ئێستە بچم کچێك بێنم و لە خانوویەکی ڕەقوتەقا داینێم و هاوسەرەکانی من هەموو ئۆتۆمۆبێل و هەموو هۆیەکی ڕابواردنیان هەیە. ئەگەر من نەمبێ شوورەییە بۆم. چاك وایە با ڕاوەستم تا ئۆتۆمۆبێل و ئەو شتانەشم ئەبێ.

لە خولیای ئەم فیکرەدا مامەوە تا بووم بە «مقدم». لەم ماوەیەدا ئۆتۆمۆبێلم کڕی و هەموو جۆرە شتومەکێکی ماڵم ڕێك خست. ئنجا کەوتمە سەر ئەوە وتم: ئەوا من ئێستە هەموو هۆیەکی ڕابواردنم تەواوە، بەم پێیە ئەچم کچێك دێنم و بە جۆرێکی «ارسطوقراتی» لەگەڵی ڕائەبوێرم و پەکم لەسەر هیچ ناکەوێ؛ بەم ژیانەوە فێر ئەبم. لە پاش دوو ڕۆژ هاتو لە ئیشەکەم دەریان کردم، ئەو وەختە هیچ شتێك نییە

کە من پێوەی بژیم و فێری جۆرە ژیانێکیش بووم کە وەنەبێ بە سووکی هەڵسووڕێ. ئەو وەختە کەنەفت ئەبم و لەناو خەڵکا ئابڕووم ئەچێ. کەواتە ناوەڵا با ماوەیەکی‌تر ڕاوەستم تا ئەبم بە عەقید.

لەم ماوەیەدا ئەوەندەم ئەبێت ئەگەر هاتو لە پاش ئەوەش ئیشەکەی خۆمم لەدەست دەرچوو، بە دەرامەتی پاشکەوتەکەم وەکوو جاران ئەژیم. لەبەر ئەوە وازم لە ژن هێنا و پارەشم ڕۆژبەڕۆژ زیادی ئەکرد. ئەوەندەم سامان بۆ پێکەوە نرا کە چەند خانووبەرەیەکم کڕی و هەمووم دا بە کرێ و ئێستەش سەرەڕای ئەوە پارەیەکی زۆرم هەیە و لە بانکدایە، دەرامەتی ئەوەش خۆی سەربەخۆ ساڵانەیەکی زۆرە. پایەکەشم ئەوا ئێستە عەقیدە و لە هیچ شتێك ناتەواویم نییە؛ بەڵام تەمەنی ئەو کچەی کە من لە دەورێکا ملازمی دووەم و یەکەم بووم و جۆشی جەحێڵیم بوو، لەگەڵ منا ئەگونجا و مایەی ڕابواردن بوو. ئەو تەمەنە و ئەو جۆرە کچە پێم قایل نابێ و لام لێ ناکاتەوە. دەوری جوانیم دەورێك بوو ئەگەر نانی شەویشم نەبوایە، خەرامانی چینیشم پێوە دائەنیشت، ئێستە کە دەوری پیرییە ئەگەر هەموو گەنجی دنیاشم بێ هیچ تامێکی نییە و ئەو دڵخۆشییەی جارانی نییە. لەبەر ئەمانە ئەوا بۆ خۆم کەوتوومەتەوە و خەفەتی ئەم غایەڵەیە بووە بە خۆراکی شەو و ڕۆژ و ئەوی پێی بڵێن ڕووناکی سەری بە دڵی منا نەکردووە. ئەو دیمەنە ڕواڵەتییەم کە ئەیبینی، ئەوە دیمەنێکە وەکوو دیمەنی گوڵی ژاڵەیە. لە دوورەوە ئاڵە و لە ناوەوە بێ‌بێن و تاڵە. چارناچار دێنم هەر کاتە ناکاتێك خۆم بە شتێکەوە ئەخلافێنم و دەستی خۆم بەوە ئەبڕم؛ کەچی لەو کاتەشا و تەنانەت لە کاتی نووستنیشا بەبێ هەست و ئیختیار هەر بەینە نابەینێك دڵم خورپەیەکی لێوە دێت و ژیانی تاڵ و ترشی خۆمم ئەخاتەوە فیکر.

کوڕە کە گوێی لەو قسانە بوو، بە جارێ چووە تاسەوە و لەم دنیا ڕووناکە کەوتە دنیایەکی ترەوە. تا ئێستە وای ئەزانی کە باشقەی کامەرانەکانی هەموو سەرزەوی دیمەنی ئەو پیاوەیە کە بە خەوی شەویش بۆنی خەم و خەفەتی نەکردووە؛ کەچی ئێستە کاتێ سەیر ئەکا کلۆڵتر کەسێك و بە جەزرەبەتر کەسێك لەم ژێر ئاسمانەدا بیێ ئەو کەسەیە کە ئەو لێی بە هەڵە چووبوو. دەردی مەردمی تر هەر دەردێك بوو، هی ئەم دووە.

لە پاش ئەوە کە لەم کەینوبەینە تێگەیشت، ڕووی تێکرد و وتی: برا من بەشوێن شتێکا ئەگەڕام کە لام وابوو ئەو شتە تەنها لەلای تۆ دەست ئەکەوێ. هەر لەبەر ئەوە بوو کە من هاتم ئەم دەزگا و دووکانەم بۆ خۆم پێکەوە نا و خۆم کرد بە هاوماڵی تۆ. ئێستە وەکوو بۆم دەرکەوت ئەو شتە لای تۆیش دەست ناکەوێ. کەواتە ئەمە ئاخر ماڵئاواییە کە لێت ئەکەم و ئیتر بە دوعا. هەستا هاتە دەرەوە ئەو کۆشك و خزمەتچی و ئۆتۆمۆبێل و شتانە ـ کە ڕێکی خستبوون ـ هەموویانی تێك دا و ئەو وڵاتەشی بەجێ‌هێشت و ڕووی کردە بەغدا.

ملی ڕێی گرت و ڕووی کردە بەغدا. بیستبووی کابرایەك لەوێ هەیە «عەلائەددین سەججادی» پێ ئەڵێن و وای بەرگوێ کەوتبوو کە کابرایەکە گوێ بە کەس نادا و گزیرێك و وەزیرێکی بەلاوە وەکوو یەك وایە. گۆیا لای لە عەنعەناتی دنیا نەکردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەشا دەستی ئەڕوا، دیارە هەر شتێك وترا وەنەبێ وابێ. کوڕە وا چووبووە دڵیەوە کە ئەبێ کامەرانی لەلای ئەو دەستکەوێ، بۆیە وا ئەو ڕێگەیەی گرتووە.

بە پرسیار چوو، ها لێرە، ها لەوێ، دیەوە. کوتوپڕ تەقی بە لووتی قاپییەکی بچکۆلەوە. لەسەر قاپییەکە نووسرابوو: ئەمە مزگەوتە. چووە حەوشە بچکۆلەکەوە. لەوێوە چووە ژوورێکەوە لەبەر تاریکی، چاو چاوی

نەئەبینی. پرس و ڕای پێ ناوێ کورسییەکی شرە هەبوو لە ژوورەکەدا چوو لەسەر کورسییەکە دانیشت. ناچار بوو دانیشێ، چونکە سرمیچەکە ئەوەندە نزم بوو ئەبوایە سەری دانواندایە؛ ئەگینا نەیئەتوانی بە پێوە ڕاوەستێ. کە دانیشت، تۆزێ بەرچاوی ڕووناك بووەوە کتێبخانە و کتێبێکی نە زۆر کەم و نە زۆری بەرچاو کەوت. لەبەر بێ جێگەیی کتێبخانەکە زۆر ناڕێکوپێك بوو. هەندێکی بەسەر ڕەفەکەوە بوو تا سرمیچەکە چووبوو، تۆز سەری گرتبوو. مێزێك دانرابوو، ئەویش سەرەکەی پڕی بوو لە کتێب و قاقەز و قەڵەم، بەڵام ناڕێك و ناهەموار. کورسییەکی شڕ لە بەر مێزەکەدا دانرابوو سەر ئەو کورسییەکەش پڕبوو لە قاقەز و ڕۆژنامە و گۆڤار؛ جێگەی دانیشتنی زەلامێك بە سمرسمر لەسەر کورسییەکە کرابووەوە. لەناو قاقەز و ڕۆژنامەکانا کابرایەکی دەستەپیاوی لێ دانیشتبوو دشداشەیەکی لەبەرا بوو. سەری ڕووت بوو، گوێچکەی خەتی «تەلەفۆن»ێکی بڕاویشی لە تەنیشتیەوە دیار بوو.

کابرا کە چوو سەری کرد بە ژوورەکەدا هیچ نەچووە دڵیەوە کامەرانی بوێری سەر بکا بە شوێنێکی وا تاریکی بۆگەنی دوور لە هەموو ناز و نیعمەتێکەوە؛ بەڵام تووش بووبوو تازە تێپەڕیبوو، ئەوەی بەبیرا هات وتی: «دەنگی دەهۆڵ لە دوورەوە خۆشە!».

دیارەکە چوو سەلامێکی کرد و لە پاش دانیشتن کابرای ناو، قاقەزجگەرەیەکی دایە و بەخێرهاتنی کرد، ئەمیش هەروا بە حەپەساوییەکەوە پرسیاری لە عەلائەددین سەججادی کرد. کابرای دانیشتوو بە زەردەخەنەیەکەوە و بە ڕوانینی چاوێکەوە کە پڕ بوو لە هەستکردنی تێگەیشتنی ئەو کە ئەم میوانە بە هەڵەدا چووە، وتی: «فەرمانت چییە بە عەلائەددین سەججادی و بۆچیتە؟» ئەویش وتی: ئیشم پێیەتی و ئەمەوێ ببینم.

کابرای دانیشتوو وتی: ئەگەر زۆر بە پەرۆشی بۆ بینینی، ئەو کابرایە کە گوێ زرنگانوویەتەوە ئەوەتە لە بەردەستتایە؛ فەرموو ئەمر کە!

کوڕەکە گوێی لەو قسەیە بوو، لەو کاتەدا بە دەستی تۆزێ چاوەکانی هەڵگڵۆفت و بە سەرسامییەکەوە تیژتیژ هەردوو چاوی بڕییە کابرای دانیشتوو، وەکوو بڵێیت حەپەسا. پاشان وتی: «بۆچ جەنابتی عەلائەددین سەججادی؟» ئەویش وتی: بەڵێ. وتی زۆر سەیرە، ئێستە بە تەواوی باوەڕم هاتە سەر ئەوە کە دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە و ئێستە بە تەواوی باوەڕم بە ناتەواوی ئەقڵی خۆم هێنا کە ئەمەوێ لە شوێنێکی وادا کامەرانی بدۆزمەوە.

دەورییەك هەندێ تووتنی تیا بوو، لەگەڵ چەند پەڕەیەك قاقەزی بافەرە لەسەر مێزەکە دانرابوو. کابرای دانیشتوو دەستی برد لە پاکەتێك ـکە ئەویش هەر لەسەر مێزەکە بوو- جگەرەیەکی تری دا بە کوڕەکە و خۆیشی دەورییە تووتنەکەی هێنا سیگارێکی بۆ خۆی پێچایەوە و بەدەم پێچانەوەی سیگارەکەوە هەر ئەیوت: «ئێ کامەرانی». کە سیگارەکەی تێکرد، پێنج شەش چەرخ (فەنەك)ی بەنزینی لەسەر مێزەکە بوو لەگەڵ ئەوەشا کە تازەبوون و هەموو شتێکیان تەواو بوو، دەستی دایە هەرکامێکیان هەڵنەئەبوون و هەر ئەشی وت: «بەڵێ، کامەرانی. ئێ، کامەرانی. کاکم کامەرانی ئەوێ».

ئەو بە هەر شەڕەشەقێك بوو سیگارەکەی داگیرساند و بە گۆگردێکیش جگەرەی کوڕەکەی داگیرساند و سەر و نەفەسیان لێ دا و ئەمجا ڕووی کردە کوڕەکە وتی: فەرموو قسە بکە.

کوڕەش جارێ هەر تاس بردوویەتیەوە. وتی: قسەی چی بکەم؟ هیچم پێ نەماوە تا قسە بکەم! ئەمە چییە و چ ژیانێکە تۆی تێدای؟ ئەوەی

بیستوومە لە بارەی ژیانی تۆوە وا دیارە هیچی وا نییە.

کابرا، وە یا عەلائەددین سەججادیش تێگەیشتبوو کە ئەو کوڕە چی ئەوێ؟ پێی وت: شوێن کامەرانی کەوتووم بۆیە وا ئەکەم و وا ڕائەبوێرم. وتی: «جا ئەمە کەی کامەرانییە؟» وتی: تا ئەم کاتە باوەڕم لەسەر ئەوە بووە کە دنیا لەمە زیاتر هەڵناگرێ. ئەگەر کامەرانی دەست کەوێ لەو ڕێگەدایە کە من گرتوومە. دیارە لەمەشدا نییە. کەوابوو کامەرانی دەنگی هەیە و ڕەنگی نییە.

ئنجا پێی وت: کاکی خۆم! گوێ بگرە تا قسەت بۆ بکەم، بەڵام پێویستە تۆ لەپێشا بەسەرهات و چۆنیەتی خۆت بۆ من بگێڕیتەوە و تێمبگەیەنی لە حاڵ و ئەحواڵی خۆت، ئەو وەختە منیش ئەوی بیزانم پێت ئەڵێم.

کوڕە هات ئەوی بەسەری هاتبوو لەو ڕۆژەوە کە بەشوێن کامەرانی ئەسووڕێتەوە تا ئەم کاتە هەر شتێك هەبوو نەبوو هەمووی بۆ گێڕایەوە و وتی: ئەمە ئاخر پلەمە؛ ئەمەوێ بزانم ئەوەی کە من ئەمەوێ لای تۆ دەست ئەکەوێ یان نە. بەو نیازە هاتم، بەڵام کە سەیر ئەکەم تۆ لە هەموو کەس زیاتر لەجەزرەبەدای.

لێرەدا عەلائەددین سەججادی دەستی پێ کرد و وتی: کەواتە دڵت لام بێ وتی: «برام! لە پێش هەموو شتێکا چەند وشەیەك هەیە، ئەمانە تەنها وشەکەیان هەیە، مەفهوومی ئەو وشەیە دوور نییە هەر دروست نەبووبێ. ئەوانەش وەکوو کامەرانی، عەدالەت، دیموکراسی و هیتریش هەیە».

ئەمانە جۆرە تەڵەیەکن کە بە هێز دەستی بێهێزی پێ ئەبڕێ و ڕاوی ئەکا، لەوان گەڕێن، تەنها قسە لە کامەرانییەوە بکەین؛ کامەرانی بە مانای کەلیمە لە دنیادا نییە و نەبووە. هەر شتێك هەیە لە دنیادا

هەمووی نسبییە. چاوت لە کاروباری ڕواڵەتی نەبێ، ئەوە هیچە. هەر دەستەیە کە تۆ ئەیبینی بە لاتەوە دەستەیەکی باش و بەختیارە، بچۆ لەگەڵیا هەڵسوکەوت بکە لە پاش تۆزێك پەشیمان ئەبیتەوە؛ خێرا بۆت دەرئەکەوێ کە ئەوە بۆ دەستبڕینی دەستەیەکی‌تر ئەو ڕێگەیەی گرتووە. جا با ئەو دەستە و چینە هەر دەستە و چینەیەك بێ، بەڵام ئەوی بە دڵی منا دێت و بەلامەوە کامەرانییە، چەند بیر و باوەڕێکە. ئەگەر ئەو بیروباوەڕەت بوو ئەوە کامەرانیت، ئەگەر نەتبوو هیچ. بەتایبەتی کامەرانی بەپێی ڕۆژ و زەمان ئەگۆڕێت، لەم ڕۆژەدا کە هەموو شت لە فیکر چۆتەوە و پوول و درا و شوێنی هەمووی گرتۆتەوە، کابرا بۆ ئەوە کە ڕاوی دەست کەوێ، چی بە بیرا بێت لە کاروباری ناهەموار و لە ماستاوکردنی بێ‌جێ، ئەیکا گۆیا بۆ ئەوە کە ئەو دراو و شوێنەی دەستکەوێ. سەیر ئەکەی کە دەستیشی ئەکەوێ لە هەموو کەس دڵتەنگتر و بەخەمترە. کەوابوو ئەمە کامەرانی نەبوو کە دەستی کەوت.

ئیحتیرام و ڕێز لە دنیادا دوو جۆرە: جۆرێکی هی ئینسانی ڕووتە؛ واتا پێویستە لە سەرت هەرکەس پێیان وت ئادەمیزاد، خۆڵڕێژێك بێت یا پادشایەك، تۆ ئەبێ ڕێزی لێ بگری و بە چاوێکی گەورەوە سەیری کەی، چونکە ئینسانە و یەکێکە وەکوو تۆ.

جۆرێکی‌تر، ئیحتیرام و ڕێزی دۆستایەتی، خزمایەتی، پایە و شوێن، عیلم و زانیاری، سامان و ڕواڵەتی دنیاییە. هەریەك لەمانەش ئەبێ زیاد لە هی ئینسانێکا بەشیان بدەیت، بەڵام بە مەرجێك: بەو مەرجەی کە کابرا لە خۆ بایی نەبێ و داوای ئەوەی لێ بکا هەر بەو ناوەوە کە ئەو گەورەیە، ئیتر واجبە لەسەر تۆ کڕنووشی بۆ بەری. ئەگەر ئەو داوایەی لێت کرد، ئەوە ئەبێ لەلایەن تۆوە بێبەش بێ؛ تەنانەت لە ئیحتیرامە

ئینسانییەکەش؛ بۆ وینە: کابرایەك بە میساڵ وەزیرە، داوای ئەوەت لێ ئەکا تەنها بەو ناوەوە کە وەزیرە پێویستە لەسەر تۆ کڕنووشی بۆ بەری و لە بەردەرگاکەیا بکەوی و دەوری لێ دەی. جارجار ئەویش بە فیزێکەوە و بە تیلی چاوەوە نیوە مەرحەبایەکی ڕووتت لێ بکا و ئەم نیوە مەرحەبایە ببێ بە خواردنی شەو و ڕۆژت و هیچی‌تر.

ئەگەر یەکێ وابوو، ئەوە تۆ ئەبێ لەباتی [ئەوەی] کە کڕنووشی بۆ بەری، بەردی تێ‌گری و بیشکێنی. بە شکانێکی وا کە جارێکی‌کە خۆی بۆ پێکەوە نەنووسێنرێ. ئەو مەسەلە کوردییەی تێ بگەیەنی کە ئەڵێ: «بۆیە پێت ئەڵێم کاکە، تا چۆلەکەم بۆ بگری»؛ ئەگینا ئەگەر بێتە سەر ئەوە لەبەر تەنها پایەکەت وەیا لەبەر تەنها سامانەکەت داوای ئەوەم لێ بکەی کە بە گەورەت بزانم، ئەوە لە باتی ئەوە؛ [ئە]بێ وا بچێتە دڵتەوە کە بە هیچت نازانم و هەریەکە پیاوی ماڵی خۆمانین؛ لەم لایەنەوە ئەبێ پیاو وەزیرێك و گزیرێك بەیەك بزانێ و هیچ گوێیان مەدەرێ با بیکەن بڕوێش[!].

یەکێکی‌تر لە هۆی بەختیاری ئەوەیە کە هەرگیز وەختی خۆت، وەیا دڵی خۆت بە شوێن و جێگە و بە قسە وتن بە خەڵکەوە تەنگ مەکە و خەریك مەکە. چاوت لەوەوە نەبێ کە فڵان ئەوەی هەیە و تۆ نیتە؛ وەیا کە دانیشتی لەگەڵ یەکێکا مەیە بە سەروگوێلاکی ئەو کەسە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ناسراوییەکتان بووە. وەیا نان و پیازێکتان بەیەکەوە خواردووە. لەم قسانە و لەم خەریك بوونانە هیچ کەڵکێك وەرناگری. بێجگە لەوەی نەبێ کە دڵی خۆت گرانبار ئەکەی. پیاو ئەبێ وەکوو ئاوی مەنگ وابێ؛ نەوەك چەقەنەی ئاش.

یەکێکی‌تر هەر قسەیە ئەیڵێیت وەیا هەر کردەوەیە کە ئەیکەی دوو

ئامانجت هەبێ: یەکەم نیازی خۆت لەگەڵ خوای خۆتا بۆ ئەو قسە و کردەوەیە پاك بێ؛ دووەم موحاکەمەیەك لەگەڵ ویژدانی خۆتا بکە بزانە ئەو قسە وەیا کردەوەتە، زیانی نییە بۆ خەڵك و بۆ بێگوناحان. ئەگەر ویژدانەکەت پێی وتی نیەتی، وە نیازەکەشت لەگەڵ خودا پاك بوو، ئەوە لەسەر ئەو قسە و کردەوەتە بڕۆ با هەموو عالەمیش قسە بکەن، هیچ نرخێکی نییە و دواجار هەر تۆ سەر ئەکەوی.

یەکێکی تر لە هۆی کامەرانی ئەوەیە ئەگەر بیروباوەڕێکت هەبوو، ئەبێ تا ئاخر هەناسەت لەسەر ئەو بیروباوەڕە بڕۆیت. پایە وەیا پارە وەیا ڕۆژباشی بۆش نابێ پەشیمانت بکاتەوە. ئەمەش مەرجی هەیە؛ مەرجەکەش ئەوەیە وابزانی لە بیروباوەڕەکەتا ڕاست ئەکەی و لەسەر شتێکی ڕاست و دروست ئەڕۆی. ئەگینا ئەگەر وا بزانی بیروباوەڕەکەت چەوتە، ئەوە نابێ لەسەری بڕۆی؛ چونکە پێ داگرتن بۆ شتی چەوت ئەمە زیانی لە قازانجی گەلێ گەلێ زۆرترە. خۆ ئەگەر بیروباوەڕەکەشت بە ڕاست زانی، وە لە واقعیشا ڕاست بوو، ئەوە هەر لە سەری بڕۆ با ڕایشت کێشنە پێی سێدارە و پێت بڵێن: یا ئەبێ پەشیمان ببیتەوە یا ئەمەتە ملت ئەکرێ بەو پەتەوە؛ نەکەی پەشیمان ببیتەوە؛ چونکە مردنی بە سەربەرزی گەلێ سەربەرزترە لە ژیانێ کە سەرنزمی تیا بێ.

یەکێکی تر، ئەوا دوو دەستە هەیە: دەستەیەکی دەستەجڵەوی ئیشی گرتۆتە دەست و لەسەر کورسی دانیشتووە؛ دەستەکەی تریش لە دوورەوە وەستاوە و سەیر ئەکا. لەم دەستەی دووەمەدا چەند کەسێك پەیدا ئەبێ ئەوانی تر هەڵئەخرێنێ با بچین ئیشەکە لە دەست ئەوانی تر بسێنین؛ چونکە نازانن بەڕێوەی بەرن. ئەچن و بەرەنگاریان ئەبن. ئەوانەش کە لەسەر کورسییەکەن، ئیشەکە نادەن بەدەستەوە. بەمان ئەڵێن ئێوە

نایزانن بەڕێوەی بەرن. کاروباری کۆمەڵ وای ئەوێ کە ئێمە لەسەر ئەم کورسییە بین. ئەمانیش ئەڵێن: نا، ئێوە نایزانن بەڕێوەی بەرن. کاروباری کۆمەڵ وای ئەوێ کە ئێمە لەسەر ئەم کورسییە بین. هەردوو لایان هەر کاروباری گشتی ئەکەن بە بیانوو بۆ دانیشتن لەسەر کورسییەکە؛ کەچی هەردوولایشیان درۆ ئەکەن کاروباری خۆیان وای پێویستە کە لەسەر کورسییەکە بن، نەوەك کاروباری گشتی.

جا نەکەی بڕوا بە قسەی هیچیان بکەی. هەردوولایان درۆ ئەکەن؛ مەگەر بە دەگمەن و بۆ خۆیان وا ئەکەن. ڕاستە بۆ خۆیان وا ئەکەن، چونکە سەیر ئەکەی ئەو دەستەیە کە لەسەر کورسییەکەیە هەموو تێپەڕاندنی ئیش و کاری وڵات هاتۆتە سەر ئەوە کە بۆ خۆیانی تێپەڕێنن و ئەوانی‌تر کە لەسەر کورسییەکە نین وەیا تێکڕای خەڵکی وڵاتن، لە دوورەوە زاقەی چاویان دێت و بە دەردی نەڕۆیشتنی ئیشەوە ئەتلێنەوە.

جا کاکەبرا! لە بیر و باوەڕی منا ئەمانە هەندێك بوون لە هۆی کامەرانی. ئەگەر توانیت ئەمانە بەری بەڕێوە، ئەوا ویژدانت ئەتوانێ بحەسێتەوە. کە ویژدانت حەسایەوە خۆیشت کامەران ئەبیت. هەروەخت توانیت ئەرکی ئەمانە هەڵگری و هەڵتگرت، جارێکی‌کە وەرەوە، هەندێکی‌تر هەیە پێت ئەڵێم. ئەگینا ئەو کامەرانییەی تۆ ئەڵێیت و عەوداڵی بە شوێنیا، نییە و دروست نەبووە. بچۆرەوە لە ماڵی خۆت دانیشە و خۆت بە خەیاڵەوە خەریك مەکە؛ نە عەدڵ هەیە نە کامەرانی.

کوڕە هەڵسا سوپاسێکی کابرای دانیشتووی کرد و ژوورە تاریکەکەی بەجێ‌هێشت و ڕۆیشت.



# لافاوی سولەیمانی

**١٩٣.** ئەڵێن مێژوو خۆی دەوری خۆی ئەکاتەوە، ئەمە ڕاستە. چونکە ئەو کارەساتانە کە لەو ڕۆژانەدا پەیدا ئەبن، بە دەگمەن دوویان لە یەك ئەچن. دەور کردنەوەکە مەعنای ئەوە نییە کە کارەساتی وەکوو یەك ئەگێڕییێتەوە، بەڵکوو مانای ئەوەیە کە زەمانەکە چەرخێکە ئەسووڕێتەوە، لەناو چەرخەکەدا پەردەی ورد و دروشت هەیە و پیشانی خەڵکی ئەدا. چەرخەکە لە سووڕانەوەدا ناوەستێ، کە نەوەستا ئیتر بەرەبەرە هەر پەردەی جۆراوجۆر دەرئەکەوێ.

جا بۆ ئەوە ئەو چەرخی مێژوویە یەکێ لەو پەردانە کە نواندی بۆ پاشەڕۆژ ون نەبێ، ئەوا ئێمە لێرە وەکوو بخرێتە مەکینەی زەنگۆغرافەوە و بە تەواوی ڕوون بکرێتەوە، ئەینووسین و بۆ پاشەڕۆژی مێژوو ئەیهێڵینەوە. ئەو پەردەیەش پەردەی کارەساتی لافاوی سولەیمانییە، ئەم کارەساتەش بەم جۆرەبوو:

ڕۆژ ڕۆژی هەینی و ١٨ای تشرینی یەکەمی (١٩٥٧) و ٢٨ی سەرماوەزی (٢٦٥٧)ی کوردی بوو. سەر لەبەیان هەتاو و ڕۆژێکی خۆش بوو. ئومێدی لە خۆشی بەولاوە هیچ شتێکیتر نەئەکرا هەتا کەوتە پاش نیوەڕۆ، پاش عەسر. سەعات بوو بە پێنجی پاش نیوەڕۆ لەلای شیمال و شیمالی ڕۆژاواوە هەورە چڵکنەیەك پەیدا بوو. زۆر بە تیژی بەرەو ئاسمانی ناو شارەکە خۆی کوتا تا نزیکتر ئەکەوتەوە تاڵتر و تووڕەتر ئەبوو، لە ناکاو لەسەر شارەکە

و لە بناری شاخی گۆیژەوە دایکرد و کردی بە ڕەهێڵە. زۆری پێ‌نەچوو بوو بە تەرزە. بۆ ماوەی ٤٥ دەقیقە ئاسمان وەیا هەورە تاڵەکە ئەیگرمان و ئەیشریخان و ئەگریا. باران وەکوو کونەی سەر بەرەوژێر ئەهاتە خوارەوە. تنۆکێ باران بە هەر چواریان ئیستکانیکی چایان پڕ ئەکرد. تەرزە لە هێلکە کەوێکەوە تا هێلکە مریشکێك بوو.

کە باران و تەرزە خۆشی کرد، لافاو وەکوو شێری برسی پەلاماری ناو شاری دا. لە سەرووی شارەکەوە ڕژایە ناو شارەوە. سەری کرد بە کۆڵانەکانی گەڕەکی «مەڵکەندی»دا ـ کە یەکێکە لە گەڕەکی شارەکە و کەوتۆتە سەرووی شارەوە ـ لە کۆڵانیشەوە ڕووی کردە ناو ماڵەکان و ناو ژوورەکان؛ چی بەرپەل کەوتایە لە نوێن و مناڵ و زەلام، لە دروشکەی بەردکێشان هەمووی ڕائەماڵی و ئەیهێنایە دەرەوە.

ئەمجا بەسەر ئەو جادە تازەیەدا کە ئەچێ بۆ ئەزمڕ شاڵاوی هێنا چووە سەرای شارەکەوە. سەرا دوو نهۆمە؛ نهۆمی خوارەوە پڕی بوو لە ئاو و هەچ نووسراو و پسوولە و سەنەداتێکی سەرای حوکوومەت هەبوو لەو نهۆمەدا هەمووی کەوتە سەر ئاو و لە بن‌میچەکە توند بوو.

لە پەنجەرەکانەوە ئاو هاژەی کرد و هاتە دەرەوە. لەگەڵ ئەوی سەرەوە کە ئەهات قۆڵیان کرد بە قۆڵی یەکا و پەلاماری بازاڕ و گەڕەکەکانی خوارەوەیان دا. لەم بەردەرکی سەرایەدا لافاوەکە بەهێزتر بوو. ئەسپی گالیسکەچی و ئۆتۆمۆبێلی ڕامالی و ئەیانی‌برد. ئەیدان بە دیوار و کەندەڵانا. لۆرییەکی بە حەوت تەن بارەوە برد، ئۆتۆمۆبێلی قەمەرە بەسەر ئاوەکەوە، ئاوەکە بۆی بووبوو بە شۆفێر و بە کۆڵانەکانا ئەیسووڕاندەوە.

لە شوێنیکی‌تر کە پێی ئەڵێن «ئەسحابەسپی» و ناوەندی شارەکەیە، ئۆتۆمۆبێل بە گوریس بەسرا بووەوە، ئاو گوریسی پچڕان و ئۆتۆمۆبێلی

فڕاند. نرکەی ئەم لافاوەش بێ زیاد و کەم هەر لەوە ئەچوو ئەتوت کێوێك ئەکەوێ بەسەر کێوێکا؛ چونکە هەم دەنگی ئاوەکە خۆی هەم دەنگی ڕووخانی ئەو دیوار و خانووانە کە بەرلەپێی ئەکەوت، یەکیان ئەگرت و ئەو شاییەیان ئەگێڕا.

لە هەندێ شوێنا ئاو کە چووە ژوورەوە ئەو مێز و کورسییانە کە لە ژوورەکە بوون ئاوەکە لە بن میچەکەی تونگ ئەکردن. لە هەندێ شوێنی‌تر ئاو لە پاش ئەوەی کە نهۆمی ژێرەوەی خانووەکەی پڕ ئەکرد، ئەچووە نهۆمی سەرەوە. لەوێوە لە دەرگا و پەنجەرەکانەوە وەکوو تاڤگەی هەرەبەهێزی کوێستانەکان ئەڕژایەوە کۆڵانەکانەوە.

لافاو لە دەشتەکانی سەرووی شارەکەوە مەڕی هێنابوو. بە جۆرێ ڕایماڵیبوو ئەو مەڕە فریای ئەوە نەکەوتبوو کە ڕووی خۆی بگۆڕێ بۆ ڕووی ئاوەکە. هەروەها لەناو شارا ئەسپی ڕائەماڵی و ئەیبرد. کە ئەمانەشی ئەبرد ئەیدان بە دیوار و کەندەڵانی ناو شارەکەدا و لەوێ یا ئەبوون بە ژێر دیواری ڕووخاوەوە یا هەر تونگی ئەکردن لە دیوارەکە و بەو جەزرەبەیە گیانیان تیا نەئەما. ئاوەکە بەمەوە نەئەوێستا، منداڵ و زەلامی لەناو ماڵا ئەفڕاند و ئەیبردن. چەند بێشکەی کۆرپەی ساوا بەسەر ئاوەوە بوو؛ کەس نەیئەوێرا توخنی کەوێ.

ئەمجا لافاو ڕووی کردە بازاڕان. لەوێ چووە «قەیسەری»یەکانەوە. سولەیمانی دوو قەیسەری تیایە: قەیسەری «نەقیب»، قەیسەری «وەسمان‌پاشا». ئەمانە شوێنەکەیان چاڵن. شتومەکی بازرگانی و تجاری سولەیمانی هەموو لەم دوو قەیسەرییەدان؛ کە چوو چی لەوێ بوو لە کووتاڵ و شەکر و چا و بابەتی عەتاری، هەموویانی ڕاماڵی، فەردەی پڕ لە کووتاڵ و سندووقی چا بەسەر ئاوەکەوە وەکوو پووشکە وا بوو.

دیارە ئەم ئاوە هەتا ئەهات زیادی ئەکرد و ئەهاتە سەری. لێرەدا نۆرە هاتە سەر گەڕەکی «سەرشەقام» و «شێخەباس». بەو تووڕەیی و توند و تیژییە پەلاماری ئەو گەڕەکانەی دا و رووی تێ کردن. لەو دوو شوێنە کارەساتی زیاتر کرد؛ ماڵڕووخان و مناڵبردن زۆرتر بەر ئەو شوێنە کەوت.

شوێنی شاری سولەیمانی لێژە؛ هەتا سەرەوخوارتر بڕوا بەلای قیبلەوە گوڕی ئاو زیاتر ئەبێ. ئەم گەڕەکانەش کەوتوونەتە خوارووی شارەوە، بۆیە زیاتر کارەسات لەمانا ڕووی دا. تا گەیشتە ئەوێ و لەوێ دەرچوو هەر شتێك هەبوو بردی و ئەمجا لە خوارووی شارەوە ڕووی کردە چەمی «تانجەڕۆ».

لە هەندێ لە کۆڵانەکانی ناو شارا ئەو شوێنانە کە ڕێبازی ئاوەکە بوون، تا دوو مەترە ئاو بەرز بووبووەوە. بەڵای زیاتر لەوەدا بوو ئاوەکە سارد بوو، هەمووی هی تەرزە بوو. لەبەر ساردییەکەشی کەس نەیئەوێرا توخنی کەوێ و شتێك بگرێتەوە.

لە هەندێ لە حەوش و سەربانەکانا وەکوو هێنابێتت بە سەدبار سەدبار تەرزەت تێکردبێ، ئاوا کۆمەڵە بووبوو. سەیرتریش ئەوەبوو شوێنی وا هەبوو نووسابوو بە شارەکەوە، وەکوو هەر بارانی لێ نەباریبێ وابوو. لە هەندێ پەنا دیوارا لە پاش ٤٢ ڕۆژ تەرزە ئەدۆزرایەوە لە هێلکە کەو گەورەتر بوو.

دەنگی نرکەی لافاو و دەنگی هاواری ژنان و پیاوان کە کەسوکاریان ئاو ئەیبردن، وەیا ماڵەکانیان لەبەر چاویانەوە ئەڕووخا، وەیا شتومەکی ناوماڵیان بەسەر ئاوەوە ئەبینرا، وەیا بارخانەی بازرگانەکەیان ئەچوو بە گەرووی لوورەی لافاوەکەدا و ئەمان هیچیان پێ نەئەکرا بێجگە لە

هەناسە هەڵکێشان نەبێ. ئەم دەنگانەی ئەو ڕۆژەی ناو شاری سولەیمانی، بێگومان کردبوویە کارێ کە فریشتەی ئاسمان بەزەیی پیا بێتەوە؛ بەڵام لەبەر ئەوە کە ئەو شارە هەر لە ماوەی چەند ساڵێکا جارێك ئەبێ ئەم دەنگانەی لێ بەرز بێتەوە؛ جارێك بەهۆی بۆردومانەوە، جارێك بەهۆی ڕژانی خوێنی شەهیدەکانەوە، جارێك بەهۆی لافاوی بێ ئەمانەوە. لەبەر ئەمانە فریشتەی ئاسمانیش گوێیان کەڕ بووبوو لە دەنگی ئەو هەموو زایەڵانە. وا دیارە شاری سولەیمانی ئەبێ هەموو جار ئەم دەرد و مەینەتە بخاتە سەر شانی.

لە گەرمەی لافاوەکەدا خەڵکەکە پەرت و بڵاو بووبوونەوە؛ کەس ئاگای لە کەس نەبوو. وەیا کەس نەیئەزانی چی دیار نییە و کێ بووە بە قۆچی قوربانی و بەماڵی تاڵانی.

باران و تەرزەکە لە پاش ٤٥ دەقیقە خۆشی کردەوە. لافاو هەر درێژەی کێشا و شەو بەسەرا هات. لێرەدا عالەم کەوتنە دەربەدەری و فەلاکەت. بەرەبەرە ناڵەی جگەرسووتاوان بەرز بووەوە. ئەمجا هەریەکە لە لایەکەوە هاواری ئەکرد کوڕەکەم وەیا براکەم وەیا کۆرپەکانم دیار نین. ڕاست بوو، دیار نەبوون؛ چونکە لافاو بردبوونی و کردبوونی بە گاوگەردوونی خۆی!.

ئەوانەی لەناو شارا بە خنکاوی لە دەمی لافاو سەنرانەوە، وەیا ئەوانەی بە مردوویی لە ژێر دار و بەردی خانووی ڕووخاوی دەست لافاو دەرهێنرابوون، ئەمانە لە ماوەی شەو و ڕۆژێکا دۆزرابوونەوە. بەڵام لە پاش ئەو شەو و ڕۆژە لە عەربەت و تانجەڕۆ لاشەی مردوو ئەبینرایەوە و ئەهێنرایەوە.

دەستەدەستە خەڵك ئەچوون بۆ ناشتنی مردووی ئەم کارەساتە لە گردی سەیوان. گۆڕهەڵکەنەکان فریای ئەوە نەئەکەوتن بێنەوە بۆ ناوشار.

کە گۆڕێکیان هەڵئەکەند بە پەلە ئەچوونە سەر هەڵکەندنی گۆڕێکی‌تر.

سەیرتر ئەوە بوو لە پاش دوو ڕۆژ منالێك لەناو بێشکەیا کە ئاو بردبووی لە دەوروبەری عەربەت و تانجەڕۆ دۆزرابووەوە پەنجەی خۆی خستبووە دەمی و ئەیمژی؛ هێنایان بۆ خەستەخانە. وا دیاربوو لەوێدا ویستبوویان دەرمانی بکەن ئەو وەختە مردبوو.

دەمێ ساڵ بوو؛ سولەیمانی خەریکی ڕێکوپێك کردنی ناو شار بوو. لە جادە، لە زیراب و ڕەهەن، لە جوانی ناو شار ئەم لافاوە ئەو ئیشانەی کە بەو ساڵە کرابوو هەمووی لە ماوەیەکی کەما تێك دا و هیچی بەسەر هیچەوە نەهێشت. شاری سولەیمانی لەم مێژووەدا بوو بە شوێنێك وەکوو هەرگیز دەستی ئاوەدانی بە خۆیەوە نەدیبێ وابوو. لە لایەکەوە جادە و کۆلان هەموو تێك چووبوو، ڕووخابوو بەسەر یەکا. لە لایەکەوە خانووبەرەیەکی زۆر ڕمابوو بەسەر یەکا. لە لایەکەوە دەرابەی دووکانەکان و بازاڕی بە لاروگێڕی و هەڵقلێشاوی کەوتبوون بەسەر یەکا، دەنگی زایەڵەی ڕۆڕۆیش سەرباری هەموو بوو.

ئەو زیانەی کە لەم لافاوەدا کەوت لەم شارە بەم جۆرە بوو:

ئەوانەی کە خنکان و بوون بە ژێر دار و پەردووی خانووی ڕووخاوەوە ٣٥ کەس. ئەمانە زۆرتری منالی ساوا و پاشان ژن و ئەمجا پیاو. ئەو خانوانەی کە لافاو ڕووخاندی ٤٧ خانوو بوو. ئەوانەی کە لافاو پەکی خستبوون ئەبوا برووخێنرێن ٧٦ خانوو بوو. ئەو زیانەی کە لە خەڵکی ناو شار کەوتبوو لە کووتاڵ و بابەتی عەتاری و شتومەکی ئاو بردووی ناو ماڵ دانرا بە سەد هەزار دیناری عێراقی. ئەو زیانەی کە لە شارەوانی (بەلەدیە) کەوتبوو هی خیابانەکان، باخچەگشتییەکان، زێراب و بۆرییەکان دانرا بە ٣٠٠ هەزار دیناری عێراقی.

ئەم کارەساتە بەم جۆرە قەوما. پاش ئەوە خەڵکی ناوشار و کوردەکانی دەرەوەی ناو شار بەتایبەتی ئەوانەی لە بەغدا بوون، هاواریان لێ بەرز بووەوە بۆ پڕکردنەوە و چارە کردنێکی ئەم زیان و کارەساتە. ئیستگەی کوردی و عەرەبی لە بەغدا دەنگی بەرز کردەوە. مەسەلە گەیشتە هەموو شارەکانی دەرەوەی عێراق و ئیستگەکانی عالەم. هەموو باسی ئەم لافاوە و پەرێشانی خەڵکی شاری سولەیمانییان کرد. خاوەن شکۆ پادشای عێراق و جێنشینی پادشای عێراق لە بەغداوە چوون بۆ بینین و سەرەخۆشی کردن لە لێقەوماوانی شاری سولەیمانی. هەروەها پیاوانی کوردیش لە هەموو لایەکەوە هەر چوون بۆ ئەوێ بۆ بینینی ئەم کارەساتە بە تەلگراف و تەلەفۆن و نامەی تایبەتی کوردەکانی عێراق و دەرەوەی عێراق دەربڕینی ماتەمی خۆیان بۆ ئەو پەرێشانییە کە ڕووی کردۆتە شاری سولەیمانی، ئەنارد بۆ «مُتَصَرِّف»ی شار و سەرۆکی شارەوانی و ڕۆژنامەی «ژین» لە سولەیمانی، هەروەها پادشا و سەرکۆمارەکانی کیشوەرانی دەرەوەی عێراق، باسی ماتەمی خۆیان ئەنارد بۆ خاوەن شکۆی عێراق و ئەمانە هەموو لە ڕۆژنامەکانی بەغدادا بڵاو ئەکرایەوە.

لە بندەست ئەمەوە خەزێنەی حوکوومەتی عێراق ٢٠ هەزار دیناری نارد بۆ لێقەوماوانی شار. ئەنجا فەرمانیشی دەرکرد کە تا ٥٠ هەزار دینار پیتاك بکرێ و ئەمانەشیان هەر بدرێتێ.

لێژنەیەك بۆ ئەم لایەنە لە بەغدا دامەزرا و دەستیان کرد بە ئیش کردن. لە شارەکانی تری کوردەواری عێراق، ئەوانیش لێژنەیان بۆ خۆیان دروست کرد و دەستیان کرد بە پارە کۆکردنەوە و هەموو لایەك مەردانە هاتنە دەست.

لە ناو شاری سولەیمانیش ٨ لێژنە دروست کرا بۆ ئەوە بزانن هەرکەسێ زیانی لێکەوتووە بەو پێیە لەم پارانە، پارەیان بدەنێ و تۆزێ لە کەساسییان کەم بکەنەوە.

ئەو لێژنە گشتییە کە لە بەغدا دروست بوو، لە پاش ئەوە کە بە جۆرێکی جوان کەوتنە ئیش کردن، پەنجا هەزار دیناریان کۆ کردەوە و نزیکەی ٣ هەزار دینارێکی‌تریش هەبوو، دەستوورێکی تازەشیان بۆ ئەوە داوا کرد. هەروەها ١٥٠٠ دیناری‌تریش پێش ئەمانە لە لایەنی یەك دوو کەسەوە بەرات کرا. بە کورتی بۆ ئەم ئیشە پەلامارێکی باش درا. لە ڕۆژی (١٩٥٨/١/١٦)دا لێژنەی گشتی چوون بۆ سولەیمانی و پارەیان بڵاو کردەوە. زیان لە ٦٤٪ پڕ کرایەوە. دیارە ئەمە بێجگە لەوە کە تا ٢٠ هەزار دینارێك لە دەوڵەمەندەکانی سولەیمانی کە زیانیان لێ کەوتبوو، وازیان هێنا و بەشی ئەوانیش دابەش کرا بەسەر ئەوانەدا کە زۆر پێویستی یارمەتی بن.

شتێکی‌تر کە شایانی باس بێ ئەوە بوو: ئەم لێژنەیە هێنایان ئەو کەسانە کە بەهۆی لافاوەوە مردوویان مردبوو، ئەو مردووە ئەگەر سەرۆکی خیزان بووبێ، بێجگە لە بەشی زیانەکە ٢٥٠ دیناری‌تریشیان داوە بە خێزانەکە. ئەگەر خۆ مردووەکە سەرۆك نەبووبێ ١٠٠ دیناریان پێ داون.

ئەمەی کە من نووسیم لێرەدا بۆ ئەوە بوو کە مێژوو شت ون نەکا. جا لەبەر ئەوە کە ئەمە ئەمێنێتەوە بۆ ڕۆژانی پاشەڕۆژ، وە لەبەر ئەوە کە لە دەرەوەی عێراقیش ئەم باسە ئەخوێننەوە و دوور نییە نەزانرێ کە زیانەکە چەند بووە بەرانبەر بە پارەی ئەوان، وەیا نەزانرێ دیناری عێراقی چ نرخێکی هەیە، ئەوا هێنام بەرانبەری دیناری عێراقیم کرد لەگەڵ هەندێ لەو پارانەدا کەخاوەنەکانیان دراوسێتی و ئاشنایەتییان لەگەڵ عێراقا هەیە بۆ ئەوە هەموو لایەك وەکوو یەك بزانن کە زیانی شاری سولەیمانی

لە ماوەی ٤٥ دەقیقەی ڕۆژی (١٩٥٧/١/١٨) چەند بووە و بۆ ئەوە بەرەی پاش ئەم ڕۆژەش هەر بە تەواوی بۆیان دەرکەوێ. نرخی پارەکان لەو ڕۆژەدا بەم جۆرەی خوارەوە بوو: (دینار عیبارەتە لە ١٠٠٠ فلس وە ئەمە وەحدەیەکی قیاسی عێراقییە).

| فلس | دینار | |
|---|---|---|
| ٧٥٠ | ٣ | لیرەی ڕەشادی زێڕ |
| ١٠ | ١ | پاوەنی ئینگلیزی |
| ١٠ | ١ | جونەیەی میسری |
| ٣٦٥ | | دولاری ئەمەریکی |
| ١٠٢ | | لیرەی قاقەزی سووری |
| ٢٦ | | یرەی قاقەزی تورکی |
| ١١٨ | | لیرەی قاقەزی لوبنانی |
| ٤٦ | | تمەنی ئێرانی |
| ٧٥ | | ڕووپیەی هیندی |
| ٨٠ | | فەرەنگی سویسری |

لە دروستکردنی شاری سولەیمانییەوە تا مێژووی ئەم کارەساتە ١٣٧ ساڵە. وا دیارە ئەم شارە لەم ماوەیەدا هەر بەشی کولۆڵی و ناخۆشی بووە.

مامۆستا «نجم‌الدین مەلا» لە ڕۆژنامەی «ژین»ـی ژمارە (١٣٧٨)ی ڕۆژی (١٩٥٨/١/٢٣) ئاگادارییەکی لەم ڕووەوە بڵاو کردبووەوە. ئەو ئاگادارییە لەگەڵ ئەم باسەدا ئەگونجن، بۆ ئەوە مێژوو ئەوەش ون نەکا و لە هەموو لایەکیشەوە ئاگادار بن، وا لێرەدا قەوماوەکانمان گێڕایەوە.

ئەم شارە ئەمانەی دیوە:

| له مێژووی | کارەسات |
| --- | --- |
| ١٧٩٥ | نەخۆشی چاوەقووڵ |
| ١٨٥١ | ڕووخانی ئەمارەتی بابان و ئاژاوە |
| ١٨٧٦ | گرانی گەورەو شەڕی فارس و بایەزید |
| ١٩٠٤ | ڕشانەوە |
| ١٩٠٨ | ئاژاوەی سولەیمانی بە هۆی کارەساتی مووسڵەوە |
| ١٩٠٨ | گرانی پێشوو لە برسا بردن |
| ١٩١٩ | بە دیل گرتنی شێخ مەحموود |
| ١٩٢٤ | بۆردمانی سولەیمانی |
| ١٩٣٠ | هەرای ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلوول |
| ١٩٣٢ | لافاوی پێشوو |
| ١٩٥٧ | لافاوی ئەمجارە |

مایەوە سەر ئەوە ئایا ئەم کارەساتە بۆچی لە سولەیمانی ڕووی دا؟ لەگەڵ ئەوەدا ئەو شارە شوێنێکی نیمچە کوێستانە و هەموو دەمێك شوێنی ڕەهێڵە و باران بووە؟

جێگەی ناو شاری سولەیمانی هەموو شیو و دۆڵە. هەر لەو وەختەوە کە «ئیبراهیمپاشای بابان» لە (١٧٨٤)دا بناغەی شارەکەی داناوە تا ئەم ڕۆژە هەموو کاتێك ڕێبازی ئاو و لافاو بووە؛ کەچی تا ئێستەش بێجگە لە ساڵی (١٩٣٢) شتێکی‌تر وا ڕووی نەداوەتەوە. هی ساڵی (١٩٣٢)یش لەچاو ئەمجارەدا شتێکی وا نەبوو.

ڕاستە سولەیمانی گەلێ باران و لافاوی چاوپێ‌کەوتووە، بەڵام ئەوەی

کە بوو بەهۆی فەلاکەتی ئەم جارە، دوو شت بوو: یەکەم پڕ بوونەوەی شیوەکان؛ دووەم پڕ بوونەوەی خەندەقەکە.

وەکوو زانیمان لە زۆر شوێنی ناو شارەوە هەر لە کۆنەوە شیو و دۆڵ بووە. هەر باران و لافاوێك هاتبێ شیوەکان قووتیان داوە و ئیتر هیچ نەقەوماوە. ئەمە چەند ساڵێکە بەهۆی دروستکردنی شەقام و ڕێکخستنی جادە و کۆڵانی تازەوە ئەو شیوانە بەرەبەرە پڕ بوونەوە. خۆڵی سەرجادەکان و خاکوخۆڵی ماڵان هەموو بە جۆرێکی کەمتەرخەمی ئەکرانە ناو ئەوانەوە. ئەو شتەش کە ئەم لایەنەی کەمتەرخەم کردبوو، دروستکردنی ئەو خەندەقە بوو لە قەراخ شارەکەوە. گۆیا ئەوترا کە خەندەق هەبێ ئیتر شیو پێویست نییە. خەندەقەکە بوو بەهۆی تیاچوون و پڕ بوونەوی شیوەکان؛ کەچی ئەمە چەند ساڵێکە گوێ بە خەندەقەکەش نەدرا تا ئەویش پڕ بووەوە. بە پڕ بوونەوەی هەردوو لایان، بەر بۆ لافاو بەرەڵا بوو.

کەوابوو هەزار خۆزگە بەو دەورە کە ئەو خەندەقە دروست نەکرابوو؛ چونکە نەبوونی ئەوە، خەڵکەکە و حوکوومەتیشی وریا ئەکردەوە بۆ ئاگاداری لە شیوەکان؛ ئەمەیە ئەڵێ: «بۆ ڕیش چوو سمێڵیشی نایە بان».

**١٩٤.** دیسان هەر بۆ ئەوە کە مێژوو شت ون نەکا: لە ڕۆژی یەکشەنبەی (١٩٥٨/١/٥) دەمەدەمی ئیوارە بوو هەورێکی شام کشا بەسەر لیوای دیالەدا؛ وڵاتی «خانەقین»ـی هەموو داپۆشی. لە سەعات پێنجی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا باران وەکوو کونەی سەربەرەوژێر دەستی پێ کرد. بێجگە لە تاریکی دنیای هەور، تاریکی دنیای شەویشی هاتە سەر. لێزمەی باران هەر زیادی ئەکرد. لە سەعات سێی پاش نیوەشەو وریەی ترس لێ‌درا. لافاو لە کێوەکانەوە هێرشی هێنا بۆ ناو شار. نە دیواری باخوباخات ئەیگێڕایەوە، نە کۆشك و خانوبەرەی ناو شار.

ئاژاوە کەوتە شارەوە. ماڵ و مناڵ کەس لە ژێر خانووا نەما. لافاو ڕووی کردە گەڕەکی خوارووی ناوشار و خانەکان. لە پێش هەموو شتێکا مەکینەی کارەبای پەك خست و ڕووناکی لە شارا بڕا. دەنگی ڕووخانی خانوو، دەنگی هاواری مناڵ و گەورە یەکی گرت. سامی تاریکیش هەر ئەهات زیاتر هەڕەشەی ئەکرد. بارانیش ئەهات زیادی ئەکرد تا سەعات پێنجی بەیانی ئەو لێزمەیە دریژەی کێشا و پاش ئەوە، خۆشی کرد و وردە وردە کونی ڕووناکیش کەوتە دنیاوە.

بەڵام هاوار و دادی شار و سەر لێ‌تیکچوونی دانیشتووانی شار هەر زیادتر ئەبوو؛ چونکە کەس بە تەمای هیچ نەمابوو و هیچ دەروویەکیش نەبوو ڕووی تێ کرێ. جەستەی ئەو شارە لە دڵا جەستەی خامۆشان بوو و لە ڕووا جەستەی واوەیلای دادفرۆشان بوو.

ناو شاری خانەقین ڕووباری «ئەلوەند»ی لە ناوایە کە ئەمە لە وڵاتی ئیرانەوە دێت. ئەم لافاوە هی ڕووبارەکە نەبوو؛ چونکە لەو سەردەمەدا و لەو شەوەدا باران لە ئیران نەباریبوو تا ئەلوەند زیاد بکات؛ بەڵکوو ئەم ئاوە هەر هی بارانی ئەو ناوە بوو کە لە شیو و کێوەکانی سەرووی خانەقین ئەیکرد بە لافاو و ئەیرژانە ناو شارەوە.

لەم لافاوەدا زیان لە گیان نەکەوت، بەڵام زیان لە ماڵ ئەوەندە بوو، سێ عەلافخانەکە ڕووخا و هەموو شتومەکی بوو بە ژێر ئاوەوە. ٢٠ خانوو هەر لەناو شار ڕووخا و شتومەکی بوو بەژێر ئاوەوە. ٢٥ خانوو لە ئاوایی «تۆڵەفرۆش» کە لووتی بە لووتی شارەکەوەیە و کەوتۆتە سەرروویەوە. ٣٠ خانوو لە «کارێزی ئەرکەوازی» کە ئەمەش هەر لووتی بەسەر شارا داژەندووە و کەوتۆتە سەرروویەوە. زیانی بەشی خانەقی بە باخەکانەوە گەیشتە ٤٠ هەزار دینارێك. دیسان دە ڕۆژ ئەم شارە بێ‌کارەبا و سێ ڕۆژ

بێ ئاوی خواردنەوە مایەوە.

هەر لەو بارانەدا و لەو شەوەدا ئەم لەشکری هەوری بارانە بەو جۆرە دای بەسەر «قزرابات» (سەعدیە) و «جەلەولا»دا؛ لێرەدا گەلێ ناخۆشتر و ناڕەواتر بوو. شوێنی قزرابات چاڵە؛ بارانی ئەو ناوە هەموو بوو بە لافاو و لە ناکاو سەدەی خەتی شەمەندەفەری شکان و هەرەسی هێنا بەسەریانا. دەس لەسەر شان ئاو ڕژایە ناو ماڵان. لەوێوە هێرشی بردە دووکانەکان. کارەساتی قزرابات وەکوو هیچ شوێنێك نەبوو؛ دنیا تاریك، لافاوی ئاو بە هێز، شوێنێك کە منالێك تیایا ستار بگرێت نەماوە.

زەلام و ژن و منالٚ بە تۆی کراسی ڕووت لە گێژاوی لافاوی بێ ئامانا ئەخولانەوە. نە باوك بەسەر منالٚی ئەپەرژا، نە دایك بەسەر کۆرپەی ناو بێشکەی ئەدا. ئەڵێن ڕۆژی قیامەت وا دیارە ئەو شەوە بووە لە قزرابات.

ئەم شوێنی قزراباتە ڕێگەی ئۆتۆمۆبێل بەناو شارەکەیا ئەڕوا. ئەملاوئەولای ڕێگە هەموو خانوو و دووکانە. شوێنەکەشی وا ڕێکەتووە دەشتە و چاڵیشە. هەموو ئەملاوئەولاکەی سوارە بە سەریا، لە ترسی کارەساتێکی وا گەلێ جار ویستراوە شوێنی شارەکە بگوێزرێتەوە، بەڵام زۆر بە تەنگیەوە نەبوون هەتا ئەمجارە ئەمە ڕووی دا و بوو بەهۆی ماڵوێرانی گەلێ خێزانی ئەو ناوە. کە لافاوەکەشی هات لەبەر ئەوە شەو لە ناکاوا بوو، کەس هیچی پێ نەکرا و کەس نەیتوانی پەلاماری شتێك بدا بۆ ڕزگار بوون. ئەوەی زۆر ئازا بوایە گیانی خۆی دەرباز ئەکرد و هیچی‌تر. بە هەرجۆر بوو، ئەوانەی پێیان کراوە خۆیان ڕزگار کردووە و ئیتر لافاو بەبێ ئامان پەلاماری خانوو و دووکانەکانی داوە تا ڕۆژ بووەتەوە. لەو هەموو خانووبەرە و دووکانە نزیکەی ٣٠ خانوویەك بە پێوە ماوە و ئەوی‌تری ڕووخاوە.

کە ڕۆژ بووەتەوە و ئەو عالەمە بە ڕووتوقووتی کەوتوونەتە ئەو دەشتە، حوکوومەتی نزیك و قائیمقامی «شارەبان» و لەشکری ئەو ناوە مەردایەتییەکی مەردانەیان نواندووە و لە هەموو جۆرە جلوبەرگ و خواردەمەنی و نوێنێکیان فریا خستوون و نەیانهێشتووە هەروا بەو بێ‌دەرەتانییە هەموویان تیا بچن.

ئەو زیانەی لە قزرابات کەوتووە:

بە لافاو و بە ڕووخانی خانوو بە سەریانا ٦ کەس مردوون. خانوو و دووکان کە ڕووخاوە دانراوە بە ٥٠٠ خانووێك. زیانی ناوشار هی شتومەکی ناوماڵ و دووکان و بازرگانی بێجگە لە نرخی خانووەکان ٣٠ هەزار دینارێك بووە.

کارەساتی «جەلەولا»ش کەمتر نەبووە لە هی قزرابات. جەلەولا بەسەر ڕووباری سیروانەوەیە. ئەویش بە جۆرێ باران و لێزمەکەی خانەقی و قزرابات هەر لەو شەوەدا کوتراوە. هیچ دەروویەك بۆ ئەو دانیشتووانە نەماوەتەوە تەنها دەرووی ڕۆژ بوونەوە نەبێ ئەوانیش لە گێژاوی لافاوی بارانا گێژیان خواردووە.

دیسان شوێنی جەلەولاش هەر دەشتە و کێو و تەپۆڵکەکان سوارن بەسەریا. بارانەکە کە باریوە، لافاو لە شیو و دۆڵی کێوەکانەوە هەستاوە و لە هەرچوار لاوە پەلاماری شوێنی جەلەولای داوە و کەس هیچی پێ نەکراوە. بەیانی کە ڕۆژ بووەتەوە دیسان حوکوومەتی نزیك و لەشکری ئەوێ گەیشتوونەتە دادیان، جلوبەرگ و خواردنیان فریا خستوون. پاشان ئەو ماڵانە کە بێ‌لانەوبان ماونەتەوە، لەشکر لە خانووەکانی عەسکەریدا داڵدەی داون و شوێنی بۆ چاك کردوون.

ئەو زیانەی کە لە جەلەولا کەوتووە:

١٠ کەس بە لافاو و ڕووخانی خانوو بەسەریانا مردوون. ١٥٠ خانوو ڕووخاوە. زیانی ناوماڵ هێشتا دەرنەکەوتووە.

پاش ئەمانە حوکوومەت چوو بۆ سەردانی ئەو شوێنانە و لیژنە دروست کرا بۆ کۆکردنەوەی پیتاك و ئیستگە و ڕۆژنامەکانی بەغداش هەموو ئەم باسەیان کردەوە و هانەهانەی خەڵکیان ئەدا بۆ یارمەتی.



# ڕشتەی مرواری

**١٩٥.** جەنگی (١٩١٤ ـ ١٩١٨) جەنگێکی بەسام بوو؛ زۆر بەسام بوو. کە کەوتە (١٩١٧) ئەبێ ئەوە بزانین کە بلیۆن و نیوێك کەوتنە کوورەی شەڕەوە؛ کە کەوتنە کوورەیەوە حەوت بەش لە هەشت بەشی ئەم دانیشتوانی سەر زەوییە تووشی داوی جەنگ بوون. تووشی ئەوە بوون کە نۆ بەش لە دە بەشی ئەم فەرانە جەنگیان لەگەڵ بەشەکەی‌ترا ئەکرد.

ڕاستە وابوو؛ چونکە (١٣٤) ملیۆن لە هاوپەیمانەکان ئەچوون بەگژ (١٦٠) ملیۆنی ئەڵمانی، نەمسەیی، مەجەری و تورکیدا.

لە جەنگی (١٩١٤ـ ١٩١٨)دا (٦٠) ملیۆن زەلام لە ژێر چەکا بووە. کە لە شەڕ بوونەوە (٨) ملیۆنی ئا لەو کەسانە کە باوك و داکیان بە خوێنی جگەر گەورەیان کردبوون، لە پێناوی چڵێسی چەند کەسێکا کوژران.

هەروەها کە لە شەڕ بوونەوە، (١٨) ملیۆنیش بریندار کەوتە عالەمەوە. تاعوون و پەرێشانی مردن (١٧) ملیۆن بوون. کەواتە تۆ ئەبێ وا بزانی کە (٤٣) ملیۆن کەس لە جەنگی (١٩١٤ـ ١٩١٨) بوون بە گاوگەردوونی چەند کەسێك.

بناغەی هەڵگیرسانی ئەم جەنگەش ئەوە بوو کە «ارشدوق فرنسیس» جێنشینی شای «نەمسە» لەگەڵ ژنەکەیا لەناو دروشکەدا بوون. لە «البوسنە» لە «سوربیا» لە (٢٨ حەزیرانی (١٩١٤) کوژران؛ ئیتر ئەمەبوو بە

مووشەدەمەی هەڵگیرسانی ئەو شەڕەکە سەری ئەم هەموو حەشاماتەی تیا بە فەتەڕاتا درا؛ پێی ناوێ کارمان چییە بەمەوە.

مەلا حەمدوونی حافز، پیاوێکی بێچاو و خەڵکی سولەیمانی بوو. لە (١٢٧٨)ی هیجری هەر لەو شارە هاتبووە دنیاوە. لە (١٥ی جمادی‌الاولی ١٣٣٦)ی هیجری کۆچی دوایی کردووە. لەو ماوەیەدا گەلێ شاران و وڵاتان گەڕاوە و دنیای لە بۆتەدا تاقی کردۆتەوە.

جا ئەم مەلاحەمدوونە بە چاوی دڵی کارەساتێکی ئەو شەڕەت بۆ ئەگێڕێتەوە کە پارچەیەکی هەرە بەرزە لە ئەدەبی کوردی. بەڕاستی هەر تەنها مەلا حەمدوون زانیویەتی باسی ئەو شەڕە بکات و بڵێت:

ئەم ڕۆژە چە ڕۆژێکە کە عالەم شڵەژاوە
هەرکەس بە جەخارێ جگەری قیمە کراوە
دنیا پڕی ئاشووبە خەلایق بە عوومی
ئاسایشی لێ مەنعە ئەڵێی هێرشی ئاوە
کامەی کە ئەڵێ خۆشیەتی دوورە لە میحنەت
ڕیشەی دڵی ئاڵاوە بە سەد دەرد و بەڵاوە
گیرۆدەیە ئەم عالەمە هەرکەس بە سیاقێ
کەوتوونەتە زنجیرەیی ئەنواعی بەڵاوە
وەك تەرزە ئەبارێ بە هەموو دەم ئەسەف و غەم
هەوری غەزەب و قەهری خوا توند و بەتاوە
نیك و بەدی ئەم زومڕەیی ئیسلامە بە جارێ
کەوتوونە کەشاکەش بە قوماندەی ئومەراوە
ئەم زاڵمی سەففاکی «سەفەربەرلگ»ـە ئەمڕۆ
فەرمانی بە خوێن ڕشتنی ئەم عالەمە داوە

ژاندارمــە ئەســووڕێتەوە وەك واشــەیی برســی
بــۆ لاشــەیی میللــەت بــە فــڕ و فێڵی غــەزاوە
فەوتــاوە لەبــەر ســوغرە، كــەر و ئێســتر و یابوو
حوشتر ســەقەت و شــەل بووە، گا پشتی شكاوە
كــەر شــەوقی زەڕینــی نییــە حەتــا لــە بەهارا
ترســی هەیــە نــەك بیخەنــە ژێــر باری قــەزاوە
هەر شــەش جیهەتی گرتووە ئاشووب و مسیبەت
مێشــوولە مەجالــی نییــە دەرچــێ لە حــەواوە
تەییــارە بــە ئەســپابی شــەڕ و فتنــەوە دایــم
جەولانــی ئەڵێی هــەورە بەســەر مەركەبی باوە
بالۆنــی هەلۆشــیوە لەگــەڵ دێتــە تەحــەڕڕوك
عالــەم لــە نەزەریا بــە مەســەل پۆری خــوراوە
ئــەم جووتــە بەڵازادەیــی باڵندەیــە ئەمــڕۆ
ســەیارەیی فەوقــن بــە ئەلكتریكــی چــراوە
عالــەم لــە شــریخە شــەرەری دەمدەمــی بۆمبا
حەیــران و سەراســیمە و عەقڵــی خەرەفــاوە
بەرقــی غەزەبــی دانــەو و نارنجــەك و تۆربیــد
ئاگــر ئەپژێنــن لــە زەمیــن و لــە ســەماوە
شــەو ڕۆژە لەبــەر بەرقــی قەبیح و ڕم و ســوننی
لەمعەی قەسە تۆرەش بەمەســەل بەرقی هەتاوە
دەشــت و جەبەل و بەحر و جزیــرە و هەموو دنیا
شەق‌شــەق بووە مەجمووعی بەدەم تۆپی قەزاوە

وشك و تەڕی ئەم سەتحی کوورەی ئەرزە بە جارێ
گولگـــوون بـــووە، ڕەنگینە بە خوێنی شـــوهەداوە
تـــا حوکمـــی تەماشـــایی تەســـەور لـــە هەموو لا
هەر لاشـــەیی چنراو و ســـەر و دەســـتی شـــکاوە
ڕووسی غەم و ئینگلیزی خەفەت هەردوو بە جارێ
هاتوونەتـــە ســـەر مۆمنی عوشـــرەت بە ســـوپاوە
هەر لەحزەیێ سەد لەك چە لە مۆمن چە لە موشریك
واســـڵ بـــە دوو جیمن بـــە عەتـــاو و بـــە خەتاوە
وا پۆر و ســـەفینە و بەلەم و کەشـــتی و ئوســـتۆل
ئامادەیـــی حەربـــن لـــە هەمـــوو لا تەنـــراوە
گیـــراوە بـــە هێـــزی چـــەك و تەیـــارە و ســـاروخ
مەعمـــوورە و وێرانـــە هەرچـــی نـــاوی بـــراوە
لـــەو ڕۆژەوە دنیـــا هەیە تـــا ئەم دەمە بێ شـــەك
مەغلووبـــەی بـــەم غابەتـــە نەبـــووە و نەکـــراوە
بـــۆ گرتـــن و بۆ کوشـــتنی ئـــەم عالەمە یەکســـەر
ئـــەم عەرســـەیی ئافاقـــە ئەڵێـــی حەلقەیی داوە
ئەم دینە لە پێشـــا وەکـــوو ســـەرچاوەیی زەمزەم
بێ‌غەش بوو، ئەمێســـتا کە ئەڵێـــی عەینی قوڕاوە
بنچینەیـــی دەرکەوتـــووە بنیـــادی شـــەریعەت
یەکســـەر هەرەســـی بـــردووە ئاســـاری نەمـــاوە
پـــڕ گـــەردی غەمە نـــاوی ســـەعاتی دڵـــی عالەم
ڕەقـــاس و جـــەر و زنبەلـــەك و چەرخـــی شـــکاوە

**یارەبـی لەبـەر حورمەت و ئیکرامـی موحەممەد**
**ڕەحمـێ بکـە بـەم باقـی ئیسـلامە کـە مـاوە**
**کـەم زۆرە ئەگـەر نەسـرەتی حـەق ڕاهنمـا بێ**
**بێ نەسـرەتی حـەق لەشـکری دارا سـەرە واوە**
**«حەمدی» دڵی یەخسیری فەرەنگی غەمە ئەمڕۆ**
**بەربوونی بە بەربوونی گەرووی «بەسرە» و «فاو»ە**

**١٩٦.** «محمود نادر» پیاوێکی نەخوێندەواری عەشیرەتی جاف بوو. لە «بانی خێڵان» دائەنیشت، هەچ قسەیەك کە ئەیکرد گەوهەرێك بوو لە ئەدەبی کوردی.

ئەم مەحمووی نادرە ڕۆژێك مەلا قادری سۆفی و مەلا حسەینی کوڕی مەلا قادری بیارە ئەبن بە میوانی و هەروا ئەکەونە قسە کردن. مەلا قادر باوکی لە عەشرەتی وەلی و دایکی لە عەشرەتی «دەلەژێری» بوو.

ئەم دوو عەشرەتە لە تیرەکانی جافن. دەلەژێریش تۆزێ دەستی دزییان هەیە. مەلا حسەینیش باوکی ئەوەتە مەلا قادری بیارەیە و دایکیشی کچی شێخی «ضیاءالدین»ـە، خۆیشی پیاوێکی قسەقوت و خۆشە. مەلا قادری سۆفیش پیاوێکی زانا و دانا بووە.

مەحمووی نادر ڕوو ئەکاتە مەلاقادر و ئەڵێ: «بێژم چی لە کاری خوا؟ ئەوەسە لە باوکە سنگ‌ڕووتێکی وەلی و لە دایکێکی دەلەژێری، پیاوێکی وەکوو تۆ دروست ئەکا و لە مەلا قادری بیارە و لە کچی شێخی «ضیاءالدین»یش پیاوێکی وەکوو مەلا حسەین دروست ئەکا».

**١٩٧.** ئینگلیز تازە هاتبوونە عێراقەوە، زابتێکی گەورەی ئینگلیز لە «فەقێ جنە» لە دیواخانی حەسەن بەگی حسەین بەگدا

دائەنیشێ و دەست ئەکا بە قسەکردن و بە شانوباڵی چاکی خۆیانا دێت.

مەحمووی نادریش لە دیواخانەکەدا ئەبێ. ئینگلیزەکە هەمووجار ڕوو ئەکاتە مەحمووی نادر و ئەڵێ: ئەوەتان بۆ ئەکەین و ئەوەتان بۆ ئەکەین. کە ئەو لە قسەکانی ئەبێتەوە، مەحمووی نادریش لەسەرخۆ پێی ئەڵێ: «ئینگلیز بەگ! ئێمە دابەستە خزمەت ئەکەین و پاشان سەری ئەبڕین». ئەڵێ کابرای ئینگلیز ئیتر نقەی نەکرد.

**١٩٨.** کەریم‌خانی زەند پێیان ئەوت «وکیل الرَّعایا»؛ دادگوستەر و میللەت‌پەروەر بوو. لە گەڕانەکەیا بە وڵاتی کوردەواریدا بیستی پیاوێکی زۆر بە عومر لە دێیەك هەیە، لەبەر تەمەن‌درێژی هەر لەناو جێگەدا کەوتووە. لە قسە و گوفتوگۆدا وریا بوو، بەڵام هێزی هەڵسوکەوتی نەمابوو.

«وکیل الرَّعایا» ناردی هێنایان و ڕێزێکی زۆری لێ‌گرت و گەلێ دەنگوباسی کۆنی لێ پرسی. پاشان پێی وت: داوای چی ئەکەی بیکە. پیاوەکە وتی: تۆ ناتوانی شت بدەی بە من. وەکیل وتی: ئەمە قسەیە تۆ ئەیکەی؟ من چۆن ناتوانم شت بدەم بە تۆ؟ وتی: «کە شتت لە دەست دێت جوانیم بۆ بگێڕەوە». وەکیل وتی: ئەمە لە دەست منا نییە. کابرا وتی: «ئەمەت پێ نادرێ بەهەشتم بدەرێ». وتی: ئەمە تۆ داوای چی ئەکەی؟ ئەمەش لە دەست منا نییە. وتی: «کەواتە بمگێڕەوە بۆ شوێنەکەی خۆم».

**١٩٩.** مەلا «عبدالرّحیم»ـی چورستانی لە دێی «فەقێ‌جنە» مانگی ڕەمەزان بوو، سەرلەئێوارەیەك لە مزگەوتا دانیشتبوو وەعزی ئەدا ئەیوت: ئەوانەی کە لەم دنیادا چاکە ئەکەن و ئەمرن تۆڵەی چاکەکەیان ئەبیننەوە. هەموو دەمێك چاویان لەوەیە ئەڵێن: بریا

دەستمان بگەیشتایەتەوە بە خزم و کەسوکار و دۆستەکانمان پێمان بوتنایە: ئەوەی ئێمە کردوومانە ئێوەش بیکەن. هەروەها ئەوانەیش کە لە دنیادا خراپە ئەکەن، پاش مردن تۆلەی خراپەکەیان ئەبیننەوە. ئەوانیش ئەڵێن: بریا دەستمان بگەیشتایەتە دۆست و کەسوکارەکانمان پێمان بوتنایە: ئەوەی ئێمە کردوومانە ئێوە ئەوە مەکەن.

حەسەن بەگی قادربەگی جاف ـ کە مەلا، مەلای ئەو بوو ـ ئەویش لە وەعزەکەدا بوو هەڵیدایە وتی: «مامۆستا! کەواتە لەو دنیاش ڕەحەتی هەر نییە؛ چونکە ئەوەی چاکە بکا و خراپە بکا هەر تووشی ئەو مەراقە ئەبێ، لەوێدا کە بڵێ: بگەڕامایەوە دنیا بۆ ئەوە کەسوکارەکەم تێ بگەیەنم. دەی ئەمە کەی وایە کە ئێوە ییژن لە بەهەشتا هیچ خراوەیەك و دەردەدڵییەك نییە. دەسا وە قەورەکەی حەمەپاشا خوا ئەمە فتنەیە دروستی کردگە، فتنە».

٤٠٠. مەلایەك هەبوو لەو وڵاتی «بادینان»ـە، لە سەرمایەی دنیا تاقە نێرەکەرێکی شینی هەبوو. بەرەڵای ئاوایی ئەکرد و بەر ئەبووە دەغڵودانی ئەو عالەمە و لەبەر ئەوەش کە کەری مامۆستابوو، کەس نەیئەوێرا دەنگی لەگەڵ بکا. وای لێ هاتبوو گیپەرەی ملی باوەشی پیا نەئەهاتەوە. تەنانەت نەوەك زەلام، کەری گوندیش هەر پێیان نەئەوێرا.

ڕۆژێك کەری مەلا لەگەڵ کەری کابرایەکی تر ـ کە ناوی سۆفی قادر ئەبێ ـ ئەبێ بە شەڕیان و کەری مەلا بە جووتە، کەری کابرا ئەتۆپێنێ. کابراش تەنها هەر ئەو گوێدرێژەی هەبوو کە بە کاروان و شتە پێوەی بەڕێوە ئەچوو.

خەمی لێهات کە چی بکا. وتی: ئەگەر ئێستە ئەچم و ئەڵێم مەلا کەری تۆ کەری منی تۆپاندووە هیچم ناداتێ. نەوەڵڵا چاك وایە لە پێشا بڵێم: کەری من کەری تۆی تۆپاندووە. ئەو وەختە بە «شەرع» ئەیخاتە سەرم کە بیبژێرم. پاش ئەوە من هەر بە شەرعەکەی خۆی کەری خۆمی پێ ئەبژێرم و هیچی پێ ناکرێ.

هەستا چوو وتی: مامۆستا کەرەکەی جەنابت لەناو قەرسیلەکەدا بوو، منیش کەرێکم هەبوو ئەویش چووبوو بۆ لەوەڕ، لەناو قەرسیلەکەدا بوو بە شەڕیان و قەزاوقەدەر وای هانی کە کەرەکەی من دای لە هێنەکەی جەنابت و تۆپانی. ئێستە ئەوا هاتوومەتە خزمەتت بزانم چی ئەفەرمووی؟

مەلا کە گوێی لەمە بوو، تووڕە بوو وتی: چۆن تۆ کەری من ئەتۆپێنی و هەروا بە هیچ بڕوا؟ شەرع ئەفەرمووی: ئەبێ بیبژێری.

سۆفی قادر وتی: قوربان لە کام کتێبا وا ئەفەرموێ؟ ئێمە موسڵمانین و بەپێی شەرع ئەبزوینەوە، چی ئەو بفەرموێ نابێ لێی لاڕێ بین.

مەلا ئەمەی زۆر پێ خۆش بوو وتی: باوکم لە «ئەنواری مەزنێ»دا وا ئەفەرموێ و پەلاماری ئەنواری مەزنی دا. سۆفی قادر وتی: قوربان دیارە بۆم ئەخوێنیتەوە. مەلا وتی: بەڵێ، بەڵێ بۆت ئەخوێنمەوە. شەرع گەورەیە نابێ لێی دەرچین. دەستی برد عەینەکەکەی هەڵگرت و تەلەکانی کە لار بوو بوو، تۆزێ ڕاستی کردنەوە و خستیە بەر چاوی و کتێبی لە بەردەمی خۆیا دانا و دەستی پێ کرد. سۆفی وتی: قوربان ئەبێ مانعاشم بۆ لێ دەیتەوە؛ ئەگینا تێناگەم. وتی: بەڵێ چۆن مانعات بۆ لێ نادەمەوە. ئەوەتە ئەفەرموێ: «ابجَد» جووتە کەرا جووت بین جووت! «هَوَّز» هەوەسانیان هەستا، «حُطّی» هەمی هەوی خست (بە شێوەی بادینان)، «کَلَمَن» کەلەمەکەی بە زکی کەوت (هەر بە شێوەی

بادینان)، «**سَعَفَص**» کەری فسفسێ کرد، «**قَرَشَت**» سکی شەقی برد و قیڕانی، «**ثَخَذ**» کەوتە خیزەخیز و گیزەگیز، «**ضَظَغ، فَتَبارَكَ اللهُ أحسَنُ الخالِقین**» زوو بێنە هەقی کەرێ شین.

ئەمجا سۆفی قادر وتی: دە بەخوای مامۆستا کەری تۆ کەری منی تۆپاندیە؛ بینە هەقم. مامۆستا تۆزێ ڕاما و وتی: «ابن حجر»انیش هەیە، بزانم لەوا چ دەفەرموێ. «ابن حجر»ی هێنایە پێشەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوەی و وتی: «**لَولاكَ لَولاكَ لَما خَلَقتُ الأفلاك، سُبّوحٌ قُدّوسٌ، سُبّوحٌ قُدّوسٌ رَبَّنا ما خَلَقتَ هذا باطِلاً**». کوڕم مانعاکەشی ئەمەیە: «کەری مەلا لە کۆڵانان لەناو قەرسیل و ناو لۆیان، ئەگەر خولقیان تێك دا و خستیانە فەلاکەتەوە لەسەر سبەینان لەقەی هاویشت و بە قەدەر دای لە کەری سۆفی قادری ڕێبوار و خەلقی گوندان، با برین هەزاران باتمان لە هوونیەتی ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلاً﴾ هیچت ناکەوێ و هەستە بچۆ بەولا».

سۆفی هەناسە سارد دەست لە گونان بەرەو ژێرتر بە ڕێگەی خۆیا گەڕایەوە.

٢٠١. لە دەوری «فەرامیرزا» دا لە «سنە» کوڕێکی «زاخە»یی لەسەر دزی گیرا بوو. فەرا میرزا فەرمانی خنکاندنی دەرکردبوو. ڕۆژێکیان بۆ خنکاندنەکەی دانابوو، لەو ڕۆژەدا لەبەر «دەرماڵ» سێدارەیان بۆ هەڵخستبوو. کوڕەیان هێنا بۆ ژێر سێدارە. دایکە پیرێکی هەبوو ئەویش هاتبوو بۆ سەر سێدارەکە و بە گریان و زاری بۆ کوڕەکەی دڵی ئەو عالەمەی کردبوو بە کەباب.

فەرامیرزاش لەسەر تەلارەکەوە سەیری خنکاندنی کوڕەکەی ئەکرد.

کوڕە کە چاوی بە دایکی کەوت، سەری بەرز کردەوە بۆلای فەرامیرزا و وتی: شازادە تاقە ئاواتێکم هەیە لە سەرەمەرگا بەجێی بێنە. فەرا میرزا وتی: داوای چی ئەکا بۆی جێبەجێ کەن. کوڕە وتی: «ئاواتم ئەوەیە، ئا ئەوە دایکمە، منی بەخێو کردووە و شەونخوونی بە دیارەوە کێشاوم. ڕێگەی بدەن بێتە لام دەستێك ئەکەمە ملی و هیچی‌تر».

دایکەیان بردە لایەوە دەستی کردە ملی کوڕەکەی و ئەویش دەستی کردە ملی ئەو وتی: «دایە! ئەمە ئاخر چاوپێکەوتنمە. زمانت دەربێنە با ماچێکی بکەم». دایکەکەی زمانی دەرهێنا و کوڕە دەمی نزیك کردەوە و زمانی برد بە دەما و لە بنا زمانی قرتان.

دایکە خەڵتانی خوێن بوو، لەوێ کەوت. فەرامیرزا ئەم ئیشەی زۆر بەلاوە سەیر بوو وتی: ئا بۆم بێنن، بزانن بۆچ لەو وەختەدا وای بەم دایکەی خۆی کرد؟ کوڕەیان برد و لێی پرسی. کوڕە وتی: «شازادە! ئا ئەم سێدارەیە کە بۆ من هەڵخراوە، ئەمە ئەم دایکەم بۆی هەڵخستووم».

فەرامیرزا بە سەرسامییەکەوە پرسی: چۆن؟ وتی: «شازادە! من مناڵ بووم، ڕۆژێك چووم لە ماڵە دراوسێیەك هێلکەیەکم دزی و هێنامەوە. دایکم لێی پرسیم: ئەمەت لەکوێ بوو؟ وتم: لەو ماڵەم دزی. گەلێ بە دەورما هات و پێی خۆش بوو وتی: ڕۆڵە بچۆ هی‌تریش بدزە. ئیتر هەموو ڕۆژ ئەچووم هێلکەم ئەدزی. پاش ماوەیەکی زۆر ئەمجا ئەچووم مریشکم ئەدزی و ئەمهێنایەوە بۆی. پاش ئەوە ئەچووم شتی‌ترم ئەدزی و لە ئاخرا وام لێ‌هات کار و فرمانم بوو بە دزی و ڕێگری. تا ڕۆژم بوو بەو ڕۆژە؛ ئەگەر هەوەڵجار ئەو سەرزەنشتی بکردمایە و پێی بوتمایە شتی وا مەکە، خراپە، بۆچی تووشم ئەبوو بە تووشی ئەم ڕۆژە ڕەشەوە؟ کەواتە ڕاستە ئەو سێدارەکەی بۆ هەڵخستووم. ئێستە منیش هیچم لە دەست

نایە لەم وەختەدا تەنها ئەوە نەبێ ئەو زمانەی کە منی هان دا بۆ دزی، بیبرم و تۆڵەی خۆم بسێنمەوە.

فەرامیرزا کە گوێی لە قسەکەی بوو، بە قسەیەکی گەورە هاتە بەرچاوی. لە کوڕەکە خۆش بوو، فەرمانی دا سێدارەکەیان هەڵگرت.

٢٠٢. کوڕێک لەو ناو «مەرگە»یە چاوێکی کوێر بوو. سەرەی ژن‌هێنانی هاتبوو. ئەچوون داوای هەر کچێکیان بۆ ئەکرد ـ هەرچەندە یەك چاوی بۆ پیاو عەیب نییە ـ بەڵام تۆزێ لە دانی کچەکە خزم و کەسوکارەکەی سڵیان ئەکردەوە.

کوڕەکە دایکێکی هەبوو؛ ڕۆژێك پێکەوە لە ژوورەوە دانیشتبوون. کوڕەکە ڕووی تێ‌کرد و وتی: «ئەرێ دایە، توخوا ئەم چاوەی من بۆچ کوێر بووە؟» دایکیشی وتی: «ڕۆڵە، ئەوە مناڵ بوویت سوژنێکت گرتبوو بە دەستەوە. هاتم لە دەستتم وەرگرتەوە تۆیش دەستت کرد بە گریان، دامەوە بە دەستەوە. پاشان کردت بە چاوی خۆتا ـ دایکت بمرێ! ـ ئەو چاوەت وا کوێر بوو».

کوڕە تۆزێ سەری داخست و پاشان سەری بەرز کردەوە و وتی: «دایە، گوایە تا ئێستەش هەر ئەگریام؟ ئەمە چی بوو تۆ بەسەر منت هێنا؟» بەخوا لێی ڕاست بووە و ئەوەندەی حەو کەری تۆپان.

٢٠٣. لەو وڵاتی «بڵباسەتی»یە کابرایەك هەبوو ناوی مام‌باپیر بوو. ڕۆژێك مەلای ئاواییەکەیان بانگ ئەکا و پێی ئەڵێ: «مامۆستا من مووچەت ئەدەمێ و من بەخێوت ئەکەم، کەچی تۆ ڕۆژی جومعە دوعا بۆ سوڵتان عەبدولحەمید پادشای عوسمانی ئەکەی. ئەگەر دوعا بۆ منیش ئەکەی باشە و ساڵێ ٣٠ سەر حەیوانیشت ئەدەمێ؛ خۆ ئەگەر

نایکەی هەر لە ئێستاوە جێگایەك بۆ خۆت بدۆزەرەوە. مەلا وتی: زۆر باشە، تۆ ئەوەندە شتم بدەیتێ من چۆن ئەبێ دوعات بۆ نەکەم».

ڕۆژی هەینی هات و مەلا خوتبەی خوێند و لە پاش دوعا بۆ پادشای عوسمانی وتی: «**یا أَیُّهَا الْمامْ باپیر. إنَّكَ لَدُبٌّ كَبیرٌ فَمَكانُكَ بِئْسَ الْمَصیر، وَاللّهُ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدیر**».

کابرایەکی خوێندەوار بە ڕێکەوت لەوێ بوو، سەری هەڵبڕی کە بڵێ مەلا چیت وت، مەلا وتی: «**أُسْكُتْ أُسْكُتْ أُسْكُتُون، هذا قَوْمُ حِمارون، أَعْطِیْ غَنَمُ ثَلاثُون، عَشَرَ لَكَ وَ لِيَ عِشْرون**». کابرا ئیتر هیچ دەنگی نەکرد، لە پاشا مامباپیر زۆر زۆر مەلای خۆش ئەویست و خزمەتی ئەکرد.



# زۆر دوو

٢٠٤. وڵاتی «بانە» ئاغە ڕووتەی زۆری لێیە. بایزاغا هەبوو لە گوندی «بڵەسەن» شوانی ئاواییەکەی ئەکرد. ئێوارەیەك پیرێژنێك ملی ئەگرێ و ئەڵێ: «بایزاغا» مەڕە پەرەکەمان نەهاتۆتەوە. ئەویش ئەڵێ: «نەهاتۆتەوە قیروسیا! جا وەرە شوانی بکە بۆ مسکینی کەرانباوگاو».

کابرایەکی سەرشیوی لەوێ ئەبێ، ئەڵێ: ئاغا بۆچی تۆ شوانی ئاواییەکەیت؟ ئەویش ئەڵێ: «کورە نەوەڵڵا هەر ئەوەندەیە بە ڕۆژ ڕانەکەیان بۆ ئەبەم بۆ لەوەڕ. مسکینی کەرانباوگاو چ ڕایەی ئەوەیان ئەکەوێ من شوانییان بۆ بکەم».

٢٠٥. ئینگلیز تازە هاتبوونە عێراقەوە، جارێك دوو کەسیان لە بناری هەڵەبجە ئەچن بۆ ڕاو. بە دەم گەڕانەوە ڕێیان ئەکەوێتە گوێ چەمێك. لەوێ دوو شوانی کوردیان لێ پەیدا ئەبێ. بە شتێکی سەیریان ئەزانن، ڕووتیان ئەکەنەوە و تیروپرپیشیان لێ ئەدەن.

ئینگلیزەکان ئەچنەوە بۆ بەغدا و شکات ئەکەن و بە ناونیشان دوو کوڕەکە ئەدۆزنەوە و ئەیانبەن بۆ بەغدا. لەبەرانبەر حاکمەوە ڕایان ئەگرن. ئەمانیش زمان نازانن، دیلماجێکیان بۆ دێنن.

حاکم لێیان ئەپرسێ: کە بۆچی لەو ئینگلیزانەتان داوە؟ کوڕەکان یەکێکیان ڕوو ئەکاتە ئەوی‌کەیان و ئەڵێ: «ئەرێ حەمك! ئەوە ئەم هەفمەهە یێژێ چی؟» لە پاش ئەوە کە تێیان ئەگەینن، هەر ئەوەیان

ڕوو ئەکاتە حەمك و ئەڵێ: «کورە حەمك! ئەوە ئەو سوور سوورەکەی پار نێژن کە لە گوێی ئاوەکەی "پریس" گرتمانن تێروپڕمان لێیان دا؟» حەمکیش ئەڵێ: «تۆ بێژی ئەوە بێژن؟» ئینجا هەر ئەوەیان لێویێك لە حاکمەکە هەڵئەقرتێنێ و ئەڵێ: «ئۆ، خۆزگەت پێ نەوێ و بەردی تۆی لێ نەوارێ! قسەی پار ئەگێڕیتەوە». لە پاشا کە بەم جۆرەیان ئەبینن بەرەڵایان ئەکەن.

٢٠٦. کابرایەکی قووچی سنەیی ڕێی ئەکەوێتە «پشدەر» و ئەچێتە دیوەخانی ڕەشەی ئەوڵاغا. ئاغە لێی ئەپرسێ: برا ناوت چییە؟ ئەویش ئەڵێ: «نۆکەری گەوران، غولامی سەری خانی خانان، ئاغا میرزا حەسەن خانی مورتوزا قولیخانی میراخورزادەی کەمەربەندەی سەرجوقە». ئاغە بە ئەسپایی لە شوێنەکەی خۆی ڕاست ئەبێتەوە و ئەچێ بۆ نوێژ و ڕوو ئەکاتە کابرا و پێی ئەڵێ: «کابرا تا دێمەوە ناوی خۆت کورت نەکەیتەوە کورتت ئەکەمەوە». ئەچێ دێتەوە لێی ئەپرسێتەوە: کابرا ناوت چییە؟ ئەویش خێرا ئەڵێ: «قوربان! حسە».

٢٠٧. حاجی مەلا ڕەسوولی دێلێژەیی، مەلا ئەحمەدی کوڕی لە سولەیمانی هەڵهاتبوو. لە پاش ماوەیەك شەو لە ناکاوێك بە دزییەوە هاتبووەوە.

ئینجا حاجی مەلاڕەسوول هەر بەو شەوە ئەچوو بە گەڕەکەکەوە ئەسووڕایەوە، هەرکەس تووشی ئەبوو ئەیوت: «تۆیش وەکوو ئەحمەدی کوڕم وایتە، ئەحمەد هاتۆتەوە دەنگ مەکە». عەساکەشی درێژ ئەکردەوە و ئەیوت: «ڕووسێکیشی کوشتووە». ئەو شەوە تا کەوتە بەیانی خۆی هەموو کەسێکی تێگەیاند و بە هەموو کەسیشی ئەوت: دەنگ مەکە. بەیانی کە

ڕۆژ بووەوە لەسەر دەمشڕی حاجی مەلا هاتن مەلا ئەحمەدیان گرت.

٢٠٨. مەلا «جلال موعز» کوڕێکی هەبوو ناوی حەمەحەسەن بوو. ڕۆژێک ئەچێ بەسەریا سەیر ئەکا وا حەمەحەسەن گوێزان (مووشێن)[1] ئەکا. لەو کاتەدا کە ئەم ئەچێ حەمەحەسەن پلەکەی ئەهاوێژێ و ئەڵێ: «سەر و میش و حەج» . مەلا جەلال ئەیگرێ تێروپڕ ئەیکوتێ. خەڵکی دێن لە ژێر چنگی دەریدێنن و پێی ئەڵێن: مامۆستا بەسیەتی ئیتر وازی لێ بێنە. ئەویش سوور ئەبێتەوە و ئەڵێ: «ئاخر من بەلای خۆمەوە مەلا جەلالم پێ ئێژن؛ چۆن ئەبێ حەمەحەسەنی کوڕی من بێژێ سەر و مێش و حەج».

٢٠٩. شێخێك ڕۆژێك لە شارەوە ئەچێتەوە بۆ ماڵی خۆیان. لە ڕێگا چەند ماڵێکی کورد هەڵیان‌دابوو. لا ئەداتە ناویان. ژنێکی خێڵەکە ـکە دەروێشی خۆی بوو- چاوی پێ ئەکەوێ ئەوا شێخ جەمەدانەیەکی تازەی کڕیوە و خستوویەتە ملی. ڕوو ئەکاتە خەڵکەکە و ئەڵێ: «ماشەڵڵا ماشەڵڵا، تەماشا کەن شێخ بەو جەمەدانەوە کە لە ملیایە چەند جوانە؛ ئێژی گوێرەکە سووری ئێمەیە کە گوێرەوساری تازەم کردگەسە ملی!)».

٢١٠. مەلایەك لە مانگی شەواڵدا وەعزی ئەدا ئەیوت: ڕۆژووی شەشەڵان خێری ئەمەیە و ئەوەیە. کابرایەکی کورد ڕاست

١. لەم یارییەدا سێ گوێز ئیش ئەکا، یەکێکیان ئەوەیە کە یاریکەرەکە بە دەستیەوە و پلەکەی پێ ئەهاوێژێ، ئەمەیان پێی ئەڵێن: «سەرە». ئەوانی‌تریش کە بە ڕیز دانراون هی هەرە پێشوویان پێی ئەڵێن: «میش». هی هەرە دواییان ناوی «حەج»ـە، جا ئەو کەسە کە پلەکە ئەهاوێژێ لە وەختی هاویشتنا ئەگەر وتی: (سەر و میش و حەج) ئیتر ئەو «سەرە»یە بەر هەر گوێزێ بکەوێ ئەیخوا.

بووەوە و وتی: «مەلا! مەلا بیورەوە! بیورەوە، کەسێ دایکیان نەگاوێ، ڕەمەزانی لەبیر نەچووەتەوە، ئینجا نۆرەی شەشەڵانە».

٢١١. خەلیفەیەکی گۆن ئەچێتە گوندێك، پیرێژنێکی هەژاری لێ ئەبێ دەروێشی خەلیفە ئەبێ. ئەچێتە پێشوازی و ئەیهێنێتەوە بۆ ماڵەوە. خەلیفە لە پاش تۆزێ حەسانەوە ئەڵێ: ئەچم بۆ مزگەوت نوێژەکەی نیوەڕۆم ئەکەم و ئەگەڕێمەوە. ئەویش ئەڵێ: باشە بە قوربانت بم! منیش تەنها دوو هێلکە شك ئەبەم، بۆت ئەکەمە ناو ڕۆنەوە. کە هاتیتەوە بێ‌قرە بیخۆ.

خەلیفە ئەچێ نوێژ ئەکا و ئەگەڕێتەوە. لەولاوە دەروێش شوێنی ئەکەون. ئەویش تووشی هەرکەس ئەبێ ئەڵێ: با بچینەوە بۆ ماڵەوە. بە دە پانزە کەسێکەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. کە پیرێژن چاوی پێ‌ئەکەوێ وا خەلیفە ئەم لەشکرەی لەگەڵ خۆ هێناوە، هەردوو چاوی ئەپەڕێتە تەوقە سەری و لە داخا هیچی پێ نامێنێ. وا ڕێکەوتبوو شوێنەکەش ڕووەو ڕۆژ بوو. دەستێك ئەخاتە سەر چاوی بۆ ئەوە باش بۆی دەرکەوێ کە ئایا ئەم لەشکرە خەلیفەیە یان نە. بۆی ساغ ئەبێتەوە کە خەلیفەیە، لەم قسەیە زیاتر هیچی بۆ نایە کە ئەڵێ: «گژگژ، خەلیفە بەکەڵە! گژگژ خەلیفە بەکەڵە!»

٢١٢. سێ چوار فەقێ بە دەقنە و ڕاتوو پارە کۆ ئەکەنەوە. هەریەکە دەستێ جلی تازە لەبەر ئەکەن و بۆ خوێندن ئەڕۆن کە بچن بۆ موکریان. ڕێیان ئەکەوێتە گوندێکی مەنگورایەتی؛ لە ماڵێك دائەنیشن. کابرایەکی خەڵکی دێ چاوی پێیان ئەکەوێ ئەپرسێ: ئەمانە چین؟ ئەڵێن: مەلا و فەقێن. کابرا ئەڵێ: «عاشیرەت تەماشا کەن چەن خاوێنن؛

ئەڵێی سەگی دوای مەڕن».

**٢١٣.** کابرایەکی کورد چوو لە زەوییەکدا دوو مەن هەرزنی چاند و وتی: ئەمە نانی ئیمساڵم. بۆ نەگبەتی بارانێکی زۆر باری، لافاو هەستا و هەموو هەرزنەکەی برد. کە کابراکە هاتوو سەیری کرد هەرزن نەماوە، دەستی دایە «قۆچەقانی» و چووە سەر بەرزاییەك گەلێ بەردی بۆ ئاسمان هاویشت.

پیاوێکی ژێر چاوی لێبوو؛ بۆ شەوێ چوو جووتی خۆی سێ مەن گەنمی لەجێی هەرزنەکە چاند. لەدوای چەند ڕۆژێك ناردیە لای کابرای خاوەن هەرزن وتی: بێت تەماشای بکا هەرزنەکەی ڕواوە. کە کابرا چوو سەیری کرد لەباتی گاڵ گەنم ڕواوە. ڕووی کردە ئاسمان وتی: «ها برا! هەتا شەقەی قەڵماسکت نەدی، گاڵت نەکرد وە گەنم».

**٢١٤.** کابرایەك ناوی «حەمەمراد» ئەبێ، شایەر ئەبێ، حەقایەتخوان ئەبێ. لەگەڵ «قەیتوولی» کوڕی لالەسەرحەدا برایەتییان زۆر خۆش ئەبێ. قەیتوولی ئەمرێ و حەمەمراد بە شیوەن و باوکەڕۆ ئەچێ بۆ سەر تەرمەکەی. لالەسەرحەد ئەو سەردەمە مابوو، بەڵام چاوی کوێر بووبوو. کە دەنگی هۆرەی حەمەمراد ئەبیەت ئەڵێ: عەشیرەت ئەوە من بزانم دەنگ دەنگی حەمەمرادە؟ ئەڵێن: ئەرێ بەخوا ئەوە باوکەڕۆ ئەکا. لالەسەرحەد بە یەکێ لە کوڕەکانی ئەڵێ: ئا تفەنگێکم بۆ بێرە. ئەڵێ: بۆچیتە؟ ئەڵێ: «چلۆن قەیتوولی مردوێ و حەمەمراوێ دەویت باوك ماوێ! وەو سەیساقە ئەگەر دەسی وە دەس خواوە وێ ئەوێ بیکوژم».

ئیتر خەڵکەکە پاڵێ بە حەمەمرادەوە ئەنێن و دەربازی ئەکەن.

**٢١٥.** کابرایەکی کۆنەفرۆش هەبوو لە سولەیمانی «سەعۆل»ـی ناو بوو. بەناو شارا ئەسووڕایەوە بانگی ئەکرد: «کەوا کۆن، کراسەکۆن، سەڵتەکۆن، ماڵی دەمارە تووتنی بێ دەمار».

ئێوارەیەك نوێژی شێوان لە مزگەوتی مەڵکەندی نوێژی بە جەماعەت ئەکرد؛ کە نیەتی دابەست لەباتی ئەوە بڵێت «الله اکبر» بە دەنگێکی قایم وتی: «کەوا کۆن». خەڵکەکە هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین و نوێژەکەیان بڕی و وتیان: ئەمە چی بوو؟ وتی: «بەخوا لام وابوو وام لەبەر ماڵی مینا خانما».

**٢١٦.** دوو زەلامی مەریوانی چوون بۆ گەرمیان، بوون بە سەپان. گەرما بوو، ڕۆژێك نانی گەنمیان بە دۆوە ئەخوارد. دۆیەکە زۆر کەم بوو؛ یەکێکیان وتی: «ئاخ بۆ ئاوە ساردەکە، توخوا ئێستاکە چی خۆشە؟» ئەویتر وتی: «بە من ئێستا لە «کانی خەیاران» پڕ کۆشم لە نانی هەرزن بوایە. لە دەستما وردم بکردایە بە قوڕگما و بە لوێچ و لەو ئاوە ساردەم بکردایە بە سەریا». ئەویتر وتی: «دەك ماڵت بە قوڕ گیرێ! وەڵڵا هیچ شتێکت بۆ من نەهێشتەوە کە باسی بکەم».

**٢١٧.** وەختی خۆی چای وا زۆر نەبوو. ڕۆژێك دوو زەلامی شارەزووری ئەچنە شار تێر نان و کەباب ئەخۆن و پاشان ئەچنە چایخانەیەك ـ وا ئەزانن شەربەتخانەیە ـ چایچی دوو چایان بۆ ئەبا. کە ئەیخۆنەوە یەکێکیان ئەڵێ: بەخوا گەرمە. ئەوە بۆچی وایە؟ هاوڕێیەکەی ئەڵێ: «ئێستا کوڵاندگیانە، هێشتا بەفریان تێ نەخستگە».

لە دوای ئەمە تۆزێك یەکێکیان دەست ئەبا و دوو پوول ئەدا بە چایچییەکە، چایچی ئەڵێ: خزمە هەر پیاڵەیە دوو پوولە؛ کەچی بە دوو

پیاڵە دوو پوولم ئەدەیتێ؟» کابرا هاواری ئەکرد: «خەڵکینە! تەماشای ئەم کاورایە کەن چەند بێ ئینسافە. حاجی ئەحەی کرنوو بەو پیاڵە زلانە پریشی لە بەفر ئەکا ئەیدا بە پوولێك؛ کەچی ئەم پیاوە بەو پیاڵە بچکۆلانەیە داوای یەکێ دوو پوول ئەکا. ئەوەندەش گەرم بوو هەموو دگانمان سووتا».

**٢١٨.** حاجی شێخ مستەفای محەمەد هەبوو لە سولەیمانی وتی: مەلا مەحموودێك دراوسێمان بوو، هەرچەند تووشم بهاتایە ئەیوت: مەرحەبا شێخ ئەولا. منیش ڕۆژێك وتم: مامۆستا من ناوم مستەفایە، ناوم شێخ ئەولا نییە. وتی: «ها باشە». لە دوای یەك دوو ڕۆژی تر لەسەر ڕێگا دیسانەوە تووشم بووەوە وتی: مەرحەبا شێخ ئەولا. وتم: مامۆستا چەند جار عەرزم کردیت ناوم مستەفایە، شێخ ئەولا نییە. وتی: «سا وەڵڵا وامزانی ناوت شێخ ڕەسووڵە». منیش وتم: هەی دەستت بە گونم.

**٢١٩.** کابرایەك بوو بە میوانی کابرایەکی کورد. کابرای خانەخوێ لەگەڵ ژنەکەی بوو بەشەڕیان. گوێئاگردان بوو، «سەرەبزووت» دانرابوو. ژنەکە هەر کردی بە سەرەبزووتێکا و لە بەرچاوی میوانەکەوە دای بە سەری مێردەکەیا و سەری شکاند و خوێن چۆڕاوگەی کرد. کابرای میوان بۆ ئەوە خانەخوێکە زۆر تەریق نەبێتەوە وتی: «براله وەڵڵا ژنی ئێوە باشە، بە سەرەبزووت لە کۆڵتان ئەبنەوە؛ ژنی ئێمە بە تەور و تەوراس تێمان بەر ئەبن». کابرای خانەخوێ لەو وەختەدا دەستی برد بەلایەکی پەنجەی خوێنەکەی لە ناوچەوانی سڕییەوە و وتی: «ژنی ئێمە حەیان چییە وا لەگەڵ ئێمە بکەن!».

٢٢٠. مەحمووی وردەشاتری کچێکی هەبوو ئەیدا بە مێرد. دیوەخان گەرم بوو، شیرینی ئەخورایەوە، باسی شیربایی هاتە پێشەوە، ڕوویان کردە مەحموو کە قسە بکا. ئەحەی نادری هەلاجیش هەبوو، هەڵیدایە وتی: «برا خاڵە مەحموو بە ڕیشی سپییەوە دەمی خۆی گڵاو ناکا، کوڕی هەس با ئەو قسە بکا».

٢٢١. کابرایەك ئەچێتە سولەیمانی بە بەر دووکانی پینەچییەکدا تێ‌ئەپەڕێ. مەرکانەی دەستاوەکە دانرابوو، دڵی لێ ئەچێ و پێی ئەڵێ: «خاڵۆ بکێشە بایی قرانیك لەو دۆشاوە». ئەویش گڵینەکەی بۆ پڕ ئەکا ئەیداتێ. کابرا ئەینێ بە سەرەوە هەمووی ئەخواتەوە و لە پاشا پێی ئەڵێ: «خاڵۆ نەیێژی کوردە خەشیم وو نەیزانی، دۆشاوەکە دۆشاوێکی خاس وو وەلێ چکێ تفت بوو».

٢٢٢. کابرایەك هەبوو «حەسەناغا»ی ناو بوو. جارێك لە کەندەلانێکا ماینێك ئەگێت. ئەچن بە سەریا و پێی ئەزانن، ئەویش لە شەرما ڕوو ناکاتەوە ئاوایی، سەری خۆی هەڵئەگرێ و ڕوو ئەکاتە وڵاتان.

چەند ساڵێکی پێ ئەچێ کابرایەکی لای خۆیانی بەرچاو ئەکەوێت؛ بەڵام ئەو ئەم ناناسێت. ئەچێ بە لایەوە لێی ئەپرسێ: «برا دەنگوباسی وڵاتی لای ئێوە چییە؟» کابراش ئەڵێ: وەکوو چی؟ ئەڵێ: چووزانم هەروا، حەسەناغایەك کەندەلانێ، ماینێك، شتێك! ئەڵێ: «وەڵڵا برا ئاگام لە هیچ نییە؛ چونکە لەو ساڵەوە کە حەسەناغا ماینەکەی لە کەندەلان گاوە، من لەوێ دەرچووم ئیتر نازانم».

حەسەن‌ئاغای هەژار لە دڵی خۆیا ئەڵێ: «دەك موبارەك نەبێ! خۆ ئەمە بوو بە تاریخیش». ئیتر تا مرد ڕووی نەکردەوە بە وڵاتا.

**٢٢٣.** «حاجی ئێلخان دێبوکری» ئەچێ بۆ سابڵاخ. «ئەحمەدەکەلە» و چەند خزمەتکارێکی‌تری لەگەڵ ئەبێ. هەر جارە کە بچوایە بۆ شوێنێك خزمەتکارێك ئەبوو بە کیسەدار و ئەبوایە پرسیشی بە حاجی ئێلخانی بکردایە کە چی ئەخوا. ئەم جارە ئەحمەدەکەلە بوو بە کیسەدار و مەسرەفچی و ئەم ڕەوشتی حاجی ئێلخانیشی نەئەزانی.

ڕۆژێك لێی ئەپرسێ ئەڵێ: ئاغە ئێوارێ چی ئەخۆی؟ ئەویش بە تووڕەییەکەوە تەماشای ئەکا و ئەڵێ: «گوو ئەخۆم». کابرا لە پاشا تێی ئەگەیەنن کە تەبیعەتی حاجی ئێلخانی وایە؛ واقی وڕ ئەمێنێ. ئەگەر نایهێنێ ئەزانێ بەبێ شك ئەیکوژێ، ئەگەر ئەشیهێنێ هەر ناکرێ. ناچار ئەچێتە بازاڕ هەندێ کوولەکەی گەنیو ئەکڕێ و سووری ئەکاتەوە. ئێوارە لەگەڵ شتی‌ترا دایئەنێتە بەردەستی. حاجیش سەیرێکی ئەحمەد ئەکا و پاروویێك لە کوولەکە بۆگەنەکە ئەخوا و ئەڵێ: «گێلە بە گوێشم ئەکا گووم بۆ دێنێت. دە لایەن لایەن». ئیتر ئەحمەد بەو جۆرە خۆی لە کوشتن ڕزگار ئەکا.

**٢٢٤.** «عێزەتی تەل» لە سولەیمانی لیرەیەکی دابوو بە «عەلییەتورکە» بیبا بۆی ورد کاتەوە. ئەویش ئەڕوا ون ئەبێ. لە پاش چوار ڕۆژ عێزەت چاوی پێی ئەکەوێتەوە ئەڵێ: عەلی کوا لیرەکە؟ ئەویش ئەڵێ: «ئەمە سێ ڕۆژە بە شوێنتا ئەسووڕێمەوە؛ وەرە تا حسابەکەت بدەمێ». عێزەتیش ئەڵێ: عەلی حسابی چی؟ لیرەم پێ داوی بۆم ورد کەیتەوە، ئیتر حسابی چی پێ ئەوێ؟ ئەڵێ: «ئاخر بێ‌قەزا بی! تۆ سەیرکە، هەر ئەو ڕۆژە چووم بۆم ورد کەنەوە شەش تارانیم لێ دا بە کەباب خواردم». ئەویش ئەڵێ: باشە باقییەکەی بێنە. ئەڵێ: «بێ‌قەزا بی! ئاخر سەبر

کە تا حسابەکەت بدەمێ». هەژدە تارانیشم دا بە جووتێ کەوش لە پێم کرد. ئەڵێ: باشە ئەویتری بێنە. ئەڵێ: «ئاخر قوربان تۆ تۆزێ ئارام بگرە هەتا بە پوختی حسابەکەت بدەمێ». ئەڵێ: کورە غەزەبی خوا، حسابی چی؟ من کەی حسابم لەگەڵ تۆ هەیە. لیرەم پێ داوی بۆم ورد کەیتەوە، ئیتر چ حسابێك هەیە؟ عەلیش ئەڵێ: «هۆ هۆ بێقەزا بی! تۆ گوێ بۆ پیاو ڕاناگری».

عێزەتیش ئەڵێ: ئادەی فەرموو. ئەویش ئەڵێ: «ئەی ئەمە سێ ڕۆژیشە بە شوێنتا ئەسووڕێمەوە بۆ ئەوە باقییەکەت بدەمێ، ئاخر ناڵێیت بە چی ژیاوە؟ لەم سێ ڕۆژەدا خۆ گووم نەخواردووە؛ ئەویتریشم خەرج کرد. ئەوا ئێستە بەرچاوم کەوتی، هیچ نەما بتدەمێ. من ئەڵێم سەبر کە با حسابەکەت بدەمێ ـ سەلامەت بی! ـ تۆ هەروا لە هەموو شتێکا بە پەلەی».

عێزەتیش ئەڵێ: «دەك ڕووت ڕەش بێ بۆ خۆت و بۆ لیرەیەك کە بۆت ورد کردمەوە».

قسە دێ قسە ئەبڕێ، ئەم عەلییەتورکەیە پۆستەچی بوو لە تەلخانە لە بەردەستی عێزەتا.

٢٢٥. جارێك باسی پیاوی «ئیختیار» و بە عومر ئەکرا، کاك ئەولای عەزیزی هەمەوەن گێڕایەوە وتی: جارێك لە «ئەدەنە» ڕێمان کەوتە دێیەك، کابرایەکی ڕیش ماش و برنجی لە بەردەمی مزگەوتەکەدا ئەگریا. لێمان پرسی: بۆچ ئەگری؟ وتی: باوکم لێی داوم. ئێمەش وتمان: سەیرە، با بچین بۆلای باوکی ئەم کابرایە و کابرامان برد و چووینەماڵەکەیان. ڕاست بوو، پیاوێکی پیر دانیشتبوو. لێمان پرسی:

بۆچی لەم کوڕەی خۆتت داوە؟ وتی: «قوربان ئەم ناجنسە بێ‌ئەدەبە؛ ئەمڕۆ چووە دڵی باوکمی یێشاندوە».

ئێمەش زۆر سەرسام بووین؛ هەرچەن من بە ڕەفیقەکانم وت: با بچین ئەویشمان چاو پێ‌بکەوێ، بەڵام حەمەی سلێمان وتی: خزمینە! وازبێنن. ئەگەر وا بڕوا پێویستە هەتا خزمەتی حەزرەتی ئادەم بچین.

**٢٢٦.** کابرایەکی کورد ماڵی لە «بێستانسوور» و ماڵی برایەکیشی لە «سەی‌ساق» بوو. مانگی ڕەمەزان ڕۆژێك تووشی براکەی ئەبێ لێی ئەپرسێ ئەڵێ: کاکە! ئێوە کەی ڕۆژووتان گرتووە؟ ئەڵێ: ڕۆژی جومعە. لەگەڵ ئەوە ئەمان ڕۆژی شەنبە بەڕۆژوو بووبوون، ئەو ڕۆژە کە ٢٩ی مانگی خۆیان ئەبێ ئەڵێ: بەخوا سبەینێ لە ماڵی کاکەم جەژنە با بچم لەوێ پڵاو بخۆم و سبەی شەو بێمەوە. دوو سبەی لە ماڵی خۆیشمان جەژنە؛ دیسان پڵاو ئەخۆم.

هەی پێی لێ ئەکا و ئەڕوا. لەگەڵ شەبەقی بەیان ئەگاتە ماڵی کاکی، سەیر ئەکا هیچ مەنجەڵ و دووکەڵ دیار نییە؛ ئەپرسێ ئەڵێ: خۆ ئیمڕۆ ئێوە جەژنتانە، بۆچی هیچتان دیار نییە؟ کاکەی ئەڵێ: بەخوا براکەم ئێمە دوێنێ جەژنمان کرد. چارناچار کابرا قاوەڵتی بە نان و دۆ ئەکا.

وەختی عەسر ئەڵێ: وا چاکە خۆم بگەینمەوە لای خۆمان. داوێنی لێ بەلادا ئەکا، نیوەشەو ئەگاتەوە ماڵ. ژنەکەی لە خەو خەبەر ئەکاتەوە ئەڵێ: «کچێ، ئیمشەو جەژنە هەڵسە هەر لە ئێستاکەوە پڵاوەکە لێنێ». ژنە ئەڵێ: مێردەکە هەر دوێنێ لەدوای تۆ مەلایەك هات فەرمووی: ئیمڕۆ جەژنە. ئیتر هەموو ئاوایی کردیان بە جەژن و منیش دوێنێ پڵاوم کرد. بەڵام وامزانی سندان ئەخۆم بەبێ تۆ. کابرا هەناسەیەکی هەڵکێشا و بەم

جۆرە لە هەردوو جەژنەکە بوو.

**٢٢٧.** «فەرا میرزا» ـ حاکمی سنە ـ خەرج و باجی لە هەورامی ئەسەند. ڕەوشتی ئەو دەورەش وابوو: پیاوێکی بە گالۆکێکەوە ئەناردە سەریان؛ ئەوانیش هەموو باجەکەیان کۆ ئەکردەوە و ئەیاندایە و ئەڕۆیشت. ساڵێکیان لە شاری هەورامان بۆ ئەوە کە کابرای گالۆك بەدەستیان نەیەتە سەر، هەر لە پێشەوە پارەکەیان کۆ کردەوە و دایان بە «بەلەپا» کە خێرا بیبا بۆ فەرامیرزا.

پارەیان نارد و کەچی کابرای گالۆك بەدەستیش هەر هات. وتیان: بابە پارەمان ناردووە. ئەویش بەم قسانە وازی نەهێنا، پێنج شەش پیاوی ئاقڵی باڵ بەست و لەگەڵ خۆی بردنی بۆ سنە بۆ لای فەرامیرزا. فەرامیرزا لێی پرسین، ئەوانیش وتیان: قوربان بە «بەلەپا»دا خەراجەکەمان ناردووە. کە چوونە بنج و بناوانی بەلەپاوە، ئەمە کەروێشکە؛ تومەز ئەمە چوون پارەکەیان بەستۆتە پشتی کەروێشك و پێیان وتووە ئەم پارەیە بەرە بۆ خان و کەروێشکیان بەرەڵڵا کردووە بەو نیازە پارە بەرێ.

فەرامیرزاش ئەڵێ: با بێنین تاقییان بکەینەوە بزانین ئەمە ڕاست ئەکەن یا درۆ؟ هێنایان مێوژەڕەشکە و قالۆچەیان تێکەڵاو کرد و خستیانە بەردەستیان کە بیخۆن. ئەوانیش لێی کۆ بوونەوە. قالۆچەکان هەریەکە بە لایەکدا ئەڕۆیشتن. هەندێکیان خەریکی خواردنی مێوژەکە بوون، چونکە نەئەڕۆیشت. یەکێکی ژیرتریان تیا بوو وتی: «یانەت وێران بۆ، پادار گێرۆ، بێ پا ماڵو وێمانەن»[1]. ئنجا فەرا میرزا وتی: بابە ڕاست

---

[١. ئەم ڕووداوە لەبەر چەند هۆکار جێی تێڕامانە:

**یەکەم:** لە هیچ سەرچاوەیەکی نووسراودا بۆمان نەدۆزرایەوە.

ئەکەن پارەکەیان داوە بەلەپاو بەرەڵڵای کردن. کەرویشکیش لەو لاوە خوا ئەیزانی پارەی لەکوێ فڕێ دابوو.

---

**دووەم:** فەرهادمیرزا لە ساڵی ١٨٦٩ زایینیدا کە حاکمی ئەردەڵان بووە لەشکریکی بۆ ڕامکردنی بەگزادەکانی هەورامان بەڕێ کردووە و لە دێی «هەجمنە» هۆردووی خستووە و خەبەر بۆ هەورامان دەنێرێ یا جەنگ یا ڕام، لەو کاتەدا شێخ بەهائەددینی کوڕی شێخ عوسمانی تەوێڵە نامەیەکی بۆ ئەنووسێ و داوای لێ ئەکات کە مودارا بکات لەگەڵ هەورامییەکاندا کە خەڵکێکی فەقیر و نەدارن، بەڵام فەرهادمیرزا بۆی ئەنووسێتەوە:

**ما شیخ و زاهد نمی‌شناسیم　　　یا جام باده یا روی ساقی**

شێخیش کە ئەزانێ پیاوێکی تێنەگەیشتووە بۆی ئەنووسێتەوە:

**ما میر و سلطان نمی‌شناسیم　　　یا عدل و احسان یا قهر باقی**

پاشان هەورامییەکان لەسەر ئیزنی شێخ هەڵئەکوتنە سەر لەشکری فەرهادمیرزا و ئەیانشکێنن و فەرهادمیرزا بە هەڵەداوان خۆی ڕزگار ئەکات. فەرهادمیرزا ئەم ڕووداوەی لە «مونشەئات»ـەکەیدا نووسیوە. ئێستە قسە ئەوەیە: ئایا کەسانێك کە ئەوەندە ئەسبابی شەڕ و چەك و چۆڵیان بووبێت و توانیبێتیان لەشکری حاکمی ئەردەڵان بشکێنن، کاری وا نەشیاو و ساویلکانەیان لێ‌ئەوەشێتەوە؟ (یادی مەردان بەرگی ٢ لاپەڕەی ٨١ چاپخانەی بەغدا ـ ١٩٨٣).

**سێهەم:** ئەم ڕووداوە تەنها دەماودەم بیسراوە و گێڕدراوەتەوە، ئەوەش کە بیسراوە جیاوازە لەگەڵ ئەم نووسراوەی جەنابی مامۆستادا، کە گوایە هەورامی ساویلکە بوون و لە ڕاستیدا کاری وایان کردووە و پارەیان بەستووە بە کەروێشکەوە و ناردوویانە بۆ حاکم لە شاری سنە، بەڵام ئەوەی لە ڕاستییەوە نزیکە ئەمەیە: کە ئەمان وەك ڕابواردنێك بە فەرهادمیرزا خۆیان گێل کردووە و وتوویانە باجەکەمان بە کەورێشکدا ناردووە! گوایە حاکمیش بۆ ئەوە بزانێ ئەمانە گێلن یا خۆیان گێل کردووە مێوژ و قالۆنچەیان بۆ دائەنێ، هەورامییەکانیش ئەزانن مەسەلە چییە، یەکێکیان ئەڵێ: «پادارێ گێردێ بێ پێ ماڵو وێمانێ» جا دەست ئەبەن بۆ قۆلانچەکان تا فەرهادمیرزا بە گێلیان بزانێ و وازیان لێ بێنێ!.

**چوارەم:** هەندێك لایان وایە ئەم ڕووداوە هی زۆر کۆنە و تەنانەت هی پێش ئیسلامە، بە هەرحاڵ ئەگەر هی زەمانی فەرهادمیرزایش بێ، هی پێش لەشکرکێشییەکەیەتی... (هەڵەگر). بڕوانە بابەتی ژمارە: ١٣٨٥]

٢٢٨. «هەمزاغا»ی‌مەسرەف شەوێك چەند پیاوێكی گەورە لە دیواخانەكەیا ئەبن. ئەویش خزمەتكارێكی ئەبێ پێی ئەڵێ: ڕۆڵە، سبەینێ پێویستە ئەبێ تا «گورگەدەر» بچی.(گورگەدەریش دێی هەمزاغا ئەبێ) كابرا بەیانی زوو بەبێ ئەوە بچێ لە ئاغا بپرسێ ئیشی چییە، ملی ڕێگا ئەگرێ و ئەچێ بۆ گورگەدەر.

كوێخاكەی گورگەدەریش ـكەخزمەتكاری ئاغا ئەبێ- پیاوێكی عەنتیكە ئەبێ. لە كابرا ئەپرسێ خێرە وا هاتووی؟ ئەڵێ: بەخوا ئیمشەو گەلێ میوانمان هەبوو، ئاغا فەرمووی: پێویستە بەیانی بچی بۆ گورگەدەر، ئیتر منیش بەیانی زوو هەڵسام و هاتم. كوێخاش تێ‌ئەگا كە ئەم كابرایە دیارە زۆر عاقڵە! ئەڵێ: باوكم! وەختی خۆی ئاغام بە منی فەرموو هەروەخت پیاوێكی ئازام نارد، باگردێنێكی بەرد لەسەر بانی مزگەوتەكەیا بە گوریس ببیەستە بە كۆڵیەوە با بۆم بێنێ؛ چونكە ئەگەر بە وڵاخ بینێرن دوور نییە لە ڕێی «گۆیژە» وڵاخەكە بكەوێ و باگردێنەكە بشكێ.

ئیتر ڕۆژی دوایی كوێخا باگردێن لە كۆڵی كابرا توند ئەكا و خۆیشی لەگەڵی دێت. ئیوارە ئەچنە ماڵی ئاغایان. هەمزاغا كە ئەمەی چاو پێ‌ئەكەوێ زۆر پێئەكەنێ و كابرا خەڵات ئەكا كە ئەم بەزمەی بۆ ناوەتەوە. بە وڵاخێكیشدا باگردێنەكە لەگەڵ كوێخا ئەنێرێتەوە بۆ گورگەدەر.

٢٢٩. كابرایەكی خەڵكی دێی «باخان» ناوی حەسەن‌مەنگوری بوو، لەسەر پیاو كوشتن بۆ پانزە ساڵ خرابووە بەندیخانە. شەش ساڵ بوو لە بەغدا حەپس بوو، ڕۆژێك پیاوێكی باخانی ئەچێتە دێی «قەرەنگوێ» تەماشا ئەكا پیاوێكی پینەچی دانیشتووە كەوش پینە ئەكا، بەڵام زۆر شێوەی لە «حەسەن‌مەنگوری» ئەچێ. دێتەوە بۆ

براکەی حەسەنی ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: پیاوێکی وا لە قەرەنگوێ پینەچییە، هەروەکوو حەسەنی براتان وایە. ئەویش دەستبەجێ سێ چوار کەسی‌تر لە خزمی خۆیان هەڵئەگرێ و ئەچێتە قەرەنگوێ تەماشای پینەچی ئەکەن. ئەڵێ: حەسەن: ئەڵێ: «باوکم، من ناوم ئەحمەدە؛ ناوم حەسەن نییە». ئەوانیش ئەڵێن: «تۆ خۆت لە ئێمە مەگۆڕە؛ تۆ حەسەن مەنگوری و لە حەپسخانە ڕاتکردووە لە ترسی حوکوومەت، ڕاستی ناڵێی، هەڵسە بچینەوە سەر ماڵ و دەوڵەت و ژنی خۆت».

هەرچەند کابرا ملپێچی و قنگەجرێ ئەکا و سوێند ئەخوا من حەسەن نیم، ئەڵێن: خزمە، ئێمە دوڕ ناسین. تۆ هەر حەسەنیت، گۆیا ئەبێ ئێمە خزمی خۆمان نەناسینەوە؟!

بە زۆر لەگەڵ خۆیان ئەیبەن بۆ باخان. خەڵکی دێ هەموو لە ماڵی حەسەن مەنگوری کۆ ئەبنەوە و هەموویان بڕیاری لەسەر ئەدەن کە ئەم پیاوە حەسەن مەنگورییە. گورج تفەنگێ قۆناغ خڕ و دەمانچەیەکی پەرەبەلۆی ئەدەنێ، جلی بۆ ئەکەن و شەوێ ئەیخەنە باخەڵی ژنی حەسەنەوە. بەیانی ژنەکە ئەڵێ: خوا هەڵناگرێ! ئەم کابرایە من بە حەسەنی نازانم. برا و خزمەکانی حەسەن ئەیانگوت: تۆ ئاخۆ حەزت لە کێ کردووە، ئێمە قابیلە کەسی خۆمان نەناسین؟

بەم جۆرە مانگێك کابرا گل ئەخواتەوە، هەموو ماڵی حەسەن بە ژنەوە ئەیدەنە دەستی. هەتا ڕۆژێك کابرا هەندێ پارەشیان ئەبێ، بە تفەنگ و دەمانچە و شتومەکەوە هەڵیئەگرێ و شانی پیا ئەکا و ئەڕوا. ئاخری لە دوای دوو ساڵێك حەسەن مەنگوری ڕاستەقینە لە حەپسخانە بەر بوو، هاتەوە چووە سەر ماڵی خۆی.

حەمەبەگی حاجی ڕەسووڵ‌بەگ ئەیوت: ئەم حەسەن مەنگورییە

خۆی و ژنەکەی مابوون و ماڵیان لە دێی «جوتبڵاخ»[1] بوو؛ من هەردووکیانم ئەناسی.

**٢٣٠.** لە «مەرگە» سێ چوار کەس لە بەگزادەکان دانیشتبوون، باسی زەمانی پێشوویان ئەگێڕایەوە. «عەوڵابەگ»یان وتی: نە پیاوی گەورە وەکوو گەورەکانی جارانن، نە پیاوی ئازاش وەکوو پێشینەکان ئازان. ساڵێك یووزباشییەکی ڕەدیف لە مەرگە بوو، ماڵی لە گەڕەکی «کانی سەردەشت» بوو. حەمەبەگ فەرمووی: بەگزادە ئەوە پیاوێکتان نییە ئەم کابرایە بکوژێ؟ خۆ ئەگەر وەها بمێنێ ساڵێکیتر ژنەکانیشتان قاف ئەکا.

ئیتر مەحمووبەگی شاخولکە هەڵسا تفەنگێکی تەرەقەی سەر و قنگ برنجەی بەدەستەوە بوو، لێی دا ڕۆیشت. قەت سەعاتێکی پێ نەچوو، دیوەخانەکە بڵاو نەبووبووەوە هاتەوە وتی: غولامی سەری حەمەدبەگم و دەستی ماچ کرد. سبەینێ کە هەڵساین یوزباشییەکە کوژرابوو. ئیتر خوا هەقە حەمەدبەگیش کوڵەنجەیەکی شیرداخی کرد بە خەڵاتی مەحمووبەگا.

**٢٣١.** مەلا ساڵحی «تەڕەمار» ئەبێ، پیاوێکی زۆر بەناوبانگ بوو. لە ڕەزە هەنجیرەکەیا تەنها یەك هەنجیری گەیشتوو ئەدۆزێتەوە، گورج بەرچنەیەك ئەهێنێ هەتا نیوەی گەڵای تێ ئەکا؛ ئنجا هەنجیرەکە لەناو گەڵاکەدا دائەنێ و لە سەریشیەوە هەتا بەرچنە پڕ ئەبێ، گەڵای تێ ئەکا و ئەیگرێ بە کۆڵیەوە بە دیاری ئەیبا بۆ «سلێمانپاشا».

وا ڕێ کەوتبوو پاشاش هەرچ پیاوماقووڵ و گەورەی بابانە، لەلای دانیشتبوون. پاشا ئەڵێ: مەلا ئەوە چییە بە کۆڵتەوە؟ مەلا ئەڵێ: قوربان

[١. «جوتبڵاخ» = «جۆبڵاخ» (هەڵەگر)].

هەنجیرە نۆبەرەیە بۆم هێناوی. پاشا ئەڵێ: بەخێر بی! هەڵیبپچڕە با هەریەکە دانەیەکی لێ بخۆین و نۆبەرەیە بەلەزەتە.

مەلا بەرچنە هەڵئەپچڕێ هەرگەڵا دەردێنێ تا ئاخری تاقە هەنجیرێك بە دەستەوە ئەگرێ ئەڵێ: فەرموو پاشا. ئەڵێ: ئنجا مەلا من ئەوە چی لێ بکەم؟ مەلا هەنجیرەکە جوان‌جوان پاك ئەکا و ئەیخاتە دەمیەوە و ئەیخوا ئەڵێ: پاشا ئاوای لێ‌بکە. پاشا قاقا دەست ئەکا بە پێکەنین و ئەڵێ: سەد قڕان هەقی هەنجیرەکە و سەد قڕان هەقی خواردنەکەی بدەن بە مەلا.

**٢٣٢.** عەوڵاپاشای بابان ڕۆژێك لە وەزیرێکی خۆی تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: هیچکەس نابێ هاتوچۆی بکا. کابرا شەوێك بە دزییەوە ئەچێتە ماڵی دۆستێکی کە لە هەوەڵا خۆی هێناویەتە پێشەوە. هەرچەند بانگی ئەکا دەرگای لێ ناکاتەوە. بانگی ئەکا ئەڵێ: تکات لێ ئەکەم هەر ئەوەندە وەرە ئەو دیو دەرگاکە منیش لە دەرەوە حەکایەتێکت بۆ ئەکەم، ئیتر ئەڕۆم نامەوێ دەرگام لێ بکەیتەوە.کابرا دێت لە دیوی ژوورەوە لە پشت دەرگا ئەوەستێ و ئەڵێ: فەرموو بزانم حەکایەتی چیم بۆ ئەکەی؟

وەزیر ئەڵێ: «کابرایەك بوو دوو ژنی هەبوو؛ یەکێکی سپی و جوان، یەکێکی ڕەش و ناشیرین. قەت نەئەچووە ماڵی ژنە ناشیرینەکە بنوێ. شەوێك لەگەڵ ژنە جوانەکە شەڕی ئەبێ. ژنەکە سوێندی لێ ئەخوا ئەڵێ: نابێ لەم ماڵە ڕۆژ بکەیتەوە. ئەویش ئەچێ بۆ ماڵی ژنەکەی‌تری. ژنە ناشیرینەکە ئەپرسێ: ئەوە چلۆن بوو ئیمشەو هاتی بۆ ئێرە؟ ئەڵێ: بەخوا لەگەڵ ژنەکەی‌ترم شەڕمان بوو؛ منیش هاتووم بۆلای تۆ. ئەویش ئەڵێ: ئەوە لەولاوە دەریان‌کردووی بۆیە هاتوویتە لای من؛ سا بەخوا

منیش دادت ناگەم و نایەڵم لێرە بنوی و دەرگای لێ ناکاتەوە. کابرا ئەڵێ: «ژنەڕەش، خوا ڕووی ژنە سپییەکەم ڕەش بکا کە هۆی منی خستە تۆ و تۆش دەرم ئەکەی».

٢٣٣. کابرایەکی پاوەیی لە دێیەکەی خۆیان دێتە دەرەوە بە نیازی سواڵکردن. ئەگاتە قەراخ ئاوایی چاو ئەنووقێنێ و دەست ئەکوتێ بەردێکی گەورە هەڵئەگرێ. ئینجا ڕوو ئەکاتە ئاسمان و ئەڵێ: «خوایە! تۆ ڕیشێکی پان و زمانێکی لووسم بدەرێ ئیتر ڕزقی خۆم لەسەر خۆم. شەرت بێ تا بە گرانایەتی ئەم بەردە پارە نەیەنمەوە، نەیەمەوە».

٢٣٤. کابرایەکی کورد کوڕێکی منالی خوشکەزای لەگەڵ ئەبێ. بە ڕێبواری شەوێك ڕێیان ئەکەوێتە ماڵە گۆرانێك. ماڵە ئەو شەوە نیسکێنە بە نۆکیان ئەبێ. کوڕە ئەوەندە ئەخوا هەتا لە لووتی دێتەوە. شەو کە ئەنوون لە نیوەشەوا تەقەیەك دێ، کابرای کوردە ئەڵێ: ئەوەچی بوو؟ کوڕەکە ئەڵێ: «خاڵە هیچ نەبوو، ئەوە من بووم شەقم برد». تومەس نۆکەکە تلیساوەتەوە و تەقاندوویەتی.

٢٣٥. ئاواییەك لەو «بەرکێو»ە گاوانیان نەبوو. پیاوێکی تەمەڵی تەوەزەل لەوێدا بوو، بانگیان کرد وتیان: گاوانییەکەمان ئەکەی یان نە؟ وتی: «ئەگەر کەرێکم بۆ کورتان بکەن سواری بم، هەمانەیەکم مێوژ بدەنێ لە بەردەمما داینێم بیخۆم، منداڵێکیشم لەگەڵ بنێرن ئەگەر گاگەلەکە بڵاوەی کرد بۆم کۆ بکاتەوە، بۆچی نایکەم!».

٢٣٦. سێ جەردە لە شێوێکا تووشی پیاوێك بوون، کەرێك و هەندێ شتومەکی پێ بوو. گرتیان ڕووتیان کردەوە. هاتن

بڕۆن تەماشایان کرد وا خێڵێکی جاف لەو نزیکانەوە دەواریان هەڵداوە. وتیان: ئەگەر کابرای ڕووت کراوە هاوار بکا خۆ ئەم هۆبەیە ئەمانگرن. هاتن هەردوو قۆڵی کابرایان بەست و سواری کەرەکەی خۆیان کرد و بەناو ماڵەکانا بردیان. کابرا هاواری کرد: خەڵکینە بۆ خاتری خوا ئەمانە جەردەن؛ ڕووتیان کردوومەتەوە چارێکم بکەن. یەکێ لەجەردەکانیش ئەیوت: «خوا بکا تۆ چاك ببیتەوە قەیناکا با ئێمە جەردە بین».

خەڵکی ئاواییەکە پرسییان: ئەمە چییە؟ جەردەکان ئەیانوت: «قوربان! ئەمە برامانە. سێ چوار شەو لەمەوپێش چووبووە سەر کانی دەستیان لێ وەشاندووە و شێت بووە. ئێمەش ئەیبەین بۆ سەر "میری سوور"». خەڵکەکەش وایان زانی ئەمانە ڕاست ئەکەن. هەرچەن کابرا هاواری ئەکرد و سوێندی ئەخوارد کە خەڵکینە ئەمانە ڕێگرن و ڕووتیان کردوومەتەوە ئەوان هەر ئەیانوت: «خوا و میری سوور شفات بدەن!». بەم جۆرە تێپەڕین تا دوور کەوتنەوە. کابرایان بەرەڵا کرد و گوێدرێژ و شتومەکەکەیان برد و بەبێ ئارەق دەرچوون.

**٢٣٧.** کابرایەکی کورد چووبوو بۆ بەغدا. کە هاتەوە خزم و دراوسێ هاتن بۆلای. لەدوای بەخێر هاتنەوە و چاك و خۆشی، لێیان پرسی: دەنگوباسی بەغدا چییە؟ کابرا برایەکی هەبوو ناوی بارام بوو، پێیان ئەوت «بالك». ئینجا لە جوابی خزماندا وتی: «بەخوا عەشرەت دەنگوباسی بەغدا هیچ نییە، بەڵام شۆرەت هەر شۆرەتی بالکی برامە بە بازاڕا بە کۆڵانا هەرچی ئەڕوا هەر ئەڵێ، بالك، بالك».

**٢٣٨.** پیاوێکی دەوڵەمەند ئەسپێکی چاکی هەبوو، ون بووبوو. جارچی بۆ گرت کە هەرکەس بیدۆزێتەوە سەد قڕان مۆژدە

وەربگرێ. کابرایەکی کورد بە پەلەپەل چوو وتی: «ئاغە ئەسپی جەنابت گوم بووە و ڕاستە فەرمووتە هەرکەس بیدۆزێتەوە سەد قرانی ئەدەمێ؟» ئاغە وتی: بەڵێ، ئیشەڵڵا دۆزیوتەتەوە. کابرا وتی: «نەخێر، نەمدۆزیوەتەوە هەر بۆی ئەگەڕێم؛ بەڵام هاتوومەتە خزمەتت بەڵکە پێشەکی پەنجا قرانێکم بدەیتێ، هەتا بەخێر ئەیدۆزمەوە».

**٢٣٩.** ئەم قسەش با لەسەر قسە کوردییەکان بێ ئەڵێ: ڕۆژێك کابرایەك لە ئەستەموڵ ئەچێتە ئیدارەخانەی ڕۆژنامەیەکی بەیانی. بە مودیرەکە ئەڵێ: دوێنێ ڕۆژنامەکەتان مردنی منی نووسیبوو، سەرم سڕ ما، نازانم بۆچی بە درۆ ئەوەتان نووسیبوو؟ مودیرەکە ئەڵێ: «غەزەتەی ئێمە بە درۆ هیچ نانووسێ. ئەگەر خەبەرێکی وا ناخۆشی نووسیبێ، هەڵبەت ڕاستە». کابرا ئەڵێ: چلۆن ڕاستە؟ ئەمەتە لەبەر چاوت ساغ و سەلیم ڕاوەستاوم. پێویستە هەر ئەمڕۆ لە ڕۆژنامەدا ئەو خەبەرەی دوێنێتان بخەنە درۆوە. مودیر ئەڵێ: «لێم ببوورە ئەمەی تۆ ئەفەرمووی ڕێ ناکەوێ؛ چونکە ڕۆژنامەی ئێمە هەر شتێ ڕاست نەبێ نایننووسێ، وە ئەگەر خوانەخواستە خەبەرێکی درۆیشی نووسیبێ خۆی نابێ خۆی بەدرۆ بخاتەوە».

کابرا ئەڵێ: چلۆن؟ ئەی پیاوێکی زیندووی زل و زەلام بە مردوو نیشاندان مەعنای چییە؟ مودیر ئەڵێ: «بابە پێی ناوێ تەگبیرێکم دۆزیوەتەوە بەو جۆرە زیندووت ئەکەینەوە». ئەڵێ: ئا بزانم تەگبیرەکەت چییە؟ مودیر ئەڵێ: «ئێمە وەکوو ئەوانەی کە ئەمرن مردنیان ئەنووسین، ئەوانەش کە تازە لەدایك ئەبن ئەوانیش ئەنووسین. ئینجا لە ڕۆژنامەی بەیانیماندا لەگەڵ ئەو منداڵە تازە بووانە ناوی تۆش ئەخەینە ناوەوە». کابرا بەم قسەیە ڕازی ئەبێ و ئەڕوا.

٢٤٠. جارێك لە سولەیمانی فەقیەكانی مزگەوتی گەورە تانجییەك ڕاو ئەنێن هەتا ئەیكەن بە ژووری مزگەوتەكەدا. لەوێ هەموو قاپی و پەنجەرەی لێ دائەخەن و سەگ‌بەحەساری پێ ئەكەن. تانجی هەموو مزگەوتەكە پیس ئەكا و لە ترسانا ئەپەڕێتەوە سەر منبەرەكە و دەست ئەكا بە قووڕەقووڕ. ئەو ئەقووڕێنێ و فەقیەكان بۆی ئەسێننەوە.

لەم هەرا هەرایە مجەورەكە ئەچێ خەبەر ئەدا بە «سەید ئەحمەدی بابەڕەسووڵ» كە فەقیەكان سەگێكیان خستۆتە ژووری مزگەوتەكە و سەگ‌بەحەساری پێ‌ئەكەن. سەید ئەحمەدیش تووڕە ئەبێ و دارعەساكەی ئەگرێ بە دەستەوە و دێت بۆ فەقیەكان لێیان بدات.

فەقێ كە ئەزانن وا سەید هات، ترسیان لێ ئەنیشێ. یەكێكیان قومارباز ئەبێ ئەڵێ: ئێوە لێ‌گەڕێن ئێستە من چاری ئەم ئیشە ئەكەم.

سەید دێت و ئەڵێ: «هەی وا وا لێ كراوینە! ئەوە چۆن سەگتان كردۆتە ژووری مزگەوتەوە؟» ئەو فەقیەیان ئەچێ بە پیریەوە و ئەڵێ: «قوربان، بەسەری تۆ سەگ نەبوو تانجی بوو». ئیتر سەید سارد ئەبێتەوە و ئەڵێ: «توخوا تانجی بوو؟ سا وەڵڵا لام وابوو سەگ بوو، كەواتە دیارە مجەورە قومار‌بازەكە درۆی كردووە». فەقێش ئەڵێ: «نەوەڵڵا قوربان تانجی بوو».

٢٤١. ئەم قسەش هەر لەناو كوردا ئەگێڕنەوە ئەڵێ: موسوڵمانێك و جوولەكەیەك و گاورێك چوونە بەر دەرگای بەهەشت ویستیان بچنە ژوورەوە. قاپیوانەكەی بەهەشت لە موسوڵمانەكەی پرسی: ناوت چییە؟ وتی: «محمّد». پێی وت: فەرموو بچۆرە ژوورەوە. لە گاورەكەی پرسی: تۆ ناوت چییە؟ وتی: «پەترۆس». وتی: «یالڵا دواوە، ڕێگە نییە». لە جوولەكەكەشی پرسی: تۆ ناوت چییە؟ وتی: «قوربان شەلەمۆی

خزمەتکارت». وتی: «یاڵڵا دواوە دواوە دەموفلّقت خواتەوە».

لە پاشا جووە بە گاورەکەی وت: وەرە ئێستە من ئەتبەمە ژوورەوە. چوو گۆنییەیەکی هێنا گاورەکەی تێ خست و دای بەسەر شانیا، چووەوە بۆ بەردەرگای بەهەشت. دەرگاوان لێی پرسی: ئەوە چییە؟ وتی: قوربان کیسە و سەبیلی محەمەدە، لێی بەجێ ماوە بۆی ئەبەمە ژوورەوە». ئینجا وتی: باشە بچۆ بۆی بەرە.

**٢٤٢.** «حەسە بێلووتە» هەبوو لە سولەیمانی زۆر حەزی لە زەماوەن و هەڵپەڕکێ ئەکرد. لەرزۆکیش بوو کە ئەیبیست شاییەك لەسەر شەقام هەیە، ئەم سەرلەبەیان لەرزەلەرز لە مەڵکەندییەوە بۆی بەڕێ ئەکەوت تا ئەچووە سەر زەماوەنەکە ئەوان لە نیوەی ئەبوونەوە.

کە چووە ئەوێ ئەوا هەڵپەڕکێیە. ئەم خەریکی پشتێنەکەی ئەبوو ڕێکی ئەخست بە دەمیشیەوە ئەیوت: «دەی برام، دەی خەریك بن وا هاتم ئێستە بۆتان گەرم ئەکەم». کە لە پشتێنەکەی ئەبووەوە خەریکی ڕێکخستنی فەقیانەکەی ئەبوو. لەبەر ئەوە لەرزۆك بوو، بۆی ڕێك نەئەخرا. بەم بۆنەوە ئێجگار زۆر پێوە ئەبوو. تا ئەم ئەمانەی ئەکرد شایی لێ ئەبووەوە و خەڵکەکە بڵاوەیان لێ ئەکرد؛ ئەمیش بە هەناسەی سارد ئەگەڕایەوە. قەت بۆی ڕێ نەکەوت جارێك بە زەماوەنێکا بگات.

**٢٤٣.** مەلایەك لەو کوێستانە ئەچێتە هەر دێیەك لە پاش شەش حەوت ڕۆژ بار ئەکا و ئەڕوا. ئیتر هەر بەوەدا ڕا ئەگا بارکا و کۆچ و بار بخا. لە ئاخرا دوو گوێدرێژی ئەبێ، شڕ و شاتاڵی ماڵەکەی ئەنێ لە گوێدرێژێکیان و مەلاژن و بێشکەکەش ئەخاتە سەر ئەویکەیان و دێبەدێ ئەسووڕێتەوە.

ئەچێتە هەر ئاواییەك لە قەراخ ئاوایی ئەپرسێ: ئەم ئاواییە مەلای هەیە؟ ئەگەر وتیان هەیەتی، ئەوا هیچ، بەبێ ئەوە لا بدا لێ ئەدا ئەڕوا؛ خۆ ئەگەر وتیان: نیەتی ئەوا لا ئەدا.

ڕۆژێـك بەسـەر لاجـانا ئەهاتە خوارەوە ڕێی کەوتە گوندێك. پرسـی: ئەم گوندە مەلای هەیە؟ وتیان: نە. وتی: کەواتە چار نییە، ئەبێ ببم بە مەلای ئەم گوندە. کۆچوباری خست و خەڵکی ئاواییەکە لێی کۆبوونەوە وتیان: «بابە ئێمە مەلامان ناوێ». وتی: «کورە ئێوە قسەی سەیر ئەکەن، مەلامان ناوێ یانی چی؟ من واجب بوو لەسەرم ئەبێ دانیشم. جا ئیتر با ئێوە هەر بڵێن مەلامان ناوێ».

**٢٤٤.** کابرایەك لە پاش نیوەشەو بەناو شارا ئەسووڕایەوە، پاسەوانەکان هاتـن گرتیـان وتیان: تۆ دزیـت. وتی: باوکم، من دز نیم، بەڵام نامەوێ بچمەوە ماڵی خۆم. هەرچەن قسـەی کرد کەڵکی نەبوو، بردیان بۆ بەندیخانە و ئەو شەوە حەپسیان کرد و بەیانی بردیانە لای قازی. قازی وتی: تۆ بۆچی ویستووتە دزی بکەی؟ ئەویش وتی: «جەنابی قازی من دز نیـم، بـەڵام نیـو سـەعات موڵەتم بـدە و پیاوێکم لەگـەڵ بنێرە ئەچمە ماڵەکەی خۆم و ئەگەڕێمەوە. ئەو وەختە چیم لێ ئەکەی لێم بکە».

قازی وتی: باشە و پیاوێکی لەگەڵ نارد. کابرا چووەوە ماڵەوە. ژنێکی زۆر ناشیرینـی هەبوو وتی: «ژنەکە هەستە خۆت کۆ کەوە با بچین». ژنە کەوتە تەکی و چوونەوە بۆ لای قازی. کابرا دەستی برد پەچەی ژنەکەی هەڵدایەوە وتی: «جەنابی قازی یەکێ ئامە ژنی بێ، نەوەك تا نیوەشـەو بەڵکوو تا بەیانیـش ئەچێتـەوە بـۆ ماڵـەوە؟» قـازی کـە ئەمەی بیسـت و ژنەکەی چاوپێکەوت بەرەڵای کرد.

٢٤٥. کابرایەکی کورد لە دەشتێکا تووشی بەگزادەیەکی جوانی ڕاوچی ئەبێ. بازیکی بەسەر دەستەوەیە و دوو تانجی لە پێشەوە. شێوەی کابرای زۆر بەلاوە جوان ئەبێ، دێتەوە لە ماڵەوە ئەیگێڕێتەوە ئەڵێ: «لەو دەشتە تووشی بینایی چاوان بووم. جورەیلی لەسەر دەستەوە و هەنکیر و مونکیریش لە پێشیەوە هەڵقون‌هەڵقونیان بوو».

٢٤٦. «حەماغای باغلۆجە» خزمەتکارێکی ئەبێ، ئاغەژن ئەینێرێ بۆ بۆکان بۆ لای «حەنا جوو» هەندێ شتوومەکی ژنانی بۆ بێنێ. کابرا تا ئەچێتە بۆکان و لای حەنا، لە فیکری ئەچێتەوە کە بۆچییان ناردووە. هەرچەندە حەنا لێی ئەپرسێ: بۆچی هاتووی؟ کەڵکی نابێ، ئەگەڕێتەوە.

ئینجا دێن پارەکەی بۆ ئەبەستنە گۆشەی دەسەسڕیکەوە و ئەیدەنێ. پێی ئەڵێن لە ڕێگادا هەر بڵێ: «خەنە و وسمە و حەنایی» ئیتر لە فیکرت ناچێتەوە. ئەمیش دێت و لە ڕێگەدا دەسەسڕ هەڵئەسووڕێنێ و هەرکەس قسەی لەگەڵ ئەکا هەر ئەڵێ: «خەنە و وسمە و حەنایی». بەم جۆرە دێتە بۆکان و بەناو شارا هەڵئەپەڕێ تا ئەگاتە لای حەنا جوو. ئیتر حەنا تێ ئەگا و بەڕێی ئەکا.

٢٤٧. «حاجی برایماغای عەنبار» لەگەڵ حەمەڕەحیمی خزمەتکاریا ئەچنە سابڵاخ. جومعە دادێت و ئەچن لە مزگەوتی سوور نوێژی جومعە ئەکەن. ئەگەڕێنەوە بۆ عەنبار. برایماغا لە حەمەڕەحیم ئەپرسێ: «ئەرێ حەمەڕەحیم نازانم چ ڕۆژێك بوو لە مزگەوتی سوور نوێژی جومعەمان کرد؟» حەمەڕەحیمیش تۆزێ فیکری بۆ ئەکاتەوە و پەنجەیەکی خۆی ئەنێتە سەر لێوی و لە پاشا ئەڵێ: «وەڵڵا ئاغە لام وایە

ڕۆژی سێشـەنبە بـوو!». ئاغاش ئەڵـێ: «بە گـۆڕێ بابم ڕاسـت ئەکەی وا منیش کەوتەوە بیرم».

**٢٤٨.** دینارێکـم لای موقـەددەم ئەمیـن ڕواندزی بـوو، نەیئەدامەوە. ڕۆژێـك دانیشـتبووین دەسـتی کرد بە قسـە کردن و من هیچ دەنگـم نەکـرد. وتی: بۆچ دەنگ ناکەی؟ وتم: چـارم ناچارە، تا دینارەکەم نەدەیتـەوە هـەر شـتێك بڵێیت دەنگ ناکـەم. ئەمین ئەمـەی تۆزێ پێ خۆش بوو، ئیتر لە هەر شوێنێك دائەنیشتین بە ئارەزووی خۆی دەستی ئەکرد بە قسەکردن. منیش یان ئەموت وایە وەیان هیچ دەنگم نەئەکرد.

ڕۆژێـك لە بەغدا لە کۆڕێکا دانیشـتبوویـن. خانووێکی هەبوو دابووی بە «سەعید فەهیم» و لەسەر خانووەکە تۆزێ تێك چووبوون. توورە بووبوو دەستی کرد بە قسە کردن وتی: «من پیاو نیم. دیارە زۆر خراپم، ناجنسم، ئەگینـا چـۆن خانوو ئەدەم بە سـەعیدفەهیم؟» منیش هیچ سێ و دووم لـێ نەکـرد وتـم: «ئەشـەنوبیللا ڕاسـت ئەکـەی». ئەمیـش بـە مۆڕێکەوە سەیرێکی کردم و دەستی کرد بە باڵیا وتی: «ها ئەوە دینارەکەت و هەستە؛ بڕۆ من شایەتی وام ناوێ».

**٢٤٩.** سـاڵێك لە بەغدا بۆ دائیرەیەکم نووسـی کە بیسـت ڕۆژ ئەچم بۆ دەرەوە. ئەوا ئەحمەدحەسەن ناوم لە شوێنەکەی خۆم دانا بـە وەکیـل و لێم دا ڕۆیشـتم و هاتمـەوە ئـەم کاغـەزە کەوتـە مخابراتـی ڕەسـمییەوە. لـە پاش بیسـت ڕۆژیتـر کاغەزێکیـان لەلایـەن دایـەرەوە دامێ نووسـرابوو: «مانع نییە ئەم سـەفەرەت بکەیت، بەڵام لەبەر ئەوە وەکیلەکـەت هێشـتا ئیسـباتی ئەهلیەتـی نەکـردووە ئەبـێ وەکیلێکیتـر دابنێیت». منیش وتم: «کەواتە ئەم سەفەرە ناکەم».

٢٥٠. مەلا «محمد شمیرانی» ڕۆژی جومعەیەك لە خانەقی ئەچێتە سەر منبەر خوتبەی جومعە ئەخوێنێتەوە؛ «شێخ عومەری دەکە»ش لەوێ ئەبێ. لەو کاتەدا کە مەلامحەمەد خەریکی خوتبە خوێندنەوەکەیە، شێخ عومەر ـکە لەبەر منبەرەکە دانیشتبووـ بە دزییەوە کۆشی خۆی ئەگرێ و پیشانی مەلا محەمەدی ئەدا. مەلامحەمەد هەر لەناو خوتبەکەدا ئەڵێ: «بە فەخری عالەم! خۆت کەری خۆت کەری!».

٢٥١. مەلا عیسای هەرتەل سێ قڕانی بەلای ژنێکەوە ئەبێ لە ئاواییەکەی خۆیان؛ هەر داوای لێ ئەکا و پێی ناداتەوە. ڕۆژێك مەلا لەسەر دەرزە، خەریکە دەرز بە فەقیەکانی ئەڵێ، سەیر ئەکا ژنەکە وا ماڵی بار کرد و ئەڕوا. ئەمیش هەر لە دەرزەکەدا بانگ ئەکا: «ژنەکە! ئافرەتی چاك بە سێ قڕانەکەم بدەرەوە. ئەوا تۆ ئەڕۆی ئیتر لەکوێ لێت بسێنمەوە؟» ژنە گوێی ناداتێ و هەر ئەڕوا. خێرا مەلا عیسا هەڵئەستێ هەڕا ئەکا بەشوێنیا. لە دواوە سێ کوتی پێوە ئەدا و ئەڵێ: «دە بڕۆ قەحبە! هەر کوتێ لە باتی قڕانێك!».

٢٥٢. کابرایەك هەبوو لە چوارتا «شێخ محەمەدی گۆمەلی» ناو بوو. دەرۆزەی ئەکرد و داوای لە هەموو کەسێك ئەکرد. هی وا هەبوو ڕۆژی پێشووتر پوولی پێدابوو، ئیمڕۆیش ئەچوو داوای لێ ئەکردەوە. ئەویش ئەیوت: ئەی دوێنێ نەمدایتێ؟ ئەمیش ئەیوت: «دەك خوا بە زیادی نەکا! هینەکەی دوێنێم لەسەر حساب ئەکەی؟».

٢٥٣. کابرایەکی هەورامی لە شوێنێك دانیشتبوو هەروا قسە هاتە سەر ئەوە کە ئێستە چیت و قوماش چۆنە و چۆن نییە. ئەویش

وتی: «ئێستە بابەتی خاس نەمەنەن. من باوکم ـ خواش بیامەرزۆ ـ کراسێکش جە متقاڵ کەردەن حەفساڵ جەبەرش کرد (بە دو پەنجە دەستی برد یەخەکەی گرت وتی:) ئانە گجییەکەشەن»[١].

**٢٥٤.** کابرایەکی «مایندۆڵی» تفەنگێکی ساچمەی ئەبێ، هەڵیئەگرێ بچێ بۆ ڕاو. ژنەکەی لێی ئەپرسێ: پیاوەکە ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟ ئەڵێ: ئەچم بەڵکوو کەوێك بکوژم. ئەڵێ: ئەرێ وەڵڵا بچۆ کە هێناتەوە سنگەکەی بۆ من. ئەڵێ وەڵڵا نایدەم بە تۆ. سنگەکەی ئەبێ بۆ خۆم بێ. ژنە ئەڵێ: سا وەڵڵا ئەبێ بۆ من بێ. لەسەر ئەمە ئەبێ بە شەڕیان، کابرا هیچ سێ و دووی لێ ناکا تفەنگێك ئەنێ بە ژنەکەیەوە و هەموو لەشی بریندار ئەکا.

**٢٥٥.** فەقێیەك ئەچێتە لای مەلایەکی مەردۆخی، دەرسی کتێبی «جامی» ئەخوێنێ. دوو ساڵی پێوە ئەبێ تا تەواوی ئەکا. مەردۆخییەکان خۆیان جامی ناخوێنن. کە لێ ئەبنەوە مەلا لێی ئەپرسێ: کاکە فەقێ چۆن بوویت لە جامییەکەدا؟ ئەویش ئەڵێ: «قوربان! ـ خوا ڕاوەستاوت کا! ـ ئەوەتەی من هەم، دەرزی وا پوخت و جوانم نەخوێندووە. «جامی» زانین هەروا ئەبێ کە جەنابت ئەیزانی». مەلاش وتی: دەسا کاکە فەقێ من لە وەختی خۆیا جامیم نەخوێندووە. فەقێ تاسێك ئەیباتەوە و ئەڵێ: «هەی ئەحمەقی جاهل! کە تۆ خۆت نەتخوێندووە بۆچ بە منت وت و ئەمە دوو ساڵە هەر شتی غەڵەتم پێ ئەڵێی؟!».

---

[١. ئەسڵی زمانە هەورامییەکەی بەم جۆرەیە: «ئیسە بابەتی خاس نەمەنەن، من تاتەم ـ خوا بەخشۆش ـ گجییێش جە متقاڵ کەردەن، حەف ساڵێ کەردەنش وەرش، ئانەیچ گجیەکەشا». (هەڵەگر)].

٢٥٦. کابرایەك لە شار ئەگەڕایەوە بۆ ماڵ، لە نزیکی ئاوایی کە سەیری کرد قەلفڕێکی سەیرە. تووشی شوانەکەی خۆیان بوو ـکە «بۆرە»یان پێ ئەوت ـ پرسی: ئەرێ بۆرە ئەو داڵانگەڕانە چییە؟ وتی: براکەم، ئەوە بەسەر کەلاکی گەماڵەبازەی ئێوەوە کۆ بوونەتەوە. وتی: بۆچ گەماڵەبازە تۆپی؟ وتی: ئارێ وەڵڵا. وتی بۆچی؟ وتی: ئەوەندە گۆشتیماینەکوڵی خواردبوو. وتی: بۆچ ماینەکوڵ تۆپی؟ وتی: ئارێ وەڵڵا. وتی: بۆچی؟ وتی: «وەڵڵا برا تەرمەکەی مراوەیسی کاکتیان لێ ناوو. وتی: بۆچی کاکم چی لێ هات؟ وتی: حەمەوەیس کوشتی. وتی: لەسەر چی؟ وتی: لەسەر قنگی خاتەی خوشکت. وتی: خاتەی خوشکم بۆچی؟ وتی: برا بێژم چی؟ بوختانیان پێوە کردوو. وتی: وە کێوە؟ وتی: «خەڵك و خوا یێژن وە منەوە!»».

٢٥٧. «ڕەشەی مچەی نوورە»ـی سێتە بەسەری هەمەوەن هەبوو خەریکی جەردەیی و پیاوخراپی بوو. ڕۆژێك قائیمقام سێ زەفتیە ئەنێری بۆ نوورە بیگرن. زەفتیەکان سوار ئەبن و ئەڕۆن لە قەراخ ئاواییەکە تووشی ڕەشە ئەبن. ڕەشە لێیان ئەپرسێ: ئەوە بۆ کوێ ئەچن؟ ئەڵێن: ئەچین ڕەشە ئەگرین. ئەڵێ: جا ڕەشە بە ئێوە ئەگیرێ؟ ئەڵێن: چۆن پێمان ناگیری؟ ئیمانی ئەسووتێنین. زەفتیەکان هەر کە گوێیان لێ ئەبێ ئەمە ڕەشەیە لە شوێنەکەی خۆیان وشك ئەبن. ڕەشە ماین و تفەنگەکانیان لێ ئەسێنێ و بەرەڵایان ئەکا و خۆی ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.

دایکێکی ئەبێ «زەمزەم»ی ناو ئەبێ. پێی ئەڵێ: ڕۆڵە! تۆ بەم جۆرە بێ‌پەروا و سەرشێت بیت و کۆ لە کەس نەکەیتەوە، ئاخری یەکێ ئەتکوژێ و جەرگی منیش ئەسووتێ؛ کوڕی چاك بە لەسەر کەری شەیتان وەرە خوارەوە.

ڕەشە کە ئەم قسەیە ئەبیەت، هەڵئەکێشێتە خەنجەر و ئەیدا لە شلکەی ڕانی خۆی و خەنجەر دیوەدەر ئەچێ بە زەوییەکەدا. بە دایکی ئەڵێ: «دە دایە وەرە کەری پێ ببەستەوە. من کەوا بم بزانم کێ ئەتوانێ بێت بمکوژێ».

٢٥٨. «ئەحمەدی عەزیزاغا» ڕۆژێك لەسەر سینی دائەنیشێ نان ئەخوا. پشیلەیەك دێ بە دیاریەوە دەست ئەکا بە میاوەمیاو. ئەم هەر بەشی ئەدا و ئەو هەر ئەڵێ میاو؛ لەمە زۆر وەڕس ئەبێ، هەر هەڵئەستێ سینییەکە ئەنێتە بەردەم پشیلەکە و خۆی ئەچێ لەولاوە ئەڵێ: «سەگباب! من میاو، کەرانباوگاو! من میاو، دە بزانم تۆ بەشی من ئەدەی؟».

٢٥٩. «ئەورەحیمی هەمەوەن» بۆی گێڕامەوە وتی: باوکم ڕەشیدی ناو بوو؛ پێیان ئەوت: ڕەشەی عەزەی ئەحمەدعەلی «سێتەبەسەر»؛ قسە، قسە ئەبڕێ، سێتەبەسەر تایەفەیەکی هەمەوەنن. پێنج برا هەبوون: ڕەشە، خەسرەو، حەسەن، حسێن، غەفوور. ئەمانە گەورەی تایفەکە بوون؛ ڕەشەش گەورەی ئەمان بوو. دەستەی ئەمانە لە ئاوایی «جافان» و «مولەقە» لە خۆراوای چەمچەماڵەوە دائەنیشتن، بەڵام خۆیان لە بەینی دوو ئاواییەکەدا قەڵایەکیان دروست کردبوو، لەوێ بوون؛ ڕێگری و جەردەییان ئەکرد.

ڕەشە ـ بەڕەحمەت بێ ـ لە نوێژ و ڕۆژوودا زۆر قایم بوو؛ لەگەڵ شێخ و مەلاشا زۆر باش بوو. کە مەلا یا شێخێك ببوایە، بە یەکێ لە براکانی ئەوت: «ئا کوڕە برۆ بەرخێ لە تاڵانییەکەی پار بێنە سەری ببڕە بۆ شێخ؛ ئەوە حەڵاڵە با نانی حەرام نەخوا». میوانەکەش ئەیوت: ماڵی تاڵانی لە کوێ حەڵاڵە؟ ئەیوت: «براساڵی بەسەرا سووڕاوەسەوە، ئێستە خاوەنەکەی

لە فیکری چووەتەوە؛ حەڵاڵ بیووە».

٢٦٠. کابرایەکی «سێوسێنان»ـی هەبوو دێوانەیان پێ ئەوت و ماڵیان لە «گومەتە» بوو. ڕۆژێك لەگەڵ شێخ حەمەساڵحی گومەتە ئەگەڕێنەوە هەندێ شتومەکیان پێ ئەبێ. لە ڕێگەدا تووشی ڕێگر ئەبن. شێخ حەمەساڵح لە بنەڗاڵەیەکدا خۆی ئەشارێتەوە. جەردەکان دێوانە ڕووت ئەکەنەوە و ئیتر بە شێخ‌حەمەساڵح نازانن. دێوانە دەست ئەکا بە پاڕانەوە لێیان ئەڵێ: «بیکەن بەخاتری ئەو شێخە لەو بنەڗاڵەیەدا وازم لێ بێنن». بەخوا جەردە بە شێخ ئەزانن و ئەچن ئەویش ڕووت ئەکەنەوە.

٢٦١. مەلایەك هەبوو پێیان ئەوت: «مەلا "موسی"ی‌کوڕی مەلا مەنسوور». ڕۆژێك دێت بە سەریا ئەڵێ: ئەم ناوەی من درێژە، با کورتی کەمەوە. دێنێ ئەڵێ: مەلا با فەقێ بێ؛ موو نەبێ خوری بێ؛ سی زۆرە با پانزە بێ. مەن نەبێ با ڕەتل بێ، سوور باش نییە، با بۆق بێ. لە ئاخرا ناوی ئەبێ بە «فەقێ خوری پانزە کوڕی فەقێ ڕەتل بۆق!»».

٢٦٢. کابرایەکی کرمانج لە هەولێر بۆ ئیشی تەلاقی ژنەکەی ئەیبەن بۆ لای قازی. ناوبژیکەر ماوەی کابرا نادەن قسە بکا، قازیش دیارە گوێی بۆ ڕاگرتوون. کابرا لەمە زۆر تووڕە ئەبێ کە نایەڵن ئەو قسە بکا. بە تووڕەییێکەوە ئەڵێت: «دە خزمینە واز بێنن با من و جەنابی قازیش گووێك بخۆین». قازی لەمە زۆر تووڕە ئەبێ و حوکمی کابرا ئەدا.

٢٦٣. وەستا گورroونی دارتاش هەبوو لە سولەیمانی، ڕۆژێك حەمەی پوورە خەجێ ئەچێتە لای ئەڵێ: وەستا ئیمشەو کوڕێکمان

بووه، بێشکەیەکمان بۆ دروستکە بۆی. ئەویش ئەڵێ: بەسەرچاو! دوو سبەی بنێرە بۆی. حەمە ئەڕوا و دوو سبەی ئەنێری بۆ بێشکە. وەستا گوروون ئەڵێ: ڕۆژی جومعە. ڕۆژی جومعە بۆی چوونەوە. وتی: سبەینێ. بە سبەینێ سبەینێ بێشکەی دوا خست و وردە وردە کوڕ گەورە بوو، باوکی ژنی بۆ هێنا. ئەویش کوڕێکی بوو. باوکی پێی وت: ڕۆڵە بڕۆ بۆلای وەستا گوروون بڵێ: باوکم ناردوومی بۆ بێشکەکە. ئەویش چوو پێی وت، وەستا گوروون دیسان وتی: سبەینێ.

کوڕە وتی: «وەستا ئەمە چ قسەیەکە وەختی خۆی باوکم کە پێی وتی، ئەوە بۆ من بوو. ئێستەوا منیش ژنم هێنا و کوڕێکم بوو. ئەم بێشکەیە هێشتا تەواو نەبوو؟» وەستا تووڕە بوو وتی: «کاکە بڕۆ خوات لەگەڵ! من ئیشی وا بە پەلەپەل ناکەم».

٢٦٤. کابرایەکی کورد شێت ئەبێ و ئەیبەنە شێتخانەکەی بەغدا. ڕۆژێک یەکێ لە کاربەدەستە هەرە گەورەکان ئەچێت بۆ سەیر کردنی شێتخانە و بۆ ئەوە بزانێ ناتەواوییان چییە. کە ئەچێ لەناو هەموو شێتەکانا سەیر ئەکا وا کابرایەك لە پاڵ دیوارێکا بە کزێکەوە دانیشتووە و دەستی خستۆتە ژێر چەناکەیەوە.

ئەپرسێ: ئەمە چییە؟ ئەڵێن: کابرایەکی کوردە و شێت بووە و هێناویانەتە ئێرە. ئەچێ بەلایەوە پێی ئەڵێ: تۆ چیت؟ شێتەش هیچ خۆی تێك نادا ئەڵێ: «من نێرگەلەم». ئەڵێ: چۆن نێرگەلەی؟ ئەڵێ: ئەگەر بڕوا ناکەی تووتنم لەسەر دانێ بزانە چۆن دەست ئەکەم بە قوڵتەقوڵت.

کابرای گەورە لەمە زۆر سەری سڕ ئەمێنێ و بە ڕاستی ئەیەوێ ئەم ئیشەی بۆ دەرکەوێ. ئەنێرێ تووتنی نێرگەلە دێنن و ئەیدا بە کابرا.

کابرای شێتە کڵاوێکی شڕی لە سەرایە دایئەگرێ سەرەکەی چاڵ ئەکا و تووتنەکەی تێ ئەکا و ئەیکاتەوە سەری؛ ئینجا دەست ئەبا کێری خۆی ئەگرێ و ئەیداتە دەستی کابرا و ئەڵێ: «ها نەفەسی لێدە بزانە چۆن قوڵتەقوڵت ئەکەم».

٢٦٥. کوڕێك هەبوو لە خانەقی ئیبراهیمی ناوبوو. کاغەزی بۆ پیاوی گەورە و بچووك ئەنووسی ئیمزاکەی ئەمەبوو: «ئیبراهیم خان مجید خان سالار سوڵتان، ڕئیسی عەشایری جبوور و باجەڵان، سوڵتان قەزای خانەقین و شارەبان».

٢٦٦. کوڕێکی جوولەکە لەو کوردەوارییە موسوڵمان بووبوو. هەرکە موسوڵمان بوو مرد. ئینجا خزم و کەسوکاری هاتبوونە سەری ئەیانلاوانەوە ئەیانوت: جوانی باڵا بەرز، مووسا لە دەست دەرچوو محەمەد نەناسراومان ڕۆ. بولبولی چاسینن پاشقول‌دراوی موسوڵمانمان ڕۆ.

٢٦٧. گیانلەبەری‌تریش قسە ئەکەن؛ بۆیە ئەڵێ: جارێك ڕێوییەك سەرلەبەیان بوو، لە بناری ئاواییەکەی باغلۆجە گوێی لە دەنگی کەڵەشێرێك بوو لەسەر دارەکە ئەیخوێند. چوو بەلایەوە وتی: «فەرموو خوارەوە با نوێژەکەمان بکەین بە جەماعەت».

کەڵەشێرەکەش وتی: «ئیمام لە پاڵ دارەکەدا نوستووە خەبەری کەوە با نوێژەکەمان بۆ بکا». کە ڕێوی سەیری کرد، تانجییەکی بەرچاو کەوت. ترێکی کەند و بۆی دەرچوو. کەڵەشێرەکە وتی: ئەوە بۆ کوێ؟ وتی: «فڵانی دەستنوێژەکەم شکا؛ تۆ لەوێ ڕاوەستە تا ئەچم تازەی ئەکەمەوە و دێمەوە».

٢٦٨. «رشید جَودت» سەرکردەی لەشکر ئەبێ لە «دیوانیه». ڕۆژێك ئۆتۆمۆبێلێکی تاکسی دێت، ئەویش ئەڵێ: «جاء السّیّارة». پێی ئەڵێن: «ڕەشیدبەگ نابێ وا بڵێیت، ئەبێ بڵێی: "جائتِ السّیّارة"».

ڕۆژی دوایی لۆرییەك دێت ئەویش ئەڵێ: «جائت اللّوری». دیسان زابتەکان پێی ئەڵێن: ڕەشیدبەگ نابێ وا بڵێیت، ئەبێ بڵێی: «جاء اللّوری».

ئەویش تووڕە ئەبێ ئەڵێ: «هەی ناجسنینە! ئەمە چ زمانێکە؟ مەکینە یەك مەکینە، بەنزین یەك بەنزینە، تایە یەك تایە، ئۆتۆمۆبێلچی یەك ئۆتۆمۆبێلچی؛ ئیتر ئەم «جاء» و «جائت»ـە لە کوێوە هات؟».

٢٦٩. «ئەحمەدئاغای کەرکووکیزادە» لە بەغدا هەموو دەردەدڵێکی هەر لە «ال»ـی عەرەبی بوو، ئەیوت: «ئەم سەگی سەگبابە سەری لە من تێك داوە. لە قسەکردنا ئەیخەمە سەر کەلیمە ئەڵێن: نایەوێ، نایخەمە سەری ئەڵێن: ئەیەوێ. نازانم چ بکەم بە دەستیەوە؟».

٢٧٠. کابرایەکی مەنگوری هەرجارە لە پاش نوێژکردن ئەپاڕایەوە لە خوا و لە یەکێ لە نزاکانیا ئەیوت: «خولایە لە خۆم و لە ئاتەی دایکم و حایشەی خوشکم و پیزەی ژنم خۆش بی». کابرایەك ڕۆژێك پێی وت: ئەی باسی باوکت بۆ ناکەی؟ وتی: «کاکەلێ! بابم من منداڵ بووم مردووە، بیرم نایە. یەکێ کە نەیناسم چما لۆی دەپاڕێمەوە».

٢٧١. عەبدولحەکیم بۆی گێڕامەوە وتی: کابرایەك هەبوو لە «نیسکاوێ»ـی بناری سەردەشت «مام ڕەسوو»ی ناو بوو. پیاوێکی هەژار و پەرێشان بوو. ڕۆژێك بیستی کە لەشکرێکی زۆر هاتۆتە سەردەشتەوە و دار پارەی چاك ئەکا. وتی: بەخوا وا چاکە ئیمشەو

بچم کۆڵەدارێك بکەم، بەیانی زوو بیبەم بۆ سەردەشت لە پێش ئەوەدا دارفرۆش بچن بەڵکوو شتێکم دەست کەوێ. «کۆتکە» نۆکێك خێری تۆ بێ.

شەوێ پاش بانگی خەوتنان تەوراسەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت. زۆر دوور نەکەوتەوە، دارێکی بەگیر هێنا و چووە سەری و بە تەوراس تێی بەربوو.

هێشتا شتێکی وای لە دار نەکردبوو کوتوپڕ تەوراسەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە. لە دارەکە هاتە خوارەوە، دنیاش تاریکە. بە دەست بەشوین تەوراسەکەدا ئەگەڕا لە ناکاو کووپەلەیەکی بەردەست کەوت کە هی کاروان و شتە بوو، لێیان بەجێ مابوو. ڕووی کردە ئاسمان و بە تووڕەییەکەوە وتی: چما من چ بڕ دارم کردیە؟ تۆ نۆکە کۆتکەت لەبەر دەستم دانایە و داوای نۆکی خۆت دەکەی؟.

**٢٧٢.** ئاغەیەك خزمەتکارێکی تەمەڵی بێفەڕی هەبوو. ڕۆژێك ناردی بۆ بازاڕ ڕۆن و برنج بکڕێ. زۆری پێچوو هەر نەهاتەوە، دوایی کە هاتیشەوە هەر برنجەکەی کڕیبوو، ڕۆنی نەهێنابوو. کابرا زۆر تووڕە بوو، گەلێ جنێوی دایە و پێی وت: سەگی سەگباب! مادام تۆ ئەمە کەتنتە جارێکیکە ناردتم بۆ هەر شتێك ئەبێ دوو شت بێنی.

ڕۆژێك کابرای ئاغە نەخۆش ئەکەوێ و بە خزمەتکارەکەی ئەڵێ: «ئا بچۆ پزیشکێکم بۆ بێنە». ئەویش ئەچێ و لە پاش تۆزێك دێتەوە پزیشکێك و پیاوێکیتری لەگەڵ خۆی دێنێ. ئاغە لێی ئەپرسێ: ئەم کابرایەیتر چییە؟

ئەویش ئەڵێ: «ئەی ئەو ڕۆژە تۆ دەستت نەکرد بە جنێودانم و پێت

نەوتم کە ناردتم بۆ هەر شتێك ئەبێ دوو شت بێنی؟ ئێستە پێت وتم بچم پزیشك بێنم و ئەوا ئەوەیان پزیشکە؛ ئەگەر چاکی کردیەوە، باشە، ئەگەر خۆ چاکیشی نەکردیەوە ئەوی‌تریان گۆڕهەڵکەنە و گۆڕەکەت بۆ هەڵئەکەنێ».

۲۷۳. لە قەراخ ئاواییەکەی «بییانی» کەرێك کەوتبوو خەریك بوو ئەتۆپی. کسۆکێك چوو بە لایەوە قنچکەی کرد. کەرەکە پێی وت: ئەوە بۆچ قنچکەت کردووە لە لامەوە وتی: «ئەمەوێ بتۆپی، بتخۆم». وتی: «من تا ڕۆژی شەنبە ناتۆپم». سەگەکە وتی: «منیش تا ڕۆژی یەك‌شەنبە هیچ ئیشێکم نییە».

۲۷٤. ڕێوییەك کۆترێکی گرت. کۆترە وتی: «بزانم چارێکی خۆم ناکەم؟» هات لە ڕێوییەکەی پرسی وتی: مام ڕێوی بێ‌قەوی نەبی، تۆ خەڵکی کوێی؟ وتی: «بانەییم». لەگەڵ وتنی بانە و کۆتر لە دەمی بەرەڵا بوو فڕی. ئینجا ڕێوییەکە دانی ڕیچ ئەکردەوە و ئەیوت: «ئاخ! ئەگەر ئەمجارە دەستم کەوتەوە ئەڵێم شاربازێڕیم، شاربازێڕیم».

۲۷۵. مەلایەك هەبوو لە «چوارتا» مەلا بابەکری ناو بوو. سەر بانەکەیان بەرەو ڕۆژ بوو، خەڵکی ئاوایی لەوێ کۆ ئەبوونەوە. دوو کابرا هەبوون یەکێکیان «مخە»ی ناو بوو، ئەویتریان «ئەحە». ڕۆژێك ئەمانە هەر لەو سەربانە بوو بە شەڕیان.

مخە ڕووی کردە ئەحە و وتی: بڵێم چی؟ ئەگەر ئێستە لەبەر ئەم سەر بانی ماڵی مەلا بابەکرە نەبوایە پێم ئەوتی کۆنەقەتارچی؛ دەسا بڕۆ خوا بەقوربانی ئەم سەربانەت کا».

٢٧٦. کابرایەك هەبوو «شەپە»ی ناو بوو، دڵی چووبوو لە ئافرەتێك؛ بە تەواوی بۆی سووتابوو. وای لێ هاتبوو هەموو کەس پێی زانیبوو. لە ڕوویشی هەڵنەئەهات قسەی لەگەڵ بکا.

ڕۆژێك سەیریان کرد شەپە زۆر بەدەماخە. پێیان وت: شەپە چییە؟ وا دیارە ئیمڕۆ شتێك هەیە! وتی: خزمینە! خوا دەرووی لێ کردمەوە، ئیمڕۆ قسەم لەگەڵ دۆستەکەما کرد و ئەویش جوابی دامەوە. وتیان: چۆن؟ وتی: کە چووم سەیر ئەکەم لەسەر کانی گەنم ئەشواتەوە بۆ ساوەر، منیش پیم وت: «ها وەڵڵا ئەڵێی هەموو گەنمەکە بخۆم». ئەویش پی وتم: «ها مانگایە مانگا».

٢٧٧. دەروێشێك مۆری گرتبوو، وردە وردە ئەڕۆیشت بۆ دەروێشی. کابرایەکی تووش بوو پێی وت: مام دەروێش ڕۆیشتنت چۆنە؟ وتی: «وەڵڵا عەبایەك ئەخۆم و عەسایەك ئەڕۆم». وتی: بە پانی یا بە درێژی؟ وتی: «ها ها، ماڵت کاول نەبێ، بۆچ چەپەرم بە درێژی بڕۆم؟»

٢٧٨. ئەڵێ: کابرایەك گیسکێك و مەیموونێکی هەبوو، لەگەڵیان ڕائەبوارد. ڕۆژێك کابرا چووە دەرەوە. جامە ماستێك لە ماڵا دانرابوو، مەیموونەکە چوو ماستەکەی هێنا هەمووی خوارد و دەم و لێوی خۆی پاك کردەوە و چوو گیسکەکەی هێنا تۆزێ ماستی لە دەم و لووتی ئەو هەڵسوو، جامەکەشی بە خاڵیتی لەو ناوەدا فڕێ دا، خۆیشی چوو لەولاوە قیت و قنج لێی دانیشت.

لای نیوەڕۆ کە کابرا هاتەوە سەیری کرد جامە ماست هیچی نەماوە. سەیرێکی مەیموون و گیسکەکەی کرد، تەماشای کرد مەیموون لە

گۆشەیەکەوە بۆ خۆی کزۆڵەی کردووە و دانیشتووە. گیسکەش لەولاوە بە دەمولووتی ماستاوییەوە هەڵقون‌هەڵقونیەتی. دارێکی هەڵگرت و چووە ویزەی گیسکی بەسەزمان. مەیموونەکەش لە ترسی ئەوە نەوەك کابرا دواجار با بداتەوە سەر ئەو، هەموو جار دەستێکی بۆ دەم و لووتی گیسکەکە درێژ ئەکرد و کابرای تێ‌ئەگەیان کە ماستەکە گیسکەکە خواردوویەتی. ئەوەتە هەمووی بە دەمولووتیەوەیە. بۆ خۆی خۆیشی وەکوو بەرزەکی سەربانان بۆی دەرچوو.

**٢٧٩.** کابرایەك لەو کوردەوارییە کوڕێکی هەبوو. دنیا زستان بوو، کوڕە هەر ئەچووە بەر بەفر و سەرماکە. باوکەکەی هەرچەند هاواری لێ‌ئەکرد: کوڕە ڕۆڵە وەرە ژوورەوە نەخۆش ئەکەوی، کوڕە گوێی نەئەدایە.

ڕۆژێك بەفرێکی زۆر باریبوو، چووە سەر بانەکە بۆ بان ماڵین. باوکەکەی گەلێ هاواری لێ‌کرد و لێی پاڕایەوە کە بێتە خوارەوە و ئەم بانە نەماڵێ. پێی وت: ڕۆڵە جەرگم مەسووتێنە، وەرە خوارەوە. کوڕە هیچ وەکوو گوێزی بۆ بژمێرن وابوو. ئینجا باوکەکە هات کوڕەکەی کوڕێکی کۆرپەی هەبوو، هەر باوەشی کرد بە کوڕە پچکۆڵەدا و بردی لەسەر بەفرەکە دای‌نا. کوڕەکەی خۆی لەسەر بانەکەوە چاوی لێ بوو، لەوێ ئاگری تێ‌بەربوو، بانگی کرد: «ئای بابە! ئەوە ئەو کوڕە لەسەر ئەو بەفرە بۆچ دائەنی؟ ئاخر نازانی نەخۆش ئەکەوێ؟ دە لایبە لایبە بۆ خاتری خوا! کزە لە جەرگمەوە پەیدا بوو». باوکەکەشی وتی: ڕۆڵە، تۆ بۆ ئەمە چۆنیت منیش بۆ تۆ وامە! ئەی بۆچ هەر هاوارت لێ ئەکەم گوێم نادەیتێ؟».

**٢٨٠.** لە قسەی کوردییە ئەڵێ: جارێك یاپراخ و کفتە و بروێش و تورشاو بوو بە شەڕیان. کفتە بە بروێشی وت: بەخێر تۆش

ناوی خۆتت ناوە شت؟ نە تامێك و نە شتێك؛ کەچی تەشریفیشت دێتە دیواخان.

یاپراخ ڕووی کردە تورشاو وتی: ڕەنگبێ تۆش فیزێ لە خۆت بنێی و بڵێیت شتێکم؟ نە نانەڕەق خۆی لە بەرتا ئەگرێ نە خەپلەی هەرزن ئەوێرێ توخنت کەوێ نە کەلەدۆینە پێت ئەوێرێ. بەڵایەکیت کەوتوویتە ئەم ناوە و سەرت لە عالەم تێك داوە.

تورشاویش بەوی وت: خۆ من هیچ نەبێ وام بە ڕووەوە، تۆ ئەڵێی دەستە بوخچەی تازەبووکی ناشیرینی چرووکی، توندوتۆڵ خۆتت پێچاوەتەوە و کەس نازانێ ناو سکت چی تیایە و دەستی خەڵك ئەبڕی. ئەگەر فڕوفێڵت تیا نییە و ڕاست ئەکەی بۆچ وا خۆتت پێچاوەتەوە؟

«کارواناشی»ش لە گۆشەیەکەوە بوو، گوێی لێ بوو. لە ژێر لێوەوە وتی: ئەوە ئەڵێن چی؟ هەموو بە جارێ لێی هاتنە دەنگ وتیان: «توخوا دەم و فلقت بەرە بەولاوە، بێتامەی ئاوی خاسە پیسی کەرە». لەم هەرایە پڵاو نوستبوو خەبەری بووەوە؛ کۆکەیەکی بۆ کرد و بە فیزێکەوە وتی: «ئەرێ هەتیوینە ئەو هەراهەرایەتان لە چییە؟» ئەمانیش وتیان: «قوربان ئاغە، کێ لەگەڵ تۆیەتی؟!».

**٢٨١.** سەید عەبدولحەکیم بۆی گێڕامەوە وتی: کابرایەك هەبوو زۆر تووڕە و کەللەشەق بوو، تەڵاقی ژنەکەی زۆر ئەدا. دوو جار تەڵاقی دابوو، هاتنە لای من بۆم چاك کردنەوە، هەموو جاریش پێم ئەوت: برام، تەڵاق مەخۆ خراپە. پیاوێ پیاو بێ تەڵاق ناخوا. ئەویش ئەیوت: قوربان جارێکی کە ئیتر گووی وا ناخۆم.

وتی: زۆری پێ نەچوو ئەوەندەم زانی دیسان هاتەوە و وتی: قوربان

تەڵاقم خواردووە بۆم چاك كەوە. وتم: برا تازە چاك نابێتەوە ئەوا بوو بە سێ جار و لە دەس دەرچووە، گەلێكی حەوڵ دا هەر وتم: بە من چاك ناكرێتەوە و بچنە لای مەلایەكی‌كە. كەچی وتی: «ئاخر قوربان چۆن بچین؟ ئێمە مشتەری تۆین چۆن ئەبێ بچینە لای یەكێكی‌كە؟ تا ئێستە ئەموت: خۆم گووم خواردووە، ئێستە ئەڵێم: باوكیشم گووی خواردووە. دە قوربان ئەمجارەش بۆمان چاك كەوە». وتم: نابێ و دەرم كردن.

٢٨٢. شێخ بابەعەلی لەبەر سەیوانی مزگەوتەكەی خۆی دەرزی ئەوتەوە بە فەقیەكان، سەیری كرد هەراهەرا و هەچەهەچەیەك پەیدا بوو. كە سەری بەرز كردەوە تەماشای كرد سێ زەلام كابرایەكیان بە سواری كەرێكەوە داوەتە پێش و بە زۆر ئەیكەن بە دەرگای مزگەوتەكەدا. بانگی كرد: ئەرێ كابراینە ئەم كەربازارە چییە؟ یەكێكیان وتی: قوربان قەوماوە، بە هەرجۆر بوو كەریان كرد بە حەوشەی مزگەوتا و وتیان: قوربان ئەمە بە سواری ئەم كەرە چووەتەوە بۆماڵەوە. لەگەڵ ژنەكەیا دەمەقاڵێیان بووە و تەڵاقی خواردووە كە لەسەر كەرەكە نەیەتە خوارەوە». ئێمەش وا هاتووین بۆ خزمەتت.

بابەعەلی سەرێكی ڕاوەشان و فەرمووی بیبەنە لای ئەو دار تووەوە. كابرایان كێش كرد بۆلای دار تووەكە. ئەمجا پێی وت: هەر لە پشت كەرەكەوە هەڵزنێ بە دارەكەدا. كە ئەو هەڵگەڕا، بە كابراكانی‌تری وت: كەرەكەی لێ دوور خەنەوە. بە كابراكەی‌تریشی وت: ئەمجا بە دارەكەدا وەرە خوارەوە و بچۆ بكوتەرە پاڵ ژنی خۆت تەڵاقەت نەكەوتووە.

٢٨٣. كابرایەك ئەچێتە عابخانەكەی مزگەوتی بابەعەلی، سەیر ئەكا دەرگای عابخانەكان لەو دیوەوە هەموویان داخراون.

ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە هەموویان خەڵکێکی تیایە. ئەچێتە بەر دەرگای عابخانەیەکی تر ـ کە دانەخراوە ـ ئەکۆکێ بۆ ئەوە بزانێ کێ لە ژوورەوەیە. کابرایەك لە ژوورەوە ئەبێ، ئەویش لە باتی ئەوە بە قرچە وەیا بە کۆکە جوابی بداتەوە، بە ڕێکەوت تڕێکی زۆر قایمی لێ بەر ئەبێ.

کابرای دەرەوە ئەڵێ: «جا برا بەم توورەییە بۆچ جوابم ئەدەیتەوە؟ بۆچ من چیم وتووە؟».

**٢٨٤.** ژنێك هەبوو لە هەڵەبجە «باجی زینەت»ـی ناو بوو. لەبەر ئەوە تۆزێ جوانکەلە بوو، خەڵكوخوا زۆر بەتەمای بوون. گەلێ شوویشی کردبوو، بەڵام کوڕوکاڵ هەر لە لاکۆڵان و ماکۆڵانا گلوخولیان بوو بە دەوریا.

باجی زینەت لەم دوا دواییەدا مێردی کردبوو بە پیاوێك ناوی «سۆفی عەزیم» بوو، تۆزێ گێلۆکەش بوو. ئەم مێردەی سەر تەعازە بوو. ڕۆژێك سۆفی عەزیم لە کۆڕێکا ئەبێ هەتیوێك هەبوو «سووسە»ی ناو بوو ئەویش لە کۆڕەکەدا ئەبێ ڕوو ئەکاتە سۆفی عەزیم و ئەڵێ: «خاڵە عەزیم «زێ»ـی زینەت گەورەیە یا بچووکە؟»

ئەویش ئەڵێ: «بەخوا برا نازانم؛ بەڵام وە پێ ئەوە کوڕوکال فرە وە دەور قنگیا تێن و ئەچن ئەشێ فرە بچووك وێ».

**٢٨٥.** کابرایەکی خەڵکی «توراغ تەپە» ناوی «ئەلیهەسەن» بوو، بۆ کاسبی ئەچێ بۆ وڵاتی ئەستەموڵ. ڕۆژێك لەناو کۆڵانا کابرایەکی ئەستەموڵی تووش ئەبێ لێی ئەپرسێ: «نێرەلیسەن». کابرای توراغ تەپەییش پێی ئەڵێ: «وە قوروانت وم ئەوە وەڕیشەکەما ئەزانی نێرم، ئەی وە چییا ئەزانی ناوم ئەلییەسەنە؟».

**٢٨٦.** کابرایەکی گاور لە کەرکووك لەگەڵ هەتیوێکا ڕێ ئەکەوێ. ژێر پردەکە گیرا بوو، ئەچن لە بن دیوارێکا لە قەڵا پێك دێن. کاتێ کە بە سەریەوە ئەبێ، دیوارەکە ئەڕووخێ بە سەریانا و هەردووکیان ئەبن بە ژێریەوە.

خەبەر ئەبەن بۆ قەشە. قەشە بە خۆی و کرێکارەوە دێنە سەریان و کرێکار دیوارەکە لا ئەبەن، تەماشا ئەکەن کابرای مردوویش هەر بەسەر هەتیوەکەوەیە و خەنجەر لە کێلاتایە. قەشە کە چاوی پێیان ئەکەوێ ئەڵێ: «خوا لێ‌خۆشبوو بەهەشتییە؛ هێشتا نەگەیشتۆتە بەهەشت خوا غیلمانێکی بۆ ناردووە!».

**٢٨٧.** جوولەکەیەك هەبوو لە بانە «شەلەمۆ»ی ناو بوو. تۆزێ جوانکەلە بوو، چەرچیتی ئەکرد و دوو گوێدرێژی هەبوو. هەموو جار باری ئەکردن لە شتومەك و ئەچووە دەرەوە بۆ فرۆشتنیان. جارێکیان وا ڕێ کەوت کە ئەبوا بە کەلی‌خانا بڕۆیشتایە. ڕێگەش نائەمین بوو. کابرایەکی بە کرێ گرت لەگەڵ خۆی بردی بۆ ئەوەی بیپارێزێ لە پیاوخراپ و ڕێگر. کە ئەگەنە ناوەندی کەلی‌خان، کابرا خۆی جوولەکەکە ڕووت ئەکاتەوە هەر شتێکی پێیە لێی ئەستێنێ. سوێندیشی پێ ئەخوا بە حەزرەتی مووسا کە دەنگ نەکات. سەرەڕای ئەوە دێنێ ئەشیگێ بۆ ئەوە ئیتر بە هیچ جۆر هەر نەوێرێ قسە بکا.

دنیا تەمومژ و هەورەڕۆژ بوو. کابرای جووە ئەگەڕێتەوە بۆ بانە و هەر هەناسە هەڵئەکێشێ، ناشتوانێ قسە بکا. جا ئەیانوت هەر ڕۆژێ تەمومژ و هەورەڕۆژ بوایە، ڕووی ئەکردە کەلی‌خان و ئەیوت: «بەخوا خەڵکینە! ئێستە لەو کەلە پیاوگاینە!».

٢٨٨. کابرایەکی بێ چاو لەگەڵ چاوساغێکا بوو بە شەڕیان و چاوساغەکە کوێرەکەی گرت و نایە ژێر. هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ کە لە ژێرەوە دەست بەرێ گەڵوگونی کابرای چاوساغ بگرێ و بەوە پەکی بخا.

دەست لە دەست و قەوەت لە خوا، دەستی برد و گەڵوگونی کابرای بەدەستەوە هات و وەکوو ئەسپێی کەوتبێتە مست، بەو جۆرە گووشی، بەڵام گووشی! کابرای چاوساغ بە تەواوی بێهێز بوو. لەو کاتەدا هاوڕێیەکی کوێرە هات و بانگی کرد: «ئای مامۆستا ئەوە لە ژێرەوەیت؟» ئەویش وتی: «بەخوا هەرچەندە لە ژێرەوەم، بەڵام وەکوو لە سەرەوە بم وایە».

٢٨٩. کۆڕێك بووین لەلای «وەستا بەشیر» دانیشتبووین. «هادی سائب» هەبوو، ئەویش هات ویستی بێتە ژوورەوە، وەستا لووتی پیا نەهێنا. ئەو هەر گوێی نەدایە. ئەمجا پێی وت: مەیەرە ژوورەوە. هەر گوێی نەدایە و هات. پاشان وەستا هەستا دەستی نا بە سنگیەوە و لێیان بوو بە شەڕ لەسەر نەهاتنە ژوورەوە. هادی هەر هاتە ژوورەوە وتی: «بێقەزابی، ئەمە چییە بە جارێ ناخۆشت کردووە کەی گاڵتە وا ئەبێ».

لە کۆڕەکەدا مامۆستا «رفیق حِلمی»ش هەبوو، هادی تکای بۆ یەکێك ئەکرد لەلای ئەو، مامۆستاش پێی وت: «دەك موبارەك نەبێ! تۆ خۆت ئێسکت زۆر سووکە، ئەمجا نۆبەی یەکێکیترە». هادی هەر نەیخستە خۆی وتی: «بێقەزا بن! ئەمە چییە هەمووتان فێری گاڵتە بوون!».

٢٩٠. ئەحەی کرنوو لە سولەیمانی ئیشی تایبەتی ئەوەبوو کە شەربەتی ئەفرۆشت. وەکوو قسە کردنی عەنتیکە بوو، سەروگوێلاکیشی هەر عەنتیکە و بەزم بوو. نێرەکەرێکی هەبوو، هەموو جار پێوە ئەچووە

دەرەوە. حەکیمی بەسەرەوە ئەکرد و ئەگەیشتەوە شارباژێڕ باری ئەکرد لە مێوژەڕەشکە و ئەیهێنایەوە ئەیکرد بە شەربەت و ئەیفرۆشت. کە تەواو ئەبوو بۆی دەرئەچووەوە.

جێگەیان نەبوو لە ماڵا، نێرەکەرەکەی لەبەر دووکانەکە ئەبەستەوە و کا و جۆی ئەکردە بەری و خۆیشی لەناو دووکانەکە «هەی شەربەت»ـی ئەکرد. گۆبەند لەوەدا بوو لەگەڵ ئەم بانگی ئەکرد: «شەربەتی سارد و شیرین» نێرەکەرەکەش لەولاوە دەستی ئەکرد بە زەڕین.

خاڵە حەمەد بەمە زۆر تێك ئەچوو؛ ڕۆژێك هەر پەلاماری نێرەکەرەی دا و جامانەکەی لەسەر خۆی کردەوە و بەستی بەسەر نێرەکەرەکەوە، ڕەشمەکەشی لەملی ئەو کردەوە و کردیە ملی خۆی و نێرەکەرەی بردە ناو دووکانەکە و پێی وت: «دە سەگی سەگباب ئەگەر تۆ شەربەت فرۆشی فەرموو بزانم چۆنی ئەفرۆشی؟» ئەمەی پێ وت و خۆیشی چووە سەر کا و جۆکە. ئەمجا نێرەکەر هیچ نقەی نەئەکرد، ئەمیش بانگی ئەکرد: «دە سەگی سەگباب! شەربەت بفرۆشە تا منیش دەستبکەم بە زەڕین؛ خۆ شەقم برد».

**٢٩١.** کابرایەك لەو بناری شارەزوورە کە خێڵ ئەچێ بۆ کوێستان لەگەڵ خێڵ ئەڕوا و ئەگاتە پێنجوێن. لەوێ ئەچێتە لای کابرایەکی بازرگان ئەڵێ: «ئا برا لەو باوەشە چەمەرییە سێ گەزم بۆ لێ کەوە بۆ کەوا». کابرا سێ گەزی بۆ لێ ئەکاتەوە و پارەکەی لێ وەرئەگرێ و ئەمیش قوماشەکە ئەبا بۆلای وەستایەکی کەوادروو بۆی بدوورێ. پێ ئەڵێ: «ئا برا هەر ئێستە بۆم بدوورێنە وا خێڵ وەڕێوەیە، ئەچمە ناو بازاڕ و تێمەوە هەق وەستاییەکەت ئەدەم و با بگەم وە خێڵ. کوڕە نێژی خێڵی لەدەست دەرئەکەم، وەو شێخ کەریمە وە گالۆك پشتت ئەشکێنم».

ئەمەی وت و لێی دا ڕۆیشت. دوو هەنگاو ڕۆیشت و نەڕۆیشت گەڕایەوە دواوە بە پەلە پێی وت: «توخوا برا بیژەنە وە ئاوەکەشا. ئێوە وە گۆوەنن با دوا جار نەیێژی نەژەنیاگە وە ئاوا کورت بووەسەوە». کابرای وەستاش وتی: بە سەرچاو و ئەو لێی دا ڕۆیشت.

سوورێکی خوارد بە بازاڕا و گەڕایەوە و وتی: برا بێرا کەواکە. وەستاش وتی: برا خستوومەتە ناو ئاو هێشتا وشك نەبووەتەوە. کابرا وتی: «وەو قورعانە شێخ لێ خوێندگە ئەوا ئەچم سوورێکیتر ئەخۆم و تێمەوە، کەوام وە دووریاگی نەدەی وە دەسەوە هەزار خراوت پێ ئەکەم».

ئەمەی وت و لێی دا ڕۆیشت. زۆر دوور نەکەوتبووەوە یەکێ لەوبەری شیوەکەوە بانگی کرد: «کورە عەلە عەلە، وا عێل گەیشتنە قنگە لووتکەکەی شلێر، بۆ وێسیاگی؟ بێ وەڕێوە». عەلە کە گوێی لەمە بوو گالۆکی هەڵوەشان و بە ڕاکردن چوو بەشوێن عێلا. پاییز کە خێڵ سەرەوخوار بووەوە هاتەوە بۆلای کابرای بەرگدروو وتی: برا کەواکەم پێ بدەرەوە. وەستاش وتی: برا من هەر ئەو وەختە خستمە ناو ئاو و چاوەڕێم بیتەوە و لەبەر چاوی خۆتەوە خێرا بۆت بدوورم، تۆ هەر نەهاتیتەوە تا دوێنێ کە چوومە سەری تەماشا ئەکەم هەمووی چووەتە ئاو و هیچی نەماوە».

ئەویش وتی: چۆن برا؟ هەر گشتی چووە ئاوا؟ وەستا وتی: ئەگەر بڕوا ناکەی وەرە با بچینە لای کابرا کە لێت کڕیووە. وتی: باشە. پەلی گرت و چوونە لای کابرای بازرگان. وەستا پێی وت: ئەرێ میرزا ئا ئەو تۆپە قوماشە چەندی لێ ئەچێتە ئاو؟ وتی: ئەو قوماشە زۆر نایابە، سێ گەزی لێ ئەچێتە ئاو. ئەمجا وەستا ڕووی کردە کابرا وتی: «ئا برا نەموت ئەوە ئەو سێ گەزەکەی داوە بە تۆ کە چووەتە ئاوەکەوە، تۆ بڕوا بە قسەی پیاو ناکەی».

کابرا ڕووی کردە میرزای بازرگان و وتی: «هەی بکەم وە قنگ دایکتەوە بۆچی سێ گەزە لە ئاوچووگەکەت دا وە من» و خۆی تووڕە کرد و بەدەم سەرقاڵییەوە ڕۆیشت، لە ترسی ئەوە نەوەك وەستای بەرگدروو هەقی کەواکەی لێ بستێنێ.

جا هاتبووەوە بۆ ماڵەوە ئەیوت: «بکەم وەقنگ دایك کاورای بەرگدرووەوە هەقی کەواکەم پێ نەدا».

**٢٩٢.** کوڕێـك بوویـن لـە دووکانسـەراکەی وەستا بەشیر، قسە ئەقۆزرایـەوە، ئەمجـا ئـەو باسـی ئـەوەی بـۆ کردیـن وتـی: لـە زەمانی عوسمانییا خۆم زابت بووم؛ (١١٤) کەسم لە بەردەستا بوو. وتی: ئێمە درابووین بە «حوکمەتی عوسمانی». زوڵمێکی زۆر زلمان لێ کرابوو. سەربازەکانم هاتن وتیان: چار چییە؟ وتم: ئێستە من چارتان ئەکەم؛ هێنام بە دەستی خۆم «إستِعایە»کم بۆ یەکێکیان نووسی بۆ قائیدی هەرە گەورە. کە ئیستعاکەی برد بەخوا سەگ بەحەسارێکیان پێکرد. بۆ یەکێکی تریشیانم نووسی ئەویش هەر وا. بە کورتی بە دەستی خۆم بۆ هەر ١١٤ کەسەکەم نووسی، هەموویان گەماڵکوژ کران.

وتی: سەرە هاتە سەر خۆم. وتم: وەڵڵا ئەبێ بۆ خۆیشم بنووسم. هێنام هەر بە دەستی خۆم بۆ خۆیشم نووسی و بردم بۆ «ئۆزدەمیر». ئەویش هێنای «جەم بۆریەسی» کرد و هەموو سەرباز کۆبوونەوە و بە دەورە وەستان. من و ئۆزدەمیریش لە ناوەڕاستا بووین هەر لە «ئۆغلم، ئۆغلم» قسەی لەگەڵ ئەکردم...

مامۆستا بەشیر لەو ڕۆژانەدا خانوویەکی بەدەستەوە بوو، خەریکی دروستکردنی بوو. لەم کاتەدا کابرایەك هات، کاتیش دەمەدەمی ئێوارە بوو، وتی: وەرە ناوی کرێکارەکان بنووسە بۆ پارە پێدانەکەیان. وەستا لێی

تووڕە بوو وتی: بڕۆ جارێ ئیشمان هەیە و قسە ئەکەم، ئەمجا گەڕایەوە سەر قسەکە و وتی:

یەکێ لە والییەکانی ئەردەڵان تاقە کوڕێکی ئەبێ ئەمرێ. والی بە هیچ جۆر سوکنایی نایە. یەکێ لە پیاوماقووڵەکانی ڕۆژێك لە بازاڕا کابرایەکی «کەرك» لە شان ئەبینێ کە جامەدانەیەکی لاروپێچی ناوە بە لایەکی سەریەوە. کەرکەکەی خستۆتە سەر شانێکی، گالۆکێکی بە دەسەوەیە، چەماوەکەی خستۆتە سەر شانەکەی‌تری؛ نانێکی لوول داوە لە قولی دەستیایە، چەمیلەیەك وا بە دەستەکەی‌تریەوە، دانی چیڕ ئەکاتەوە قەپاڵێك لە نانەکە ئەگرێ و قەپێکیش لە چەمیلەکە، بەم جۆرە بەناو ئەو بازاڕەدا ئەڕوا و شا بە گونی خۆی نازانێ.

کابرای پیاوماقووڵ ئەڵێ: ئەم پیاوە بەم جۆرە ئەبەم بۆ والی، ئەگەر بەمە سوکناتی نەیەت، بە هیچ شتێکی‌تر داناساکێ.

ئەچێ بەلای کابراوە قۆڵی ئەگرێ. کابرا ڕائەپسێ و لا ئەکاتەوە سەیر ئەکا یەکێ قۆڵی گرتووە. خۆی ڕائەچەنێ و ئەڵێ: «چییە کاورا یێژی میرغەزەوی شانت لێ بڕیگمەوە». ئەڵێ: «برا هیچ نییە، منیش خەڵکی ئەم شارە نیم؛ چاوم پێت کەوت دڵم پێت کرایەوە. ئا توخوا وەرە با بچین لەو ماڵە زەماوەندە، بە یادی عەشرەتەوە دەستێ ئەگرین».

کابرا ناوی عەشرەت و زەماوەندی لێ دێنن، بسکەیەك لە سمێڵیەوە دێت و ئەڵێ: «ئا دەی توخوا برا لە کوێس با بچین». شوێنی ئەکەوێ و ئەچن بۆ بارەگای والی.

کە ئەچن و سەرئەکەون والی لەو سەرەوە بە جلێکی جوانەوە لەسەر تەختێك دانیشتووە. کابرای کەرەك بەشان هەر کە چاوی پێ ئەکەوێ ئەڵێ: «سڵاوەلەیك جورایل». ئەڵێ: کورە گەوجە من «جورایل» نیم.

ئەڵێ: «کەواسە سڵاوەڵەیك پێغەمبەر». ئەڵێ: کورە کابرای شێتە من پێغەمبەر نیم. ئەڵێ: ئەی دەویت باوك تۆ نە خوایت و نە جورایلیت و نە پێغەمبەری چی ئەکەی لەو بەرزییەوە وەك «سیچکەسڵاو» دانیشتگی؟ هەی کوتامە دایکت! گالۆك ڕزگاری ئەبێ و ئەمیش پەلاماری گالۆکەکەی ئەداتەوە و هەڵیئەگرێتەوە. لەو کاتەدا کە گالۆکەکەی هەڵئەگرێتەوە ئاوێنەیەکی باڵانما لەو سەرەوە دانرابوو کابرا خۆی لە ئاوێنەکەدا ئەبینێ. وێنەیەکی سەیری دێتە پێش چاو. چاوێکی لێ مۆڕ ئەکاتەوە. وێنەی ناو ئاوێنەکەش ـکە ئەم هەر خۆیەتی ـ ئەویش چاوێك لەم مۆڕ ئەکاتەوە.

کە وا ئەکا دەست ئەداتە گالۆکەکەی و ئەڵێ: «ئای هیزە، کوچکت لێ نەوارێ خۆ ئەو کاورای تاینگە گەرەکیە لەم غەریوییەدا سەرم بدا وە قەلبەیەکا. ئای کوتامە قنگ دایکت هەی». ئەمە ئەڵێ و گالۆکێك ئەگرێتە ئاوێنەکە و ئاوێنە هاڕە ئەکاتە خوارە و ئەڵێ: «ئاوا دایکت ئەگێم دە بیخۆ دەویت باوك باوك!». والی لەم ئیشە ئەوەندە پێ ئەکەنێ ئەکەوێ بە گازی پشتا.

پاش ئەمانە والی ئەمر ئەکا کابرا دائەنیشێ و هەروا سەر ئەخاتە سەری و قسەی لەگەڵ ئەکا و لە قسەکانی بە تەواوی هەموو خەمێکی لە بیر ئەچێتەوە.

نان دێتە ناوەوە و فڕنی لەسەر سینی والی ئەبێ. ئەڵێ: ئەم فڕنییە بۆ ئەو دابنێن. کابرا فڕنی بۆ دائەنێن و دەست ئەکا بە خواردنی. هەر لەگەڵ کەوچکێکی لێ ئەخوا گورج هەڵئەستێ. [والی ئەڵێ:] ئەوە بۆچ وات کرد؟ ئەڵێ: «قوروان فرە خز و سافە. ئەترسم گورج لە خوارەوە دەرچێ». والی ئەوەندەیتر پێ ئەکەنێ.

پاشان لێی ئەپرسێ: ئەمە چی بوو خواردت؟ ئەڵێ: «قوروان باوکم

گجارێ هاتگەسە شار کە ئەهاتەوە ئەیوت مزگەوتی "جامعە" و "حەمام" فرە خۆشن. ئەمە یا مزگەوتی جامیعەس یا حەمامە». پاش ئەوە کە والی بە تەواوی سەبووری پێ دێ، خەڵاتی ئەکا و بەرەڵای ئەکا.

**٢٩٣.** «محەمەدی مەلا کەریم» چەند قسەیەکی نارد بۆ ڕشتە. لەوانەدا گێڕایەوە وتی: «ڕۆژێك ژنێکی شاتری کوڕێکی منالّی هەبوو نەخۆش بوو. ئەچێتە لای شێخ حەسەنی قەیتوول نووشتەیەکی بۆ بکا. کە ئەچێ لەو کاتەدا شێخ هێلکەوڕۆنی لە بەردەما ئەبێ ئەیخوا، هێلکەوڕۆنەکەش نیمرۆ ئەبێ؛ زەردێنەکەی بڵاو ئەبێتەوە بە سەریا.

شێخ لە ژنەکە ئەپرسێ: کوڕەکەت چییەتی؟ ئەڵێ: «قوربان! بێ عەدەبی نەوێ کە دائەنیشێ، دانیشتنەکەی لەوەی بەردەمی شێخ فرە زەردتر و تەڕترە. ئەوا هاتگم بەڵکوو شێخ دەم و نەفەسێکی بۆ بخاتە کار».

شێخ سەیر ئەکا ئەم ژنە قسەی خۆی پێ وت؛ وتی: چارێکی نەکەم کەڵك ناگرێ. هێنای قاقەزێکی وەکوو نوشتە بۆ پێچایەوە و دایە و وتی: بچۆ ئەمە بیگرە مۆم و بیلکێنە بە دەرگای قنگی کوڕەکەدا. بە هیممەتی پیران چاك ئەبێتەوە».

ژنەکەش ئەچێ وەکوو شێخ ئەفەرموێ وا ئەکا. پاش چەند ڕۆژێك ئەچێتەوە بۆ خزمەت شێخ. شێخ لێی ئەپرسێ: ها دایکم کوڕەکەت چۆنە؟ ئەڵێ: قوربان! خوا هەر بتێڵێ بۆمان. لەو ڕۆژەوە دەم و نەفەسەکەی تۆم بۆ وڕیگە وە قنگیا تکەتکە نەوێ دانانیشێ. شێخ ئیتر هیچی پێ ناوترێ.

**٢٩٤.** فەقێیەك لەو وڵاتی «لاجان»ـە دڵی بە کچێکی درواسێ حوجرەوە ئەبێ. فەقێکە «تەسریفی زەنجانی» ئەخوێنێ کە دەوری ئەکاتەوە لەسەر بانەکە هەموو جار ئەڵێ: «إعشَوشَبَ، يَعشَوشِبُ،

إعشیشاباً» ئەمە دەوری فەقیانی تەسریفی زەنجانییە.

شەوێك فەقێ بۆی ڕێ ئەکەوێ، لەبەر ئەوە کە لەگەڵ کچەکەدا دڵیان پێکەوە بوو، کچە هەڵئەگرێ و ئەڕوا. بەیانی کە باوکی پێی ئەزانێ ئەڵێ: «من هەر ئەبوا زوو بمزانیایە ئەو باوەحیزە هەموو جار لەسەر بانەکە دەگەڕا و ئەیوت: ئیمشەو شەومە، ئیمشەو شەومە؛ هەتا بۆی ڕێکەوت ئیمشەو کردی بە پەلیا و بردی».

**٢٩٥.** لەو کوێستانە مەلایەك بەلای خێڵێکی «ڕەش‌وبۆری»دا تێئەپەڕێ؛ برسی ئەبێ، ئەیەوێ لا بدا نانێك بخوا. سەیر ئەکا زەماوەند و هەرا و هەڵپەرکێیە؛ کچ و کوڕ دەستیان گرتووە و قوولەیە. نان ئەخوا و پاشان لە کوێخاکە ئەپرسێ: ئاخۆ ئەم کچە مارە کراوە؟ کوێخاش ئەڵێ: «مەلا بیبوورەوە! کەنیشکی خۆمانە و بۆ کوڕی خۆمانی تێرین، مارەی نەگەرەکە. نازانم تۆ گووخۆری کوێیت و لەکوێوە هاتگیت؟ نانی خۆتت خواردگە و هەڵسە بچۆ وەڕێ خۆتەوە، لەم شاییەدا خوێن مەگێڕە».

پاشان بە هەر زمانێك ئەبێ مەلا ئیشێکی وا ئەکا مارەی کچەکە ئەبڕێ لە کوڕەکە.

**٢٩٦.** ڕەشەی خەجەلاو هەبوو لە سولەیمانی، مریشکێکیان ئەبێ، ڕۆژێك مریشکەکە هێلکەیەك ئەکا و ئیتر هەر ئەیکا لە گارەگار تا چەند ڕۆژ نایبڕێتەوە. ڕەشە بە تەواوی پەست ئەبێ، هەڵئەستێ هێلکەکە دێنێ ئەیخاتە پریاسکەیەکەوە ئەیکاتە ملی مریشکەکە و ئەڵێ: «دە بڕۆ سەگی سەگباب! ئەوە خۆت و ئەوە هێلکەت. خۆ تۆ بۆ ئەم هێلکەیە مێشکی ئەو عالەمەت برد، گووم بە خۆت و بە هێلکەت».

**لە قسەکانی شێخحسێنی قەرەداغی:**

ئەم شێخ حسێنە پیاوێکی ئەستووری ورگ زلی قەویلە بوو؛ گیپەرەی ملی لەبەر چاخی باوەشێك بوو؛ لەبەر ناوشانی پانی، کورتەبالاً ئەهاتە بەرچاو. دەنگی ناسك و قسەی بەتام بوو. برایەکی هەبوو ئیبراهیمی ناو بوو. ئەو بالاً عەرعەرێکی تۆزێ ناوقەو باریك، لەبەر بەرزی هیچ ئەستووری پێوە دیار نەبوو.

ڕۆژێك لە شێخ حسێن ئەپرسن: بۆچی برایمی برات لە تۆ لاوچاکتر و ڕێکوپێکترە؟ ئەویش کوتوپڕ ئەڵێ: «ئاخر ئەو چوار پراوە کراوە». لە ڕاستیدا برایم چوارەمین سکە. هەر لەم کاتەدا شێخ حسێن کچێکی ئەبێ (ئاواز) جوانکەلەی ژیکەڵەی دەم بە پێکەنینی ڕێکوپێك و نوسکە ئەبێ. لێی ئەپرسن: ئەی ئاوازی کچی تۆ بۆچ ئەوەندە جوان و ڕێکە؟ شێخ مستەفای باوکی شێخ حسێنیش لە کۆڕەکەدا ئەبێ و گوێی لە هەموو ئەم حەقایەتانا ئەبێ، ئەویش کوتوپڕ ئەڵێ: «ئەو زووتر پراوەی خۆی کردووە».

**٢٩٧.** هەر لەو کۆڕەدا کە دوو باب پێکەوە ئەبن و ڕاوەستاون، برایم بە شێخ حسێن ئەڵێ: «کاکە! تۆ ئەزانی من لە تۆ درێژترم؟». ئەمیش ئەڵێ: «کورە تۆ نابێ قسەی پیاوانە بکەی، تۆ نازانی من لە باوکی تۆش درێژترم». لە ڕاستیدا باوکیان لە هەردووکیان کورتتر ئەبێ.

**٢٩٨.** شێخ حسێن باوکی لێی توورە ئەبێ پێی ئەڵێ: هەستە لاچۆ لەبەر چاوم ئەڵێی ورچی. ئەویش پێی ئەڵێ: «جا بۆچ بە من ئەڵێی، بەو کەسە بڵێ کە دروستی کردووم». باوکی ئیتر پێ‌ئەکەنێ و خاو ئەبێتەوە.

**۲۹۹.** کۆڕێك بووین چووین بۆ سەر «شەت»ـی بەغدا بۆ ماسی خواردن و هەریەکە هەندێ پارەمان دا. وتی: زۆری پێ نەچوو یەکێ لە هاوڕێکان هات پێی وتم: تۆ پەنجا فلس قەرزار ماویتەوە. وتی: منیش لە بیست فلس زیاترم پێ نەبوو، وتم: ئەمە بیست و ماسی. هاوڕێی سێهەم هات وتی: ئەوە چی بوو؟ وتم: «بۆچی تۆ نەتبیست؟».

**۳۰۰.** شێخ حسێن وتی: دەستەیەك بووین، یاری ئەکرا، دانیشتبووین یەکێکیان پێی وتم: وەرە لای من دانیشە. ئەمەوێ «قاپووت»ێ لەمە بکەم؛ یانێ سێ نوختەی لێ بکەم. وتی: منیش وتم: «کەوابوو منیش چاکەت لەگەڵا ئەکەم وا دێمە پاڵ تۆ. دێمە پاڵتۆ بۆ ئەوە ئەم "قووندەر"ە قۆندەرە بدۆڕێنی».

